مسعود محمد

*«من هموم الحياة»*

من مطبوعات الأمانة العامة للثقافة والشباب. بغداد، رقم الإيداع في المكتبة الوطنية 509 لسنة 1988.

مەسعوود محەمەد

«لە پەرۆشەکانی ژیان»

ستۆکهۆلم 1997

ئەم کتێبە، سەرەتا بە عەرەبی نووسراوە، ساڵی 1995 نووسەر خۆی تەرجەمەی کوردی کردوە و لە ستۆکهۆلم، ساڵی 1997 – لە لایەن «کیتابی ئەرزان» ـەوە – بڵاوکراوەتەوە. ساڵی 2016 سایتی مامۆستا سەرلەنوێ ئەم کتێبەی تایپ کردۆتەوە.

پەرۆش دەستی پێکرد لەو ڕۆژەوە کە بە جۆرێکی فام تێیدا وڕە، هێزی ژیوەری بەبەر ماددەی مردوودا گەڕا ئیتر لە زیندەواردا پەرۆشی بەردەوامبوون بە بژێو و بە بەرتەکدانەوەی مەرگ و بە زاوزێ ڕسکا، چەندێکیش ماددەی زیندوو بە پلیکانەی سەرەژووردا هەڵکشا بازنەی پەرۆش بە هەموولایەکدا بەرینتر بۆوە و قووڵتر ڕۆچوو بە هۆی پتربوونی ئەو لایەنانەی کە دەبوو هێزی ژیوەرییان بداتێ و بە فرەبوونی ئەو پەنامانەی کە هەڕەشەی فۆتانیان لێ دەکرد و بە ناچاری لە فرەچەشن کردنی فێڵی خۆپاراستن و ڕاو کردن، ئەوسا ماددەی زیندەدڵ کەوتە باری گۆڕانکاری و هەمەڕەنگبوون چ لە بنەڕەتەکانی چ لەو لکانەی لێی دەبوونەوە بەوەدا هەستە سەرەتاییەکانی فراژیبوون بەرەو پلەی «غریزە» کە بێمەبەست و بە دڵخوازیش ڕەت کردنەوە و سەلماندنی بەکاردەهێنا، غەریزە خۆیشی دابەش بوو بەسەر جۆرەها زیندەوەری بەرەوپێشچووی بۆ کرانەوەی هەست بە دەوروبەر کردنی و فرەتربوونی فێڵەکانی بۆ ڕەواندنەوەی تەنگوچەڵەمەکانی بەردەم ملیۆنەهای ساڵەوە کە قڕانی هەزاران جۆری دیت کە حاڵوبار بۆیان نەهاتێ یان هۆی خۆپارێزیان کورتی هێنا یان لەبەر نەگونجان بە دەوروبەرەوە یان کەمکوڕی بژێوگیری. وەختێک هات مرۆ پەیدا بوو بەو تایبەتمەندانەی کە لە هەموو بوونەوەری جوداکردەوە، بە مردوو و زیندوویەوە. ئنجا پەیدابوونی ئەم مرۆیە چ بدرێتەوە بە بارێکی بەرینی فراژووتنی لەسەرەخۆ کە هەڵاواردەی کرد لە هەموو زیندەوەری پێش خۆی و ئەو نەسلەی بەوەلەدیشی هێنا، یاخود بدرێتەوە بە توانستێکی تێی فروسما[1] کە لە پشتاوپشتی بەسەرچوویدا هەرگیز نەڕسکابوو، لە هەردوو حاڵدا ئاکامەکە هەر ئەوەیە کە مرۆ هەست و هۆشە نوێیەکەی کرایەوە لە جۆری کردار و تێڕامان و مەیل و مجێز کە بەدەم زەمانەوە بەرەو فرەبابەتییەوە بوونەوە و خواروژوور چوون بەسەر هەڵسوکەوتی تەجرەبە و هەڵەدا، بەوشەدا پێبەپێ هەرچی «مەزموون»ی کۆمەڵایەتی و مێژوو

---

[1]- فروسمان، فروسماندن: پتر لە نێوان دەشتنشینانەوە ئەم وشە بە کار دێت وەک کە بڵێین: ئەم خەرمانە جۆ لێی نەفروسماوە نەسووتێ. تۆ لێیان فروسماندووی وەها دڕ بێت؟ مەرحووم زەبیحی کە وشەکەی لێ بیستم توێژینەوەیەکی لێ کرد، دواتر پێمی گوت، لە هەرێمی باڵەک و دەوروپشتی ڕەواندز دەڵێن: فلیسمان. وشەکە دەلالەتی سەربە غەیبی پێوەیە. فریسمانیش هاتووە.

هەیە دەرکەوت. ڕەنگە یەکەم شتی لەترووسکەی هۆش گەشابێتەوە «ئاخاوتن» بووبێت چونکە ئەو دەنگە نامەفهوومانەی لە گەرووی زیندەوەرەوە دەردێن کەرەستەی دەربڕینی هەستی غەریزی بوون کە ڕاگەیەن نین (وەک ئاخاوتن) بەشێکی بەرچاویش لەو دەنگانە بۆ مرۆ ماوەتەوە وەک کە لە دەمی تووڕەیی و ڕەزامەندی و گومان و یەقین و ترس و هێمنیدا دەنگی وەها دەردەپەڕێنێ ئەو هەستانە بەدەر دەداتەوە و نزیکە لە میاوەی پشیلە و نەرمەحیلەی وڵاغەبەرزەوە بە پێی حاڵوباری جودادا. ئنجا کە هەستی غەریزە گۆڕا بە فامی ئاگاداری ئەو دەنگانە کورتیان هێنا لە ڕاگەیاندنی وێنە و واتای هۆشکرد ئیتر «وێژە» بە زەرووری بووە تەرجومانی هۆش. هەر لەم گۆشەیەوە بوو بە بیرمدا هات ئاخافتن یەکەم داهێنانەکانی هۆشە چونکە مانیعێک نییە لەوەدا مرۆ بۆ ماوەیەکی کورت یان درێژ بەردەوام بووبێ لەسەر شێوازی کۆنی لایەنەکانی دیکەی ژیانی تا وای لێ هات، دواتر، جلک لەبەر بکا بە قیتی بڕوات. کە هات نوتق نەیتوانی بەوشەی تاک تێکهەڵکێش لەگەڵ عەقڵدا جووت بڕوات بەرەو لێکدانەوەی بێ قەید و سنوورەوە زەکای هەڵکەوتووەکانی مرۆ - وێڕای تەجرەبە - بە هانای هات لە داهێنانی هێما و نیشانە و ئاماژە بۆ پڕکردنەوەی نێوانیان، ئەویش بە پێی ئیمکان. مەیلەوە سەیرە کە سەرەتای نووسین بەر لە پەنجا و ئەوەندە سەدەیە دەگەڵ ئاخرین مۆدێلی تێگەیاندنی سەردەم بگەنەوە یەک لە بەکارهێنانی وێنە و ڕەمز لە بری دەنگەکانی هیجا بەوەشدا ئاسانیی سەرەتا و زەحمەتی ئەنجامی وەسیلەی تێگەیاندن لە زۆرباردا پێکەڵپێک بوون. پەرۆشەکانی ڕۆژگاری شکەفت کە بریتی بوون لە خۆپارێزی و بژێو و جۆرێک داکردن و خەفتیانی ئاگر، لە قۆناغی شوانیدا و دواتریش لە کشتوکێڵ لە قووڵایی و مەودای زیاد کرد وەک بڵێین پەرۆشی پارێزگاری گەییشتە پاراستنی کەلوپەل و دەوروبەر کە دەبوو ئەویش فەڕاحتر بێت بە پێی فرەبوونی کەرستەی گوزەران، هۆشیش بەرەو قووڵیەکەوە بۆوە کە «تەجرەبە و لێکدانەوە و میرات»[2] ڕەخساندییان، شەبەنگە وەهم کردەکانی دیاردەی سروشتیش تەنکە ترنجۆکێکیان لە ئەفسانە تەنی، هێندێکیان بۆیان لوا زۆر بژین: چەندێکی بروسکە بەڵا چاندبێتی یان فرتەنە هەڵیکردبێت یان بوومەلەرزە دنیای هەژاندبێت

---

[2]- تەجرەبە و لێکدانەوە و میرات «التجربة والتصور والإرث» — لە عەرەبیەکەدا بە لای باوەڕی نووسەرەوە سێ بنەمای هەرە کۆن و هەرە بنەڕەتی پێشکەوتنی مرۆن.

یان ئەستێرە و ڕۆژ و مانگ ئاوابووبێتن گەشکەدارانە هەڵاتبێتنەوە دەروونی پشتاوپشتی مرۆی کۆنینەیان ورووژاندووە بە شەبەنگی هێزی پەنام کە زەبر دەوەشێنن و دەرمێنن یان بزەیان دێتێ و ئاوەدان دەکەنەوە.

قسە لە کرانەوەی فام و کرانەوەی گومڕایی و کرانەوەی ئومێد و کرانەوەی ترس و پتربوونی تێک ئاڵقان بە دەم زەمانەوە تا ئەو ڕۆژەی دوایین مۆدێلی ترسی نەوەوی، ئەویش چیرۆکێکە ئەگەر دەریا مەرکەب بێت بە نووسینی وشەکانیەوە وشکایی دێت، جا ئەگەر دەفتەری هەموو ترس و شادی و تاڵی و تەمایەکی کە لەگەڵ ڕۆژگاریان بەسەرچوون، بسرینەوە و خەریکی ئەو بابەتانە بین کە لە شارێکی ئەم سەردەمانەماندا پەیدان هۆش پێیانەوە دەحەپەسێت و لە ئەژماریان فل دەبێت، فلبوونەکەشی زیاد دەکات کە بمانەوێ سەرەدەری لە بنەمای هێندێکیان بکەین چونکە دۆزینەوەی بنەما وەک هەست کردن بە شتی زەقەوە نییە، نێوانیشیان هێندەی نێوان «جوهر وعرض-گەوهەر و بەڵغ» لێکتر دوورە. هەرچی دانیشتووی سەر زەوی هەیە کۆببنەوە بۆ دۆزینەوەی ئەو ناوەڕۆکە نەفسییەی عەرەب و ئەورووپایی بەرەو پێشخستنی ئامرازی ناساندن[3] لە ناو ڕوواند کوردیشی بەرەو دواخستنیەوە برد ناگەن بە هیچ ئاکامێک مەگەر خەیاڵکێشەکێیەکی[4] پڕ لە گریمانە[5] کە بە چەپ و ڕاست و هەموو لایەکدا پەرت دەبێت و سەر بە هیچ ڕاستییەکەوە نابێت، هەتا دوارۆژێکی دوور بەدەم پێشکەوتنێکی زانستیی درێژخایێن کە ئەوساش لەوانەیە هەتا هەتایێ تێگەیشتنی خۆ بەدەست هیچ عەقڵ و زانستێکەوە نەدات.

پەرۆشەکانی ڕۆژگار وەک ناوەڕۆکی ڕۆژگارە لە چڕی و پڕی و گرێوگاڵ، کە تێشیەوە ڕادەمێنن حیسابی خۆشی و هەلی بەختیاری گوم دەبێت کە ئەویش «پەرۆش!» ێکە زێدە دەگمەن و، بە نۆرەی خۆی، دابەش دەبێت و بەسەر جۆری وەهادا بە دواکەوتنی ئاسان نییە، هێندێکیشیان دەچنە ژێر گوتەی «مصائب قوم عند قوم فوائد»- واش دەبێ سوودی هەندێکیان بۆ هەندێکیان مسیبەتە ڕەنگە سوودیش بێت.

---

[3]- ئامرازی ناساندن: أداة التعريف.

[4]- خەیاڵکێشەکێ: تداعي الاخيلة.

[5]- گریمانە: فرضية.

پەرۆشەکانی سەردەم دابەش دەبن بەسەر وڵاتاندا بە پێی پشکی هەر وڵاتە لە دواکەوتوویی و کاڵی و کرچیی بیروڕا و پووچەڵیی تەجرەبەکانی تا ئەوەی نەمدیت نیسبەتی نێوان دوو لایەنی موعادەلەیەکی کۆمەڵایەتی جووت و ڕێک هاتبێت وەک نیسبەتی نێوان خەفەت و دواکەوتوویی، ئنجا هەر وەک پارە لە دەست گێلەپیاودا دەبێتە زێدە وزە بۆ خۆ ڕماندن هەروەهاش بەشی هەرە زۆری سەرچاوەی بەختیاری لە گەلە پاشکەوتووەکاندا دەبێتە هەڵدێری ملشکان و وردبوونی پەڵاسووان: تا ئەمڕۆ تێنەگەییشتین هەڵڕژانی نەوت بەسەر جیهانی فەقیراندا چەندی خۆشی بوو چەندیشی پەژارە، چونکە باشترین سوودمەندبوون بە نەوت ئەوە بوو کە دەوڵەمەندانی غەیری جیهانی ئێمە چەک و ئەسبابی کەیف و تێریان پێ دەفرۆشت. ئەوەی لە قەوارەی خەفەتی سەر سینەی جیهانی سێیەم و چوارەم و بەولاترەوە زیاتر دەکات لەوەوەیە کە دەبینین خەفەت و پەرۆشی لەوە گەورەتر لە جیهانی پێشکەوتوودا پوایەوە و ڕەویەوە، هەموو چاوەکی کرایەوە و بێلایەنیش بە ڕوونی دەرک دەکات کە بەشێکی زۆر بەرچاوی هۆی ماڵکاوولی جیهانی ئێمە لەوانە نییە هیچ گرفتێک پەیدا بکات لە نێوان بنیادەمی نەختێک دروستبین و هەناوپاکدا چونکە خەفەتی هەرە زلی کە خەفەتی بچووک و گەورە و ناوەنجی هەڵدێنێت ئەو کرمەجووڵەی دەروونییە بۆ تامەزرۆیی ستەم و دەستوەشاندن کە وەک دروشم دەشەکێتەوە بەسەر ئامانجی موقەددەس و ڕازایەوەدا و دەبێتە پەلکەزێڕینەی قەشەنگ ئیتر بەدەم هەلهەلە قەشمەرجاڕی و زوڕنائەنگێوییەوە گیان دەئەنجنێت و ڕووەک و شیردەر لەناو دەبات. وەی لە بەرەکەتی کرمەجووڵەی گەشوگۆڵ!

ئنجا کە بۆ چاوێکی بینای چەشمەندازی لێ لێڵ نەبووبێ بە چاویلکەی ڕەنگاوڕەنگی ئایدیۆلۆژیا و گونجاندن، کە ئەو بەڵایە ناگەهانەی وەک هەوری ڕەش جیهانی سێیەممانی تەنیوەتەوە قەزا و قەدەرێک نییە ڕەت نەکرێتەوە شیمانەیەکیش[6] نییە کە هاتنە دی یەکجار لەگوین بێت، ئەو بەڵایەش نییە ڕوودان و نەدانی لە تەرازوودا هاوکێش بن بەڵکوو لە مەنتیقی هۆشێکی دروستدا کە گێژ نەبووبێ بە دڵکرمێیی و شەهوەت، شیمانە هەرە سست و بە دوور حیسابکراوەکە بێت... کە بۆ ئەو چاوە بینایە

---

[6]- شیمانە: احتمال.

دەرکەوت، وشکبوونی شەلەگەکان، بۆربوونەوەی زەویەکان و ڕاڤەنانی مێوەدارەکان و چۆڵبوونی خانەکان، تا ئەم مسیبەتانە خەمساردییان بۆ بەس بێت بێ ئەوەی پەکی کەوتبێ لەسەر بەلاغەتی ڕستەسازیی فەلسەفی و هیممەتی تیژ کردنەوە لە هەڵنانی ڕێکخراو و حیزبان و بەهانەی تێکهەڵقژان بەو جۆرەی دەیان ساڵە لە عالەمی سێیەمدا خوومان پێوە گرتووە... کە ئەمە و ئەوە و هۆوە لە جیهانی سێیەم و دەیەم و بیستەم بە سەخاوەتەوە دەبارێتە سەر ملیارەها بێچارەی گەلەکانی، شتێکی ئەوتۆ نافرەجا و شووم و دزێو دێتە بەرچاو هەر تەنها دەرکەوتنەوەی زێدە بەدبەختییەک بۆ هەست و هۆش ڕادەکێشێت کە ڕزگاربوون لە بەدایەتیەکەی مومکین نەبێت چونکە دڵنیابوون لەوەدا ئەم مسیبەتە مرۆهارانە و ئەو فەلاکەتە داهێزکارانە دەبوو لە بنەڕەتەوە ڕوو نەدەن بەدیلیشیان لە سەلامەتی و هێمنایی گوم و قەدەغەبوون بە پێی هەوەسی ئەو ئەفسانەی تۆغیانیان کرد و زوڵمیان گرتە بەر و خۆیانیان کردە عیفریت لە ئاپۆرەی ئەو بێچارانەی لە دێرزەمانەوە مرۆڤایەتیی خۆیانیان لە دەست داوە، ئەو دڵنیابوونە و یەقینە بەڵاکە بە پۆزی حەقیقی و سەرشێوێنی خۆیەوە دەردەخات کە هیچ سێبووری پێوە نییە نەک هەرچونکە بەڵاکە بێ زەروورەت باری بەڵکوو چونکە دەتوانێ لە خۆڕایی و بێسەبەب تا چەندێکی حەز بکات بەردەوام و لە زیادکردندا بێت ئنجا لەبەر ئەو هیچایەتیەی لێی دێت مانگ لە دوا مانگ بەدایەتیەکەی فراژیتر بێت و لە بێروت ڕۆژ لە دوا ڕۆژ تێهەڵکشێت و لە نێوان خەڵقی دیکەدا ڕۆژ لە دوا شەو و لە نێوان شێتوویێتی خەباتیشدا سات لە دوای سات، بە پێی فەلاکەتی بێڕەزای یەکتر کوشتنیشیان پڕووشکی وێرانی و مەرگ و نەگبەتی بەسەر خەڵقەندەی نیوەنووستووی دەورییانەوە ببارێنێت، ئا لێرەدا حەشارگەیەکی پەرۆش هەیە وەک کانی تازەزاو چەندێکی لێی هەڵکەنیت پترت پەرۆش پێ دەبەخشێت و بایی پێویست نەبوونیشی پترت قێز هەڵدەستێنێت دەشتخاتە سەر حەسرەتی تاڵوتفت بەوەدا دەرگەی گوتەی حەقت لێ داخراوە دژی هەڵوەستی هەرە پووچەڵ و ڕووداوی هەرە ستەمکار:
کەسێکی لە ڕەشداگەڕانی جیهانی سێیەمی دەیەممان وردبێتەوە خەریکە بە پەنجەی دەستان هەست بە خەستبوونەوەی بەڵا بکات و شعور بە تێخزانی پەژارەیی لە مێشکۆڵەی ناو ئێسقانی بکات وەک کە دووپشک لە بن کەوشی بجووڵێت. من گەلەکانی دەبینم وەک کەسێکی ئاگر لە شاقەلی جلکی بەربووبێت و دەشبینێت پێیدا بڵاو دەبێتەوە ناشتوانێ ڕاسێت پەنجەیەک لە کوژاندنەوەی ببزێوێت... خەڵقیش لە

پەرۆشداری و خەفەت لێ خواردنی پشکی خواروژووریان هەیە وەک کە شاعیری کورد «نالی» گوتوویەتی:

تەرزە ئینسانێ هەیە غەم قووتییە
من خەمی خۆم و هەمی عالەم دەخۆم

خوای لێ خۆش بێت.

سەرگورشتەیەکی گەپئامێزیش هەیە دەڵێ، کابرایەک تەبیاتی لەگەڵ خەفەت ڕێک بوو تا ئەوەی شتێک نەبوو لە بەرچاوی ئەو بێخەفەت بێ، خەڵقەکە ناویان لێنا مامە خەمە. بەیانییەکی زێدە دەگمەن خەبەری بۆوە بیری لەو چەند و چۆنانە کردەوە کە خەفەتی بۆ ساز دەدەن هیچی نەدۆزیەوە، خەریک بوو خەفەت لە بێخەفەتی بخوات، ژنەکەی بە ژوور کەوت گوتی: ماکەری جیرانمان جاشکێکی هێناوە کلک و گوێی نین، مامە خەمە دوو دەستی لێکدان و گوتی: لا حول ولا، جا ئەگەر جاشک گەیشتە تەمەنی بارلێنان و لە قوڕی لنج چەقی خۆ نە کلک و نە گوێی هەن تێی نووسین و دەری بهێنین.

ڕاستییەکەی خاوەنی ئەم دێڕانە خۆی نەکردۆتە سەربازی خەفەتدۆزی، ڕەشبینیش لە تەبیاتیدا نییە، لەوانەیشە ڕاست بێ بڵێم، یەکێکە لەو کەمتاکورتەی گیانیان جیهاندۆستییان بە فەلسەفەوە هەڵمشتووە و باوەڕ بە حەتمیبوونی دەرچوونی مرۆ لە کاری خۆڕیلە، لە ویژدانیان ڕۆچووە، یەقینیشیان چەسپاوە ڕۆژێک دێت کەمئاگاترین کەس گاڵتە بکات بەو ورێنانەی لەم ڕۆژگارەدا لەمپەڕ دەخاتە بەر هەنگاوی بڵیمەتان. من هێندە هەستیار نەدەبووم لە ئاست ئازاری گێلوویڵی خۆترنجێن ئەگەر زێدە عاشقی گەشایی مومکین و بەرتەما[7] نەبوومایە کە بیری پووچەڵ و تەنکایی هۆش و بێوزەیی عەزم و گێلیی ڕووانین و گومڕایی ئامانج بە تێکڕایی و هی پێشەنگەکان و سەرۆکەکان و بەڵەدەکان بەتایبەتی دەیانکاتە خەیاڵ و شێتی و زیبان و وێرانی و مەرگی تاڵوژاڵ. ئنجا ئەگەر بێئومێدی وەیا کەمئومێدی پەیدا بوو لە ڕوونبینی ئەوانەی

---

[7]- بەرتەما: مأمول. لە جۆری بەرهەست، بەرکوڵ و بەردەست.

جڵەوی کارانیان لە دەست گرتووە خۆ پێشتر ئومێد بە تەواوی گوم بووبوو لەوەدا ئاپۆرەی خەڵک ڕەفزی ئەو بەڵایانە بکات کە زۆرینەی سەرپەرشتان و پێشەنگەکان بە پیتۆڵی و بە گێلی دەیهۆننەوە. بەم جۆرە دوو سەری بازنەی میحنەت بە یەکدی دەگەنەوە بە دەوری واقیعێکەوە وا لە برەوی گرژی و تەنگەتاوی ئەوتۆدایە قێزوبێز دەبزێوێت.

من کە گوڵێک دەبینم بەسەر چڵەکەیەوە لەبەر بێئاوی وشک بۆتەوە ئازارم ڕێکم دەگوشێت و پەرۆش دەخۆم بۆ ئەو گوڵانەی کە دەبوو بە جوانی و گەشایی و هەناسەی عەترەوە بکرێنەوە چونکە من ئەو گێژە نیم خەفەت بۆ سوود بخوات و سەرمایەی لە بیر بچێتەوە: وشکایی سەرچاوەی هەر ئاوێک بریتیە لە بێبەشبوونی کۆمەڵێکی زیندەوەران لە خواردنەوەی و بێبەشبوونی کۆمەڵێک مرۆڤ لە داشتنی شیناووردەکەیان، کەسێکی بە جحێڵیش مرد بڕانەوەی زنجیرەیەکی مرۆیانە کە دەژیان و زاوزێیان دەکرد چونکە نەمانی زیندوویەک نەمانی خۆی و وەچەکانیەتی [کە جارێ نەزاوون]. گرژیی ڕووی ئادەمییەک بەداهەتەن نیشاندەری هەڵوەستێکی نایەتی نەزۆکە، بە کەمە حیسابێکیش کوشندەی بزەیەک و زیندەبەچاڵ کردنی سڵاوێک و داخستنی دەرگەیەکە بۆ ئاشنایی و برادەری بکرێتەوە، ئنجا گرژی و گەشاییش دەماری هەستیار دەگەزێت و وێنەی خۆی تێدا دەفریسمێ چەند ڕۆژێک لەگەڵیدا دەژیت، و«مثل كلمة طيبة أصلها ثابت»[8] وشەی چڵکنیش وەک درەختێکی چڵکنە خۆزی لە زەوی بنەکێش کرابایە.

چ زۆرن خەفەت و جۆرەکانی و پلەکانی، لەعنەت لە زۆر و لە کەمی و لە پلەکانی و جۆرەکانی، وای لە بەختی وەگەڕاو کە پەندیاران و بیریاران و خاوەن فەلسەفان ڕادەسێنە وێنەکێش کردنی خەفەت و هۆیەکانی و حەشارگەکانی کە گۆیا شتی سروشتین و بە ملەوەن و لێ دەربازبوونیان مومکین نییە و «... كالليل الذي هو مدركي- وەک ئەو شەوەی کە هەر دەمگاتێ» ئاخۆ چی مەنعی کردن لەوەدا کە گەشایی و بەختیاری و شتە چاکەکان بدەنەوە بە سروشتی شتان و داخوازییی نەفسان؟ بۆچی ئەمیان هی بەملەوەبوون و بڕیاری حەتمیەت و زەنەی بەدیهە نەبێ! چییە وا ئیرادەی

---

[8]- «مثل كلمة طيبة كشجرة طيبة اصلها ثابت»: بەشێکە لە ئایەتێکی قورئان.

عاقڵەکان و قەڕیحەی بلیمەتەکان و پیتۆڵی زیرەکەکان بەرەی ئاخێوەر و کارامە و نووسەر و تەشکیلییان ناچار دەکات لە جیاتی هەموو ئادەمیزاد ئاڵای تەسلیمبوون هەڵبکەن بۆ چاوەچاویی هەرە شووم و قەزاوقەدەری هەرە قورس و حەتمیبوونی هەرە سەخت و ناحەز! چییانە وا بە نامەی پەرۆشیان بۆ حەق چی زێدە بەدی دڵدزێوە و کوشندەتری چاکەیە و بەهێزترە بۆ تەسلیمبوونمان، ئەومان لە گوێ دەچرپێنن؟ بۆ لە بەخشندەییەوە نەختێک درۆی شیرن و ساختەی لە مجێز تێکەڵ بە شیمانەکان ناکەن بەڵکوو سەوزایی و گەشاییەکیان پێوە دەبێ؟ تۆبڵێی لە دەرەوەی ناوەڕۆکی «تناقض» و «وحدة الأضداد»[9]. پلیکانەیەکی سەرەژوورچوون دەست نەکەوێ؟

من دڵم تێک هەڵدێت کە بزانم بوونم لە نەبوونی تۆوەیە و سەلامەتیم لە فۆتانی تۆ دێتە دی و داهاتم بەندە بە ئیفلاسی تۆوە. جیهانم بە ورد و درشتییەوە دەدزێت ئەگەر بە بەڵگە چەسپا کە بنەمای لەسەر یەکتربڕینەوە و دژکاری و قڕکردن هەڵستابێت. تف لەو ژینەی لە مەرگ دەزێت و بە وێرانی ئاووس دەبێت... من، ڕقم لە مەرگ و نەبوون و بەسەرچوون و پووچانەوە، پەنجەگیرترم دەکات لە ژین و لە بەزاندنی هەڵوەشێنەکانی و لە فێڵدۆزی بۆ دەوامەپێدەرەکانی تا ئەوەی باوەڕێکم گرتەبەر پێچەوانەی لێک هەڵوەشاندن و پوواندنەوە بێت. ئەگەر بێ گومان لێم سوور بوو مانەوەم بەندە بە نەمانی فلانێک، هێندەی لزومی ژین لێم دەبێتە پێویست فێڵێک لەو حەتمیبوونە بکەم بە دۆزینەوەی موعادەلەیەک فاکتەری ناچارییەکە تێببات و ڕێ خۆش بکات بۆ پێکەوە گوزەراندن و برادەری، دەقەکەشم لەوەدا دێتەوە کە من وازبێهنم لە بەشێکی پێوەندبوونی مانم بە نەمانی فلانەوە ئەویش واز لە بەشێکی ئەوتۆیی بهێنێت ئیتر ئەو سێ چوار یەکەی بۆ هەر یەکەمان دەمێنێتەوە سوودبەخشترە بۆ ئەو و من و تێکڕای خەڵق لە مانەوەی چوار بەشی تەنها یەکێکمان [بە تێچوونی لایەکەی تر]. دواتریش دەشێ هۆیەکی پێکەوە هەڵکردن بدۆزینەوە بۆ تێهێنانەوەی چواریەکی کە بۆ ئاشتی لە دەستمان دابوو کە لە ئاکامدا دەبینەوە بە هەشت چواریەکی خشت. خۆ ئەگەر گەییشتن بەو تەرزە موعادەلەی وەها نەرمونیان

[9]- «تناقض ووحدة الاضداد»: بۆ ئەم دوو مەفهوومە وشەم نەهاتۆتە پێش چاو لە نووسینی کوردی. ڕەنگە بە زاراوە «هەڵوەشێنە و یەکیەتی دژان» خراپ نەبێ.

لە واقیعدا بەوە ئاسانییە بەرچاوەی سەر کاغەز پێک نەیەت هەر نەبێ شەرەفی نییازەکە و ئاکامێکی لێی بکەوێتەوە ئەوە دەهێنێ ئەرکی ئەو موژدەیە و بانگەواز بۆ کردنی و ترساندن لە پشتگوێخستنی و سڕینەوەی لە هەموو حیسابانی بۆ هەڵبگیرێت، ئنجا سەر دانەواندن بۆ بڕیاری ئەو «تناقض»ەی کە هەمیشە، بە لای کەمەوە، لایەنێکیان هەڵدەوەشێنێ لە بنەڕەتدا بنباربوونی قورساییەکی مرۆپلیشێنی ئەوتۆیە کەمترین سەرەنجامی لەوپەڕی سنووری ئەو خەسارەیە تێپەڕ دەکات کە لە دروشمێکی نەشمیلانەی تێکەڵ بە خەیاڵ دەکەوێتەوە.

ڕەنگە بگوترێ موژدەدان بەو تەرزە موعادەلەی دۆستانەی برایانە دەکێشێتەوە بۆ خەوی مەغناتیسی لە نێوان کەسانێک هێز و بێهێزییان خواروژووڕە لە ئاکامدا دەبێتە دەوامەی ئەو حاڵوبارەی دەوڵەمەندی دەوڵەمەند کرد و هەژاری هەژار کرد، منیش دەست بە دامەنی ئەو سەبرەوە دەگرم کە پوواوەتە دوای دوو سەد ساڵ لە تیژ کردنەوەی لێکهەڵوەشان و ڕەفزی مەسڵەتی و دەڵێم: وێنەکێش کردنی ئەم موژدەیە بەو دزێوییە، خۆی لە خۆیدا پەرۆشێکە گیرخواردن بە دەستییەوە دووری کێشا و دەرگای بەرەو جیهانی وێرانی و نەهاتەوە کردەوە: خۆ ئەو بانگەوازەم بۆ بەر هۆشی هۆشداران یەک تاکە وایەری نییە تەنها بۆ بەر گوێی هەژارانیەوە ببات مەسڵەتییان پێ بسەلمێنێت بەڵکوو بانگەوازم لە کۆتایی سەدەی بیستەمدا زیلی دەنگدەرەوەی مەینەت و ترساندن لە تێدا چوونە، ڕووی وەلای دەسەڵاتداری کەمئەژماری پتر بەر بەلاْبووی تێشکانە لە سوونەوەی دوژمنایەتی و دەمەزەن کردنەوەی ڕق و کین، ئنجا «بانگەوازەکە» پاداشیش هەڵناگرێ بۆ قیامەت، بگرە یەک ڕۆژیشی دوا نایەخێت لە ژووانی هەرە نزیکی، لەمەش بترازێین، ئەو بانگەوازە لە هۆش و گۆشی ئەو سەرۆکانەی پێشەنگی خەبات و تەقەلا دەچرپێنێت کە هەزاران ملیۆن دەستوپاوەندە سافیلکەکانیان پەلکێش دەکەن بۆ سەختترین ڕێگای چارەسەریی بنەڕەتی و دروشمی بڕیەیی کە پووچەڵییان دەردەکەوێ بۆ هەموو نیگایەکی قیاسی بکات لەگەڵ چارەسەری نابنەڕەتی کە میللەتانی دیکەی بەسەر تۆقەڵەی ژیاری و ئاسوودەییەوە گەیاندۆتە باوەشی بەختیاری. بەهەمەحاڵ بانگەوازەکە ڕەوتی لەگەڵ ڕەوتی ئەو گۆڕانکارییە ئاساییە کە بەسەر لەنگەری پێکەوە ژیان و هاریکاری و ئاڵوویز ڕەزامەندی لە بەرژەوەندی دوولاییەوە مرۆی لە ژیانی شکفتەوە گەیاندە سەر ڕووی

مانگ[10]. ئنجا ئەگەر بانگەوازەکە بۆی بلوێ پشت ببەستێ بە شێوازی ڕەفتاری ژیاری و ئامرازە زانستییە لەمپەڕ بەزێنەکان لێی دەوەشایەوە، بەرەو ئومێدی دڵپەسەندەوە شەقڵە ئاوی گەش وشەقامی گوڵ و باغ ڕەیحان چن بکات و تەلاری حەسانەوەش بۆ زەماوەندی بووکێنی بسازێنێت.

چی لێرەدا گوترا ناکێشێتەوە بۆ نەسەلماندنی وێنەی ستەم و دزێوی و ڕەنجاندن لە ڕابوردووی مرۆڤدا کە بە داخەوە بەشێکی تەواوکەر و ترسێنەر بووە لە ناوەڕۆکی کۆمەڵایەتی، تا ئیمرۆکەش بەردەوام و لە پەرەسەندنیشدایە لە بەشی هەرە پان و بەرینی ڕووی زەمینە غەمگینەکەماندا. بەڵام مەبەست بەیانی سێ حەقیقەتی گرنگە لە بیر دەچنەوە بێڕووەت دەکرێن وەک کە هەرگیز نەڕسکابن: حەقیقەتی یەکەم ئەوەیە، ئەم لایەنەی تاریک و وێرانکەر و سووتێنەری دوژمنایەتی و یەکتر پووانەوە و هەڵوەشاندنەوە لە ئەزەلەوە بەرهەڵستی چاکە و وەخرێنەری گۆڕانکاری و ڕووخێنەری خانە و کوژەری ژین بووە، هەم حەقی خۆمانە بەسەر خۆمانەوە و هەم فەرمانی دادخوازییە لە ئەستۆمان کە تاوانباری بکەین و بیدەینە بەر لەعنەت و ڕیشەی بکێشین و ڕێی کەوین بە فکر و بەکردەوەی «بەرباربوون»ی[11] ئەدەبیمان. ئەم کارەش بە پەراوێزی ژینمانەوە نییە تا بە سەهلی تێدا زاڵ بین و لێی بە کۆتایی بگەین. ئەو سادەیەش نییە بە چەند دێڕێک شەرح بدرێت کە دەزانین فەلسەفەی زلە زلە خۆی هەڵناوە بەوەدا کە «تناقض» بزوێنەری جیهان و هاندەری پێشکەوتن و ڕاڤەکەری نەمانی چینانە، زۆربەی خوێنەرانیش لە درێژەی باسەکە بەڵەدن و لێرەشدا جێی نابێتەوە. «تناقض»یش واتەکەی وەها لەبەر یەک کێشرایەوە تا گەیاندیانە حاڵەتی ئەوتۆ «تناقض» تێیدا وەک «تناقض»ی نێوان سیپەلاک و جەرگە لەسەر خۆراکی ناو خوێن کەچی لە حەقیقەتدا هەردوویان لە هاریکاریدان بۆ دەوامەی ژین تا ئەگەر یەکێکیان مرد بەشە خۆراکی ناچێتەوە بۆ ئەوەی دیکە بەڵکوو خۆی و لەشیش پێکەوە لە چەند دەقیقەیەکدا دەمرن. جا ئەگەر لە خۆمان سەلماند هەموو

---

[10]– لە نووسینمدا ڕوونم کردۆتەوە، تێکهەڵقژان و بژێوقەپاندن و هەرای گوزەران هەرگیز هۆی بەرەوپێش چوون نەبووە، وەک کە هەرگیز پشیلە و ڕێویشی بەرەو پێش نەبردووە.

[11]– بەرباربوونی: التزام.

جوداوازییەک بە «تناقض»ی دابنێین دەبێ بڵێین هەموویان لەمپەڕ و فۆتێنەرن نەک یاریدەدەری پێشکەوتن چونکە ناچێتە عەقڵەوە شەڕ و فڕوفێڵ ڕامالْدانی نەفس و ماڵ هاندەری پێشکەوتن دالْدەی گۆڕانکاری بن، خۆ ئەگەر بە دوا ئەوەدا بڵێین برایەتی نێوان خەڵق ئاکامی ئەو یەکتر بڕاندنەوە و «تناقض»ەیە شتێکمان گوتووە لە هەموو پووچەڵان پووچەڵتر بێت.

ڕاستی دووەم ئەوەیە، گۆڕانی بەرەوپێش بەرهەمی هاریکارییە تا ئەوەی لە هەر کوێیەک جوداوازی گوم بوو و حاڵوبار هێمن و تێک گەییشتن زاڵ بوو خەرمان بە پیتتر و بەرهەم لە هەر کێڵگەیەک چ کوشتوکاڵی چ تیجارەتی چ زانستی و هونەری و کەیفچییەتی بێت گەشتر و بە تامتر و نزیکتر لە زاری هەژار دەبێت. بەڵێ خیلاف لەسەر سوود لە سوودیش بەولاوە «تەماع» لایەنە جوداکان هان دەدات بۆ کۆشەشی زیاد، بەڵام بەرژەوەندی ڕاستینە ئەوەیە بێ کێشە لەسەری ڕێک بکەون، وەک کە میکرۆبێک دەچێتە خوێنەوە کەرەستەی خۆپارێزی چالاکتر دەبێت بەڵام لەشەکە پەکی لەسەر ئەو چالاککییە نەکەوتبوو کە لە ڕەددی هجومی خەرج بکات، چاکتر بوو بۆی بیکاتە بژیو و خۆراکی فراژیبوونی بێمیکرۆب. زۆری و کەمیی پشکی خەڵقیش لە دارایی و جوانی و زیرەکی کەسایەتی و تەنسازی هەمیشە، لەوپەڕی ڕاستەوە هەتا ئەوپەڕی چەپ، شتێکی بەرچاو بووە چ لزوم ناکات خەڵک بەشەڕ بهێنێت لەسەر هەرشتێکی پشکیان تێیدا کەموزۆری عادەتی بێت. چەندێکی ڕیاکارانە بگوترێ خەڵکی فڵانە ڕێژیم هاوچوونن قەت عەقڵ ناسەلمێنێ سەرۆکی دەوڵەت و پاسەوانی لێرەوار لە یەک پلەدا بن ئیمکانیش نابێ زانست و هونەر بگەشێتەوە ئەگەر زانای ئاتۆم و کەشتی هەوایی لەگەڵ سەپان و جووتیار و دارکەر وەکوو یەکتر بن. گۆرانیبێژی ئۆپەرا و سەماکەری بالێ دەنگی خۆش و سەمای قەشەنگیان نامێنێ ئەگەر یەک ڕۆژ ببن بە زبڵڕێژ لە ماوەی سێ مانگدا. بۆ ئەوەی هاوچوونی پەیدا بێت دەبێ کاری هەمووان یەکچوون بێت ئیتر سەرلەبەریان سەرۆک دەوڵەت یاخود خێرابەز یان وەرزێر یان دارکەر... بن. ڕاستییەکەی ئەم قسەیە بێلزوم بوو ئەگەر قسەی سەیر و عەنتیکە لە بارەی هاوچوونی و جوداوازییەوە نەکرابایە کە دەزانین واقیعی زەقی دوور لە نەخش و نیگاری فەلسەفی پێمان دەڵێ وڵاتێکی وەکوو دانمارک گەییشتۆتە پلەیەکی ژیاری وەها بەرز، بێ دەهۆڵوزوڕنا و کۆسەبەبیەتی و خوێن ڕشتن و

سووتاندن و هەلاهەلا کردن بەولای هەموو خەون و خەیاڵی خاوەن بیردۆزیی گردەبڕیی و بنەڕەتی و «تناقض»یەوە تێهەڵکشیوە، بەوەشدا تەرازووی گوزەران و ڕەفتار و لەنگەری ڕاستی ڕاگرتووە تا ئەوەی پیشەی ئوتێلچییەتی گەییشتە ڕێکارێک دەڵێی خاوەن ئوتێل خەریکە بەرتیل بە مێوان بدات لە ڕێی ئەو هەموو خزمەتی بێقسوور و جۆری حەسانەوە و خافڵاندنی پێشکەشیان دەکات، کەچی کارگێڕی ئوتێلی وڵاتی شۆڕشاوی کە گیروگرفتی لەبەر تیشکی بیردۆزی «تناقض» ڕەواندۆتەوە لەگەڵ مێوانانداا وەڕس و بەدڕەفتارە مەگەر بەخشیشی تێروتەسەلی بدەنێ لە بری حەسانەوە و خزمەت و دڵڕاگرتن. ئەمەیە مەنتیقی بەرژەوەندی دوور لە بیردۆزی و فەلسەفان تا ئەو ڕۆژەی نیهادی مەردوم لە ڕێی پەروەردە کردن و بێنیازی لە فرتوفێڵ و لە دەست نەهاتنی فرتوفێڵیشەوە ئارام دەبێت ئەوسا خاوەنی ئوتێل و کارگێڕی ئوتێل لە لایەن ڕەفتارەوە چوونیەک دەبن، ئەو ڕۆژەش جارێ لە جیهانی سێیەمی ئێمەوە دوورە. دوورتریش دەکەوێتەوە بە تێنووسان لە دامەن و شاقەڵی «تناقضات» گۆیا کلیکی بەهەشتی سەر ئەرزە و بە پێش خستنی چارەی بنەڕەتی لە چارەی فەرعی بۆ گیروگرفتی ژین، ئەمەیش خەفەتێکە لە دەیان ساڵەوە بەسەر دڵاندا گامەڵاس بووە.

حەقیقەتی سێیەم ئەوەیە، لێ بوونەوە لە «تناقض» و جوداوازی و خواروژووری بە قەمچی ناو لەپی خاوەن چارەسەریی بنەڕەتییەوە جگە لەوەی کە پڕە لە گریمانەی[12] بیردۆزیی بێبنەما و بێسوود، هەر چونکە لە پێشەکیە فەلسەفیەکانیاندا یەکجار دوورن لە حەقیقەت، دەشکێشێتەوە بۆ ئاکامی پێچەوانەی مەبەست، یەکەمیان و هەرە زلیان ئەوەیە کە خاوەن ئەمر و نەهی دوای سەپاندنی ئەو چارەسەر کردنە پتر دەتوانێ ئازاربەخش و تەنگەتاوکەر و خۆسەپێن بێت بە جۆرەها وێنە و ڕەنگ، کە دەزانین توجارەکانی شۆرجەی بەغدا و قەیسەریەکانی مۆسکۆ لە هەموو مێژوودا نەیانتوانیوە دەیەکی پۆلیس و کادری حیزبی بە خۆی و حەیزەرانی چارەی بنەڕەتی نێو لەپی ئاسنینەوە زراوڕژێن بن، زێدە بەڵاش لەوەدایە کەوا بەقەدەر پاشکەوتوویی وڵاتێکی بەردەستی «بنەڕەتیەکان» نازوفیزی فەرمانبەدەست ئاشکراتر و هێمنایی کوژتر دەبێت چونکە وڵاتی پاشکەوتوو پێوانەی داد و ڕەفتاری لەباری چەسپاوی نییە کە

[12]- گریمانە: فرضي.

کابرای قەمچی لە دەست پێی بسەنگرێتەوە. من کە دێم و دەڵێم «چارەسەرە بنەڕەتیەکان» لە ڕێژەی کۆ نەک تاک قسەکەم ڕاست دەردەچێت بەوەدا کە ئەو تەعبیرنامە بەرزانەی هیچ کەسی ڕیزی نزم ناتوانێ ڕەخنەیان لێ بگرێت وێنەی چارەسەری نەوباوی ئەوتۆیان دۆزیوەتەوە هەریەکەیان لەگەڵ مجێزی خاوەنەکەیدا ڕێک هاتووە تا ئەوەی دیتمان سەرۆکی یەک لە وڵاتەکانی عەرەبی شۆڕشاوی ڕۆڵی بانگڕاهێڵی[13] وەرگرت بەڵکوو خێرەومەندێک لە سەرۆکەکانی عەرەب ڕازی بێت لە ڕێی دنەدانی مەبدەء و پارەی نەوتەوە وڵاتەکەی یەکگرتوو بکات لەگەڵ وڵاتی بانگ ڕاهێڵەکەدا. لاحول ولا...

بیروباوەڕی ڕەها[14] لە هەر لایەکەوە بێت جۆرێک هەمەگیریی پێوەیە وەک ئێوارە و بەیانی بەسەر چەشمەندازدا دەکشێت و باوەش بە ورد و درشتدا دەگرێت لەوەشدا خەفەتێک و دووەم و دەیەم بە دەم ڕۆژگارەوە دەردەکەوێت چونکە حەقیقەتی ڕەق و زەق و سەرسەخت بە ڕەهایی دەردەکەون بێ ئەوەی هەست بکەن کە لەگەڵ هەندێ گوتەی ئەو بیروباوەڕانە تێک هەڵدەئەنگوون وەک کە زەوی نەیدەزانی خوولانەوەی بە دەوری ڕۆژدا حەقیقەتێکە ئەو فکرە غەیبیانە دەشێوێنێت کە وەهایان دانابوو زەوی لە مەرکەزی دنیادا چەقیوە ئیتر بە دزیەوە دەخولایەوە هەتا زیرەکێکی فەلەکناس نهێنییەکەی دۆزیەوە و بە خەڵکی ڕاگەیاند ئیتر پێویست بوو بەرهەڵستی بکرێت لەو بۆچوونەی ئەو نرخانە دەهەژێنێت کە بەندن بە داوەستانی زەویەوە. ئیتر فەلەکناسەکان ناچارکران پاشگەز ببنەوە لە گوتەی سووڕانەوەی زەوی تا هێندێکیان لە ترسی ڕوح پاشگەزبوونەوە هێندێکیشان مجێزی نەیهێنا ملکەچ بێت بۆ دەسەڵاتداران و سووتێندرا...

ئێمەش بەرلەوە چەند سەدەیەک کێشەی ئافراندن و قەدیمیی قورئانمان حکوومەت و میللەتی خەریکاند و کەسانێکی هاڕی و چەندانێکی خستە زیندانەوە. هێندێکیشیان بۆی هەڵاتن و دەرچوون بە خۆ و ئیمانیانەوە، دواتریش زۆرەملێی تاکڕایی شریتەی بەست، سەرەژێر بە ڕۆژگاردا، تا دەمی ئێستاکەمان، لەو دوو سەدەی دوایشدا پەژارە

---

[13]- بانگڕاهێڵ: منادي.

[14]- ڕەها: مطلق.

زیادی کرد و بەڵا زلتر بوو بە پێی زیادکردنی کەسانێکی خەریکی دەمەتەقە دەبن لەسەر بیروباوەڕی و لێی خەرج دەکەن و فێرگە و فەلسەفەی جۆرجۆر کەوتنە مەیدانی کێشە و بەرپەچ دانەوە بە پێی زۆربوونی مەردم و لێشاوکەی بەرهەم و تێکئاڵقانی بەرژەوەندە زلەکان و مامناوەنجییەکان (لە لایەکی دیکەوە) بەرفرەوانبوونی سەرچاوەی ڕاگەیاندن[15] و خێرایی پەیامەکانیشان ڕۆڵێکی بڕیەداری بوو لە کورت کردنەوەی کاتی پێویست بۆ ڕەسینی هۆی تەقینەوە. ئەمانەش، وەک دیارە، شتی زانراوی ئەوتۆن حۆجەمان پێیان نەدەبوو ئەگەر زەرووڕەتێکی ڕچەی قسان داخوازی نەکردبایە پێیاندا تێپەڕم بۆ ئەوەی قسەیەکی خۆمیان تێدا بکەم لە گۆشەیی تێوەڕامان لە هۆی هەژەندەکان[16] نەک هەژەندەکان خۆیانەوە: پەرۆشی من لەچاو پەرۆشی خەڵق بەوەدا زیادی کرد کە دەبینم فرەبەرەکی[17] و یەکتر پواندنەوە لە سروشتی نەفسانەوە نەک سروشتی شتانەوە پەیدایە کە نەفس بە دوا هەوەس و بەدایەتی و بەرەڵڵایی یاخود کوێری و سەرسەریەتی و نوقومبوون لە کەودەنی و گومڕایی دەکەوێت، فەرقیش گەلێ زۆرە لە نێوان ڕاڤەکردنی کارەسات بە سروشتی نەفس و سروشتی شتان چونکە ئەگەر«سروشتی شت» داوای ئەو کارەساتە بکات قسەکردن لە بارەی بەزاندن و پووچاندنەوەی فەرمانی دەبێتە هیچ چونکە وەک باسی مەنعی ساردیی زستان و قورسایی ئاسن و تاڵایی گوژاڵ دەبێت، خەفەت لێخواردنیشی هەر دەچێتەوە هیچە. وا پێ دەچێ زۆربەی ڕۆشنبیرانیش خۆشباوەڕترن بۆ هۆی سروشتی لە تەعلیلی تەنگوچەڵەمەی کۆمەڵایەتی، بە لایانەوە لزوم نییە بۆ خەفەت خواردن لە شتێکی چارەی نەبێت.[18]

---

[15]- ڕاگەیاندن: اعلام.

[16]- هەژەند: كارثة.

[17]- فرەبەرەکی بە قیاس لە دووبەرەکی بۆ «خلافات هاتووە. فرەبەرەکی دەبێتە «لعبە الخلافات».

[18]- لێرەدا مەبەست تەنگوچەڵەمەیەکە داڵدەی «تناقض» و جوداوازیی بەرژەوەند پەیدای دەکات.

هەندێ بیریار وردبوونەتەوە و چوونەتە ژێر ڕواڵەتی کۆمەڵایەتییەوە و هۆی گیروگرفتیان لە سادە وێنەی سروشتییەوە ڕاگوێستووە بۆ وێنەی کۆمەڵایەتی کە بە لایانەوە جوداوازیی بەرژەوەندە. بەوەشدا هێزی سەبەبی سروشتییان پێ داوە لە ڕاڤەکردنی کاروباری مرۆڤ ئنجا بە ڕواڵەت هۆی «تناقض»یان خستۆنە ژێر چارەسەریەکی کە گۆیا لەو «تناقض»ـە پاڵێوراوە و بە لایانەوە زانین سەبەبە پێناسەی نەخۆشی ئاشکرا دەکات ئیتر ڕزگاربوون لە بەدایەتی بە ڕزگاربوون لەو سەبەبەی ماددی بەرژەوەندییەوە دەبێت. چی لەو جۆرە فکرەوە تێبینی دەکرێت دوو شتی زێدە گرنگن: یەکەمیان ئەوەیە حەتمیبوونی بەدایەتی بە پێی ئەم بیردۆزییەش بە ملەوە دەبێت وەک کە لە ڕێی سەبەبی سروشتییەوە بە ملەوە بوو، تەنها فەرقێک هەبێ ئەوەیە کە دەڵێن چارەی بەدایەتی مومکینە لە ڕێی نەهێڵانی سەبەبەکەی، لەوەشدا بە جۆرێکی کوشندە کۆمەڵایەتی تەنک دەبێتەوە هیچ چارەیەکی بە کەڵک نەیەت، تەنات ئەو چارە بەرژەوەندییەش کورت دەهێنێ لەبەر نوێبوونەوەی بەرژەوەندان و فرەجۆرییان و زیادکردنیان و گۆڕانی مەیلی خەڵق و مۆدێلی شتان و کەمبوونی توانای کڕین لەتەک نرخی بابەتدا ئیتر مومکین نابێ شێوەی کۆمەڵگەی سەد ساڵ دواتر وێنەکێش بکرێت تاکوو بشێ خەیاڵ بڕوا بۆ چارەی ئەو بەرژەوەندانەی کە لە دوارۆژ خەڵک لەسەری ڕێک ناکەون، بەڵکوو پێویبیست نییە پشکنینەوە لە نوێبوونەوە و زیادبوونی بەرژەوەندەکانی دوارۆژ بکەین: ئەوەندە بەسە مومکین نەبوونی ڕەزامەندیی خەڵق لەسەر دابەش کردنی ئەرک و پایە و بەرپرسایەتی و پاداش بە بیردا بهێنین هەر تا ئەگەر بە تەرازوویەکی سەرجەم داد وەیا بە تیروپشکێ وەیا بە پێی کارامەیی متمانەبەخش، ئەو دابەش کردنە ئەنجام بدرێ، چی گوتیشمان قسەی سەر کاغەزە کە ملکەچی قەڵەمی ناو پنجەکانمە ئنجا ڕێک نایەت لەگەڵ واقیعێکی بە خەیاڵمانیدا دەهێنین کەوا تا بڵێی جودایە لەو واقیعەی هەناسە هەڵدێنێت و دەگۆڕێت و نوێ دەبێتەوە و تێک دەهاوێژێت و نەفس و دڵ دەبزێوێت بە ئارەزۆ و کپ دەکرێتەوە بە نەلوانی دابین کردن، ئیتر لەگەڵ بێئۆقرەییدا دەژیت و ئەگەر ترسی قەمچی نەبێت بێئۆقرەیی بەردەوام دەگاتە تەقینەوە. دووەمیان ئەوەیە کە مرۆ هۆی یەکسەرەیە بۆ خراپە و چاکە.

لێرەشدا بەبەر قسانەوە نانیشم کەوا چۆن تەبیات و توانای خەڵک دابەش دەبێ بەسەر چەندین پلە و جۆر لە هێز و سستی و چاکە و بەدایەتی و نارەزایی و رازیبوون و فرەبابەتبوونی نرخاندنیان بۆ چاکی و خراپی و چی دەشێ و چی ناشێ لە کەرستەی کارگوزاری و بەلاگێرانەوە، بەڵێ لەوانە دەگەرێم و جووت دەرۆم لەگەڵ مەنتیقی ئەو بیریارانە کە چارە [ی گیروگرفت] لە تەسەل کردنی لایەنی ماددیدا دەدۆزنەوە، تا ئەوپەری مەیدانیش لەگەڵیاندا هەنگاو هەڵدێنم ئنجا دەیانبینم روبەرووی ئاکامی ئەوتۆ دەبن نە بیری لێ کراوەتەوە نە مەبەستیش بووە لە سەرەتای دارشتنی فەلسەفەیانەوە، چونکە بێگومان بێچارە دەمێنن لە هێنانەدی بەڵێنەکانی کە بە قسە و نووسین دایاونە و سەربە ئەنجامێکەوە دەنێن کە بریتی بێ لە تەسک کردنەوەی ئارەزۆ و پێداویستەکانی خەڵک بە پێی تەسکایی توانای فەلسفەکەیان لە تەبیعەتدا، تا ئەگەر گەرۆکێک بۆ خێزانێک لە ئیمکاندا نەبوو یەک گەرۆک بەسەر دوو خێزان و سێ خێزان و دە خێزاندا دەسەپێنن بە پێی کورتهێنانی گەرۆکی بەردەست، ئەوساش مەدح و سەنای پاس و دزێو کردنی «پەیداکردنی پێداویست» دەکشێتەوە بۆ «قتووپەستکردنی ئارەزۆ» بەرەو بەهەشتی بەڵێن پێدراوی ئادەمیزاد.

لێرەدا ناچمەوە بۆ باسی دەوری هاندەر لە گەشە کردنی پرۆژە و چۆناوچۆنی بە بەهانەی چەسپاندنی «گیانی کۆمەڵ» لە چارەسەری بنەرەتیدا گیانی «ابداع» و پیت وێکرا دەکوژێت و دەگەرێمەوە بۆ ئەوەی خەریکی بووم و لە گۆشەی فرەچەشن کردنی قسە و نوکتەی پیاوێکی زیرەک دەگێرمەوە کە بەر لە پانزدە ساڵێک دەیگوت، ئەو فەلسەفانەی زۆررۆیی دەکەن لە فکرەی «میللی کردن» دێن لە پێشەوە مرۆ میللی (تأمیم) دەکەن بە پەکخستنی رەخنە و رەفز و خوابیشتی بەوەدا ماڵ و حەز و دڵخوازیش لە خۆوە بە «تحصیل حاصل» دەبنە میللی. من لەمەدا حەقیقەتێکی دیکەش هەڵدێنجم کە فەلسەفەکانی سەربە «تناقض» و پوواندنەوە و راڤەی بەرژەوەندی بە زۆری دەیلێنەوە کە کۆمەڵگەی «چارەسەری بنەرەتی جذری» ئەزمەی ئابووری تێدا دەرناکەوێت، ئەمەش دەکەن بە بەڵگەی دروستیی ئەو فەلسەفەیەی پێرەوی لێ دەکەن بۆ رەواندنەوەی «تناقض». راستییەکەی دەرنەکەوتنی ئەزمە دەگەرێتەوە بۆ بێئیرادەیی و بێدەسەلاتیی و ویستن و نەویستن لەو کۆمەڵگانەدا چونکە دەربرینی دڵخوازێکی نەگونجێت لەگەڵ یاسا و نیزامی رەسمی لە بنەرەتەوە

حەرام بووە بە نامەی ئەوەی کە گەلێکی «تناقض»ی تێدا نەمابێت کەمایەتیەک نابینێت تێیدا ناڕازی بێت ئیتر چۆن بە گژ خۆیدا دێتەوە!

کشتبوون[19] لە کۆمەڵگەیەکدا ڕوو دەدات کە دەتوانێ تەعبیر لە زاتی خۆی و ئارەزووەکانی بداتەوە و ئامرازی دەربڕینی لە دەستدا بێت. لێرەدا حاڵەتی ڕەگەز و ئایین چپاندن و داگیر کران لە لایەن بێگانەوە نایەتە ناو حیسابمانەوە کە ئەویان هۆیەکەی بەولای فاکتەری ئابوورییەوەیە و هێزە زلەکان و دەستوپاوەندیان زەرفی وەها دەخوڵقێنن و یارمەتی و ڕێنموونی وەهای تێدا دەکەنە دیاری کە بەرهەڵستی و ڕاپەڕینی بە دمەوە بێت چ بە بەهانەی ڕاست بێ یان ساختە. بە تەماش نین گلەیی و پیرۆزبایی ببەشینەوە هەتا ناچارین دەوری هەموو حاڵەتەکان هەڵێن و شیتەڵیان بکەینەوە. بەهەمەحاڵ ئابووری، وەک سەبەبێکی ئەزمە، هەر دەمێنێتەوە بە شەقڵی ئەو کۆمەڵگە پێشکەوتووانەی توانای ڕەفز و ڕازیبوونیان هەبێت و خاوەن مافی داوا کردن بن.

پشکی من لە پەرۆشی ئەو تەرزە حاڵوبارەدا زیاد دەکات سەبارەت[20] بە قەناعەتێکی لە ویژدانمدا چەسپاوە، کە ئەگەر سەرهەڵدانی وەیشوومە بدرێتەوە بە هۆی سروشتی - بەرژەوەندی وەک ئەوە دەبێ کە پزیشک بە دوا دەرماندا بگەرێت و نەشیگاتێ چونکە نوختەیەکی کردۆتە مەرکەز کە حەشارگەی دەرمانەکە نییە، ئنجا هەر وەک بەرز کردنەوەی دیواری بەندیخانە چارەسەری هۆی بەدکاری ناکات، هەروەها دەست گرتن بە کلکی کوتاڵ و بەرژەوەندەوە سینە پاک ناکاتەوە لە خراپە. چارەسەر کردنی خراپە هەر لە چارەسەر کردنی مرۆ خۆیەوە دەبێت. دەمەوێ بڵێم، هۆی خراپە و چاکە دەبێ ببرێتەوە بۆ مرۆکە خۆی سەبەبی هەموو سەروبەرێکی کۆمەڵایەتییە، ئاخر هەر خۆی کەلوپەلێک دروست دەکات کە هەوڵدەران خەریکن بیکەن بە ڕاڤەکەری ڕەفتاری. ئەگەر ئەو کەلوپەلانە، حازر بەدەست، لە ئاسمانەوە بە خۆیان و دنەدانی ڕێنموونی و گوامرییانەوە بەسەر مرۆدا باریبانایە جێی متمانە بوو بێین لەبەر تیشکی

---

[19]- کشتی: ئەزمة.

[20]- سەبارەت بە: سەبەب بە... چ پەیوەندی نییە لەگەڵ «نیسبەت... » وەک ئێستا کەوتۆتە برەو. بەیتی فۆلکلۆری شایی هەیە دەڵێ: سەبارەت بە تۆ من لێرە بەندم.

هێمای ئەو کەلوپەلانە ڕەفتاری مرۆ ڕاڤە بکەین بە جۆرێکی پێی بڵێین ڕاڤەی سروشتی - ماددی سەبەبڕوون، بەڵام لە فەلەکەوە دانابەزن، لە مێشکی مرۆڤەوە زەنە دەکەن پێشتریش کەلوپەلەکە لە شێوەی ماددی سەرەتاییدا لەگەڵی ژیاوە، لەبەر چاوی، بە پلەکانی «تصنیع»دا ڕەت بووە و بۆ بازاڕ چووە ئیتر خێرەومەند یان بەدکار دەیفرۆشێت و هێندێک دەیکڕن و هێندێکیش نا.

ئنجا مەیلی مرۆ بە لای شتومەکەکە یاخود لێ سەنگرانەوەی کارێکی ئالەتی حەتمی نییە کە دەزانین مرۆ خۆی بە چەند پلەی جودا جودای تەمەندا تێدەپەڕێت و هەر تەمەنە جۆرە کەلوپەلێکی لە مجێز دێت یان سوودی دەبێ بۆی، لەوانەیشە هەندێ کەس جەنە بگرێت و ڕەفزی شتەکە بکات با لەباریش بێت، باوکیش بۆ منداڵەکەی شت دەکڕێت نەک منداڵەکە خۆی. حیکایەتی باوک و دایکیش کە لە بری منداڵان بەرژەوەندیان بۆ هەڵدەسەنگێین و شوێنی ئەو دیاردەیەش لە بیردۆزیی «بەرژەوەند و تناقض» حیکایەتێکی ئاسان و کورت نییە هەر ئەوەندی بە کورتی تێدا دەڵێم: تەنها ڕاڤەی بەشەری دەتوانێ ئەو پرسیارە لە شوێنی ڕەوای خۆیدا، بێ لەقەلەق و چاپوکدەستی، دابنێت تا بزانین بۆچی هەندێ باوک منداڵی خۆی بێلزوم دەفرۆشێت و هێندێکیش خۆی بە فیدای سەلامەتیی منداڵەکەی دەکات.

دەچمەوە بۆ شریتەی قسان و دەڵێم کارێکی گێلانە دەردەچێت بێین سەرلەبەری مەسەلەی کەلوپەل و پیشەسازی بدەینە بەر یەک بڕیاری گشتییەوە چونکە ناشێ بە سادەیی بڵێین مرۆ شتان دروست دەکات و بابەتی نوێ دادەهێنێت چونکە کەمێکی زێدە کەمی مرۆڤ دادەهێنێت و دەسازێنێت لەو ڕووە کە توانای «ابداع» کارامەییەکی زێدە دەگمەنە و دەبێ بۆشی بلوێت هەتا دەتوانێ دەوری ژیاریی خۆی ببینێت: وا دەبێ داهێنەر جارێ پێداویستەکانی داهێنانی دەردەست نەکردووە دەمرێت یاخود بەدمجێزێک یان دەسەڵاتدارێک یان تەماعکارێک یان بەدکارێک لە ناوی دەبات. دەسەڵاتی پیشەسازیش مەرجی ئەوتۆی هەیە بۆ هەموو کەسێک نارەخسێ تا دەبینین وەرزێر لە نزیکەی شەش هەزارساڵەوە بە دوا گاسندا هەنگاوی شەکەت هەڵدێنێ و فکریشی نەکردەوە بایی موویەک لە کاریگەرایەتیی گاسنەکە زیاد بکات. ئەو گوتەیەی دەڵێ: کردەوە (عمل) خالقی مرۆیە و بنەمای پێشکەوتنیەتی گوتەیەکی سافیلکەی زێدە ڕۆچووە لە بەرەوپاشبوونەوە: هەر تازە گوتمان وەرزێر لە

کاریگەرایەتیی گاسنەکەی زیاد نەکرد، بگرە لە ماوەی پێنج هەزار ساڵدا گاسنەکەشی پێ دروست نەکرا، لە شار دەیکڕێت. مرۆی هاوتەمەن و هاوچین و هاوپیشەش هاوچوون نین لە ئارەزۆ و لە ڕەفتاریاندا، دەبینی «عمر عبدالعزیز» و «غاندی» حەزیان نەچووە کەڵەگایی و نازوفیز و لەشکرکەشی کەچی نیرۆن بە دیار مەشخەلی ئاگری ڕۆماوە هەڵبەستی دەهۆنیەوە و مۆسیقاژەنیی دەکرد.

پاشخانی سەقافی، دینیشی لەگەڵدا بێت ئارەزۆیەک دەکوژێت یەکێکیش تیژ دەکاتەوە هەر بەو پێیەش نەخشەی پیشەسازی لە ولاتێکەوە بۆ ولاتێک بە گۆڕانی پاشخان و ڕاهێنان و دەرسدان دەگۆڕێ. دەبینی بلیمەتێک لە دەستوورەکانی کیمیا و فیزیاوە بنەمای داهێنانێکی نایاب دەدۆزێتەوە تا ئەگەر کردی بە بەرهەم شەریکەت و حکوومەتان دەیقۆزنەوە بۆ قازانجی خۆیانی لە کاردەهێنن لە ڕووکارە[21] پەسەندەکەی وەردەگێڕنە لایەک کە ویژدانی داهێنەرەکەی لەعنەتی لێ دەکات. مادده چەندێکی گرنگ بێت و بە هەند هەڵبگیرێت دنەی ئیرادەی مرۆ نادات مادەم تێی نەگەیشتبێت بۆشی ناکەوێتە تەقەڵا ئەگەر دەستی بەسەریدا ڕانەشکێت، وەک کە ڕاناشکێت بەسەر نەوتی ژێردەریادا.

لەوانەیە کوتاڵێکی پەسەند لەبەر کەمشارەزایی لە بازاڕ برەو نەستێنێ یان لەبەر ڕکەبەری ستەمکار یاخود نالەباریی دەس خستنە بازاڕیەوە... مەعلانیی مرۆ و توانای داهێنانی و ڕەفتار ژیرانەی لەگەڵ دەستووراتی ئاڵوێر کردن و شارەزایی لە مجێزی خەڵک و هەوەسی دەمدەمی کاری خۆیان دەکەن. لە بەرانبەردا ئارەزۆ و پێداویستی یاساکانی نەریت و ئایین و دەوروبەر و سەرجەمی پاشخانی سەقافیی خەڵک و چی بە خەیاڵیشمدا نایەت لەو جۆرە فاکتەرانە ڕووبەڕوویان دەبن، لەو ڕووبەڕووبوونەوەشدا فەندی بێئەژماری وەک مونافەسە و قرغ کردن و دا کردن و مۆدێل گرێ هەر لە هی گەرم و نەرمەوە هەتا مام ناوەنجییەکەی و لە مەیلەو شراوەیەوە تا بێپەردەی کاری خۆیان دەکەن بەر لەوەی لێو بزێوین و بلێین زەرفی ماددی و بەرژەوەندی وەها و وەهایان ویست، دەشزانین ئەو زەرفەش هەموو کردەی مرۆڤ و قرساندنی و ملکەچی ئیرادەی گێل و زیرەکییەتی، چ چاک چ خراپ، ئنجا چۆن بوێرین خێرا

---

[21]- ڕووکار: وجهة.

ڕاکەین بۆ «بەرژەوەند» یان تێکڕای ماددە هەتا چی هاندەر و پەکخەر و جۆرەها کاریگەری حەرام و حەڵاڵکەر و ڕێزلێنان و سووک کردن و ڕەفز و قبووڵ هەیە وەپاڵ ماددەی بدەین مرۆڤیش لە تەکیا بە مەخلووقێکی بێئیرادە وەیا بە کەلەپچەی نادیاری کێشەر و دوورخەری ئەو بەرژەوەند و ماددەیە لە قەڵەم بدەین، بەر لە هەموو شتێکیش دەزانین نە سوود نە دروست کراو و نە یاسا و نیزام و دەستوور وجودیان هەیە بێ وجودی بەشەر بە خۆی و سیفەتی بەرز و نزمیەوە! چۆن دەشێ قەساب بە ڕاکێشراو و کوشتەش بە ڕاکێش دابنێین؟ شتیەڵ کردنی ماددی و هۆکاری بەرژەوەندی لە هەر کەسێکەوە بێت، لە ڕاوە ڕێویەکی بە تەڵە بکرێت داوا دەکات مرۆکە دوو جاران بە عەبد بزانین: جارێکیان دیلی ڕێوی بە تەمای گۆشت و کەوڵی، جارێکیشیان دیلی تەڵەکە بۆ ڕاوەکەی بەکارهێناوە.

لە دروست کردنی ئاوریشم مرۆ ئەسیری کرم و پەلکەدار و ئەو مەکینانەیە بەکاردێن لە ڕستن و چنین و گواستنەوە و فرۆشتن و چەندەها شتی دیکەش، هەرچی کرم و دار و بۆیاغ و چەرخ و بازاڕیش هەیە قیت ببنەوە وەک پێشتر ڕێوی و تەڵە قیت ببونەوە بە حاکمی سەر ئیرادەی مرۆ. سەیریش لەوەدایە کە زاناکانی کۆمەڵایەتی گورگ بە ئەسیری ڕێوی و چوێلکەش بە ئەسیری کرم دانانێن لەو ڕاوە خۆراکەی دەیکەن. تاکە سەبەبێکیش بە بیردا بێت لەو هەڵوەستە سەرەوبنەیاندا ئەوەیە لە گورگ و چوێلکەدا کۆمەڵایەتی و مێژوو و گۆڕانکاری ژیاری نادۆزنەوە هەتا بیاندەنەوە بە هۆی ماددی بەرژەوەندی ئیتر با گورگ بە کەیفی خۆی ڕێوی بخوات... با هەر خۆی کێشەر و کارا بێت بە دافیعی برسیەتیی و وزەی نێچیر گرتن.

ئنجا ئاوڕیش لە فاکتەری «تناقض» نادەنەوە لە کێشەی نێوان گورگ و ڕێویدا هەر چونکە «تناقض»ـەکە نابێتە هۆی گۆڕانی گورگەکە وەک کە دەڵێن هۆی گۆڕانی بەشەرە. هەروەها بێدەنگیش لە سەلبییەتی لەکلەک و گورگ و بەستەزمانی تر بەرانبەر دیاردەکانی هەوا و تریفەکانی ئاسمان کە نایەن «بەستەزمانەکان» چیرۆکی ئەفسانەیی و دێڕە شیعر و جۆرەها خەیاڵ و سکاڵا ڕوکنەکانی پەرستنیان بۆ ساز بدەن وەک کە مرۆڤ دەیکات بەڵام هەر ئەو زانایانە کە دەبینن مرۆ دیاردەکانی سروشتی پەرستووە و قوربانی بۆ بوڕکان بردووە و تەوتەم و تەلیسمی دروست کردووە بۆ دەفعی گەزەندی پەنام بە پێویستیان زانی کە هۆش و ئیرادەی لغاو بکەن بە داوی

ملەچەرخێی وەلایانەوە و ملکەچبوونی بۆ دەسەڵاتیان. ئەو زانایانە خوای میهرەبان لێیان خۆش بێت، دێن مرۆ دەکەنە دەستبەستەی هەر شتێکی جوان کە خۆی دروستی دەکات بەوەدا کە ڕەفتاری دەکەنە نەتیجەی حەز کردنی لەو شتانەی دروستی کردوون ئیتر کردیانە دیلی ئابووری کە خۆی ئافراندوویەتی و دیلی ڕامیاری و دەوروبەر و «تناقض» و هاندەر... ئیتر لە تەعلیلیاندا دەبێتە جاڵجاڵۆکەیەکی کەوتبێتە دوای ڕیسی خۆیەوە، ئنجا لە ڕێی مەفهوومی عەکسییەوە ئاژەڵ لە کۆتی ئەوتۆیی ئازاد بووە چونکە جیهانەکەی ئەو بێ کۆتە.

زاناکان لێیان دەوەشایەوە لەو قوربانییەی، مرۆ بە نیازی خۆپارێزی بە بورکان و تۆفانی دەبەخشێت دەلالەتێکی تایبەتی بۆ حورمەتی مرۆ بدۆزنەوە بەوەدا کە کارەکەی لەچاو گیانلەبەری دیکە زێدە فامێکی تێدایە کە هات لەو قوربانییەدا تووڕەیی سروشت و دابین کردنەوەی لە ڕێی دیارییەوە تێک بەست بە قیاس کردن لە هێووربوونەوەی غەزەبی دەسەڵاتداران لە ڕێی دیاری و پاڕانەوە. خۆ کە هات بەر لە دەیان هەزار ساڵ دیاری و ڕەزامەندی بۆ دەفعی بەڵایەکی بێدەرمان تێک بەست هەر ئەو ئیدراکە بوو فراژی و بەرز بوو تا گەییشت بە سووپەری بروسکە و سیسمۆگراف.

وەختی خۆی مرۆڤ و گاجووت توانای فڕینیان نەبوو هەردووکیشیان دیلی دەورووبەر و یاساکانی سروشتبوون بەڵام هۆشی مرۆڤ کە فەیلەسووفەکان دەیکەن بە بەندەی ماددەی مردوو، ئەو هۆشە خستییە سەر ڕێبازی کێشانە و پێوانە ئیتر کە دیتی پووش و لۆکە و تۆز بە هۆی باوە ڕەهەوا دەکەون کەوتە بیرکردنەوە لە فێڵێکی ئەوتۆ کە ئەو قورسایی لەشی مانیع لە فڕینی، بە هۆی ئامرازێکی هەوای پێ ملزەم بکرێت، سووک هەڵسێتەوە. من بە پێچەوانەی خاوەن تەفسیری ماددی بەرژەوەندی، وەها دەبینم کە مرۆڤ قوربانیی پێشکەش بە بورکان کرد دوو جاران خۆی هەڵاوارد لە جانەوەران و دوو جاران لە شتایەتی[22] دەرچوو بەوەدا کە دڵدانەوە[23] و دیاریەکەی بە نیازی سەلامەتی تێک بەست دوای ئەوەی کە دیاردەی تەقینەوەی بورکانی لە ئیرادەیەکی

---

[22]- شتایەتی: الشیئیة.

[23]- دڵدانەوە: ترضیة.

پەنامەکی بەست. بەڵێ، دەزانین لە هەردوو بۆچوونەکانی سەهووی کردبوو کە مەعلوومە بورکانی مردوو ئارەزۆیەکی نییە دابین بکرێت بە دیاری، چ ئیرادەیەکی دەستنیشانیش لە تەقینەوەدا پەیدا نییە کە ئەوسا مرۆ توانای نەبوو ئەو فاکتەرانەی فیزیایی بزانێت هۆی تەقینەوە بوون، لەگەڵ ئەمیشدا تێبینییەک دەکرێ کە تەنها مرۆ لە نێوان هەموو بوونەوەراندا بیری کردەوە خۆبپارێزێت لەو گەزەندەی خۆڵێ پاراستنی بە هەڵاتن و خۆشاردنەوە و شتی ئەوتۆیی مومکین نییە. هەرچی سەلبییەت و وشک هەڵاتن و بێموبالاتی بێت شایەنی بەرد و دار و ئاژەڵە، هەتا هەتایش هەروەها دەبن.

من پەرۆشم لەوەوە نایەت کەلپەلەکان و شتە بژاردەکان بایی لێ وەشانەوە بە هەند هەڵبگیرێن لە لایەن مجێز و ئومێد و تەمای مرۆڤەوە چونکە ئەو شتانە خۆیان لە خۆیاندا ڕاگەیەنی دەسەڵاتی بنیادەمن بەسەر ماددەدا و نیشانەی کاریگەربوونیەتی لەم جیهانەدا، لە سەرەتاوەش کە دروستی کردن بە نیازی کەلێن گرتنی پێداویست و تەسەل کردنی ئارەزووەکانی بووە، چەندێکیش کارامەیی بەرەو پێش بچێت ئەوانیش بەرەو چاکتریەوە دەڕۆن، جۆرەکانیشان بە پێی دابەشبوونی ئارەزۆی خەڵک بەسەر جۆرەها وێنە و تام ڕەنگدا، فرەچەشن دەبن.

خەفەتی من لەوەوە دێت کە بیروڕای قوتیلە و ئەنتیکە دێن مەیدانی بەرینی سەنعەت و بەرهەم دادەنێن بە تەختەی ئیعلان بۆ ڕاگەیاندنی نۆکەرایەتیی مرۆڤ و ئاغایەتیی ئەو کەلوپەلانە. ئنجا جمینی خەڵکیش بە لای شرۆشیتاڵەکاندا دەکەن بە بەڵگەی ڕاستبوونی ئەو بیروڕایانە کە ڕەفتاری خەڵکەکەی داوە بە هۆی ماددی بەرژەوەندی و ڕۆڵی خالقی ئەو شتانەی پووچاندۆتەوە بەوەدا کە کردووەتی بە نۆکەر نەک پیاو ماقووڵ... پیلکێشراو نەک کێشەر... تۆبزی لێکراو نەک ئیرادەئازاد... ئاوێنەی تیشکدەرەوە نەک هۆشیار، واقیعیش ئەوەیە ئەگەر لە کەلوپەل و کوتاڵێکی بخرێتە ڕوو، چ هێزی دڵکێش و ئیرادەمرێن هەبێ هی دروستکەر وەیا نیشاندەر وەیا برەوبەخش وەیا قرغکەر وەیا مامەلەچی ئەوانە نەک هی کوتاڵەکە کە زووتر وجودی نەبووە لە دوارۆژیشدا نەدەبوو ئەگەر مەهارەتی مرۆڤ نەبوایە و لە هەزاران میل ڕێگەشەوە نەدەگوێزرایەوە بۆ بازاڕی حیللە و بێروت ئەگەر مەبەس ڕاکێشانی حەزی مرۆی ئەو دوو شارە نەبوایە.

ئا لێرەدا ئیرادە و حەزی مرۆ لە ڕووی ئاڵوویرەوە بازارەکان تەسەل دەکەن بە کاڵای سوودبەخش و زیانبەخش، هەر ئەو ئیرادە و حەزانەی لایەنی فرۆشتن و کڕینیش دێننە ناو گەپی ئیقناع و سەرم نەرم کردنی دوولایی وەک کە لە گەپی شەترەنج و شەڕەشمشێردا هەر لایەنە هەوڵ دەدات لایەنەکەی دیکە مل ڕاکێشێت بۆ مەرجەکانی. لەوانەیشە دەوڵەت بە سیفەتی لایەنی سێیەم، یان دز و جەردە داخڵی مامڵەت ببن یان ئەوە ڕوو بدات لە کردەوەی مرۆ کە بە بیردا نایەت بۆ ڕەواجی کوتاڵەکە یان بێرەواج کردنی یان لەناوبردنی. تۆ ئەگەر داوێکی گوریسکێشەکێی نێوان مامەلەچییانی کەلوپەلەکە هەڵگریتەوە دەبینی بەرەو قوڵایی ڕۆ دەچێت تا تەختی بنیاتی کۆمەڵ و ویژدانی تاک دەشبینی کەلوپەلەکە دەشلێتەوە لەگەڵ داوا کەوا بە پێی ڕاکشانی ئیرادەی خەڵک بۆ داواکە و تێنووسانیان لێی، کەلوپەلەکەش هێندەی بڵێی بێئیرادەیە و بێدەسەڵاتە لە ڕەفز و ڕازیبوون و مل نان.

ئنجا ئەگەر تەقدیر وابوو کە تەعلیلی ماددی و نامادی بتوانێ ڕاڤەی ڕەفتاری مرۆ بکات پێویستە دەست توند بکات لەو حقیقەتانەی کاریگەرن لە جیهانی بەرینی مرۆدا و دەڵێن: مرۆ کاتێک ویستی حەز و مجێزی خەڵک ببزێوێ وەیا ئیرادەیان بمرێنێ چ دەسەڵات و مەهارەتێکی هەیەتی بەکاری دەهێنێت بۆ ئیقناع وەیا ناچار کردن بە پێی ئەو کەرستەیەی لە دەستیدایە کە یەک لەوان دڵکێشانە بە جوانیی کوتاڵەکە و یەکیشیان بە زەبری کوتەک... مەنتیق... ئەخلاقیات و شەعبەدە و مێشک سڕینەوە و باوەڕی دینی و ئایدیۆلۆژی و شیرن کردن و قێز لێ هەڵستاندن... و چی دیکە و چی دیکەی ئەوتۆ کە هەرگیز لە پەراوێزی جۆرەها بیدعەتی مرۆ دەرناچێت کە هەر خۆی فێڵباز و هەڵخەڵەتاوە و نۆکەر و پێشەوایە و حەبسکەر و بەندییە و کوژرا و بکوژ و چاک و بەدە و زاناو هێڕە و... و... هەر یەکێکیشیان شێوازی خۆی هەیە - یان نییە- لە ئیقناع کردن و ئیقناعبووندا لە چپاندن و سەرشۆڕ کردندا. ئنجا ئەگەر یەکێک بڵێ: خەڵق کە حاڵوباریان یەکچوون بوو ڕەفتاریشیان یەک چوون دەبێ بەوەشدا نزیک دەبنەوە لە داهێزانی ئیرادەی زاتی و فشانەوەی حاڵەتی پەنجەنیشانی تاکایەتی. ئا ئەو قسەیە تامەزرۆیی خاوەنەکەی نیشان دەدا بۆ چپاندنی شەخسییەتی مرۆ وەک بڵێ لە دادگەی فەلسەفەدا خۆی قەرزدار کردووە بە ئیسپات کردنی هێزی «حاڵوبار» و خوێڕیەتیی «ئیرادە و هەڵاواردن». ئاشکرایە ئەم تەرزە بیروباوەڕە بە

ئەسڵ لە چەسپاندنی تەفسیری مادیيەوە بە عەقڵاندا دێت دەنا بەڵگە لەسەر نەبوونی ئیرادە و ئیختیار لای غەیرە مرۆگەلێک ئاسانترە لە ڕاسان بۆ کوژاندنەوەی ئیرادەی زێدە بەرچاوی مرۆڤ لە حاڵی ئاسایی و بێ کوتەککاری. بۆ تۆ ئاسانترە بڵێی کراس بێئیرادەیە نەک کریارەکەی بە ملکەچی کراسەکە حیساب بکرێت، گوڵەگەنمی حەزبزوێنی سەپانەکە بەردەستی سەپان بێت نەک سەپان ئاڵقە بەگوێی گوڵەگەنم بێت، پتر بە عەقڵدا دەچێت تەفسیری ماددی چالاک خەریکە دەیەوێت ئیقناعت بکات کە فڕۆکە لە موعادەلەی گۆڕانکاریدا لایەنە بەهێزەکە بێت بە بەهانەی ئەوەی، فڕۆکە پێداویستێکی ماددی کۆمەڵە لەوەشدا هەوڵی پەنجا هەزار ساڵەیی مرۆ دەشارێتەوە و زەینت بە سەهوو دەبات لە ئاست بازێکی مرۆ هاویشتوویەتی لە ژیانی شکەفتەوە بۆ فڕین بە فڕۆکە و هەموو لێهاتوویی و زیرەکیەکەی دەکوژێنێتەوە هەر هەتا فرۆکە ببێتە حاجەتێکی ماددی ڕۆژگاری کارەبا دنەی مرۆی دابێت و لێی خوڕیبێت و تێی هەڵپێچابێت بەرەو فڕین و قاچەکانی بە قەنارەی مەزهەبی «تناقض»ـەوە هەڵواسیبێت.

زەرەرێک شک نابەم لەوەدا بگەڕێمەوە بۆ ئەو گوتەیەی کە دەڵێ ڕەفتاری مرۆ بە تێکڕایی لە حاڵی وەک یەکتردا لێک نزیک دەبێتەوە: ڕاستییەکەی هەموو خەڵک لەیەکتر ناچن چونکە ماددەی ڕەقوتەق نین کە دەستووراتی ئەزەلی و ئەبەدی بیانسووڕێنێت تا ئەوەی دوو برا لە ڕەفتاردا لێکتر جودان هەرچەند زەرفیان لە یەک خێزاندا وەک یەکە. ئنجا ئەگەر بە محال ڕازی بین لەوەدا خەڵق لە هەموو ڕوویەکەوە هەمووی چون یەک بن ئەوسا یەکجار سەیر دەبێ ئەگەر هەموو خەڵق وەک یەک نەبن چونکە ڕووبەڕووی موعادەلەیەکی ساکار دەبین وەک -2 = 8-6 = 1+ 10=... بەڵام کە لە قەوارەی ورگدا جودا بوون مجێز و میقداری خۆراک و پێوانەی فانیلە و پێداویستی ماددەی هەزمکەر لێکتر جودا دەبن، «تناقض» و لێکترچوونیش با بەکەیفی خۆیان بجووڵێنەوە هەر دەبێ لەگەڵ قەوارەی ورگی خەڵکدا بگونجێن. خۆ ئەگەر جودایی هێزی چاوتیژی خرایە سەر مەسەلەی ورگ گیروگرفتی «تناقض» بە نیسبەتێکی هەندەسی هەڵدەکشێت. خۆ ئەگەر جوداوازیی باڵاشیان بە دوادا هات «تناقض» دەشێوێت چ بکات لەگەڵ ئەو خەڵقەی هێندە ڕاحەت بوون هەتا یەکچوون بوون.

بە ڕاستی سەرم سووڕدەمێنێ لەوەدا چۆناوچۆنی بتوانم کاریگەرایەتیی مرۆ و کارتێکراویی هەرچی مەوجوودە لە ئەرز و ئاو و ئاسمان و مردە و زیندە ڕوون بکەمەوە لەو ڕۆژەڕا مێشکی مرۆ بە فاکتەری «هۆش» پژا و جودای کردەوە، گردەبڕ، لە غەیری خۆی چونکە تێک ئاڵقانێکی لە کۆمەڵدا و ڕەفتاری تاکە مرۆ هێندە حەپەسێنە و ژمارەی ئەوتۆت دەداتێ لە کردەوەی بەرز و نزم حیکایەتی بابای داهێنەری شەترەنجم بە بیر دەهێنێتەوە کە پاشای شارەکە ویستی پاداشی بداتێ داهێنەرەکەش داوای کرد خانەکانی شەترەنجی بۆ پڕ بکەنەوە بە جۆ، لە خانەی یەکەم دەنکە جۆیەک و لە هی دووەم دوو هێندە و لە هی سێیەم دوو هێندەی دووەم دابنێن و پێبەپێ دووچەندانی بکەن هەتا 64 خانەکەی تەختە شەترەنج پڕ دەکرێتەوە... دیتیان جۆی دنیاش بەشی ناکات.

لێرەدا قسەیەک لە سەرۆکانی ئەکادێمی بەریتانیا دەگێڕمەوە کە لە دیاریی ساڵانەی گۆڤاری «المقطم» میسردا بڵاوکرابۆوە بەو قسەیەش دەمەوێ تێک ئاڵقانی باسکراو ڕوونتر بکەمەوە کە گوتبووی لە بارەی مەتەڵی ژیانەوە: ئەگەر زانای فەلەک بتوانێ بە وردی پێشبینی بکات لە ژمارەی ئەو مانگگیران و ڕۆژگیرانەی لە یەک ملیۆن ساڵدا ڕوو دەدات، هەرچی زانای سەر ئەرز هەیە بە گردی و بە هاریکاری ناتوانن پێشبینی بکەن لە ڕەفتاری مێشێکی بەڕەڵڵا بکرێت لە ژوورێکدا، منیش پەنجا ساڵ پاش ئەو گوتەیە دەڵێم: تۆ بڵێ چۆناوچۆنی دەشێ پێشبینی بکرێ لە ڕەفتاری ئەو شارەهەنگە بەشەرییانەی یەک ملیۆنی و دە ملیۆنیی ئاخناو بە گرێوگاڵ و تێک ئاڵقانی کرداری کۆمەڵ و تاک، چ میراتی بێت و چ تازەی زانستی... ئەفسانەیی... سەربە ئابووری... کارەبایی... گوێزانەوەی... شیناووردی... کوتاڵی... حکوومەتی... ئەهلی... ناوچەیی... جیهانی... مەردانە... ژنانە... حیزبی... دەسەڵاتی پەنام و ئاشکرا کە وەکوو سێبەر یاخود خەتی «طول وعرض» دەکشێن و تەختەی ترس پڕ دەکەنەوە کە لە سەرەتاوە دەست پێ دەکات بە ترس لە مودیری مەکتەب ئنجا لە عەنتەری گەڕەک و ئنجا

هەڕەشەکەرانی ڕوتبە و نیشان بەسەر سینە و قۆڵیانەوە کە خەڵق دەتۆقێنن هەتا «بە ملی کەچەوە جزیە دەدەن».[24]

ئیتر لەو مەنجەڵەی وەها بە کوڵ هەموو هۆشپەسەندییەکانی[25] دەستووری «تناقض» و بەرژەوەند و حیسابی بیردۆزان بەسەر کاغەزی لووسەوە دەبنە هەڵم... مێشێک ڕەها دەبێ لە کۆتی بیردۆزی و پێشبینی و چاوەڕوانی ئنجا پێنج هەزار ملیۆن ئادەمیزادی دابەش بووی بەسەر هەزاران ڕەگەز و باوەڕ و، تێک ئاڵاو بە گرێوگاڵی بێئەژمار و چەندایەتی و چۆنایەتیی تاقانەیی و نیشتمانی و قەومی نێودەوڵەتی و جیهانیی بێسنوور و چی بێ نیهایەتە لە مۆدێل و مجێز و جۆرەها تەسلیە و وێنەهای حەرام و حەڵال، ئا ئەو پێنج هەزار ملیۆنە چ پێشبینیەکی لە بارەوە دەکرێت؟ دەشزانین هەر تاکێک لەو ملیارانە دەشێ جودا بێ لە برا و برادەری بە خۆی و ئارەزوەکانی و قەناعەتەکانی و هۆشی ون و ئاگاداری و تەجرەبەی لە ژیاندا و چی دەیحەسێنێتەوە و سەغڵەتی دەکات. بگرە، لەوانەیە هەر ئەو تاکە خۆی لەم ڕۆژەدا جودا بێ لە دوێنێی بە پێی میزاج و جوداوازیی کاریگەران و جۆرەهای پەکخەر و هاندەر. هەر یەکێکی لەوانەی ڕاستیش ڕۆیشتون دەیشا بە لایەکی تردا ڕۆیشتبایە بە مەرجێک تەجرەبەی جودا بایە لە تەجرەبەی هەوەڵ جار قەناعەتی پێ قاڵب بەستوو بووە. داوە موویەک بەسە بۆ ئەوەی ڕووکاری بەرەو باوەڕی غەیبەوە بۆ لای بێباوەڕییەوە گۆڕابایە ئەگەر لە گەنجاتیدا بە بێ ئیمانێکەوە گیرسابایەوە.

لەلایەن بەرەو چەپبوون و بەرەو ڕاستبوونیەوە لەوانەیە بەڕێکەوت ڕێنموونێکی سەربە ڕاست یاخود سەربە چەپی بۆ ڕەخسابێت. زۆریش وەها بوو کەسێک لە دەروووندا ئیمانی هەژاوە یاخود ڕماوە بەڵام شەرمی دێتەوە بە دیمەنێکیەوە ببینن کە بە لایانەوە نا ئاشنایە هی وەهاش هەن ئیمان بە چەند درهەمێک دەفرۆشن، هەیشە خوێنی خۆی دەدات و ئیمان ناگۆڕێت. تۆ ئەگەر کنە بکەیت لە حاڵی کەسێکی شەیدای قومار وەیا فروفێڵ وەیا کۆترەبازی وەیا کەیف وەیا درۆ وەیا هەواوهەوەس وەیا سەرکزەڵەیی وەیا

---

[24]– «بە ملی کەچەوە جزیە دەدەن» هێمایە بۆ ئایەتێکی قورئان لە سوورەتی «توبة»: «حتی یعطوا الجزیة عن ید وهم صاغرون».

[25]– هۆشپەسەندی: عقلانیە Rationalism هۆشپەسەند: عقلانی Rationalist.

لووتبەرزی وەیا هەرچی ناوی «متناقض»ی لێ دەنێت سەیرت دێتەوە لە دۆزینەوەی ئەوتۆ بە بیری فەیلەسووفدا نەیەت وەک کە یەکێک لێی زەحمەت بێ درهەمێک لە پێناو نیشتمانەکەی خەرج بکات کەچی گیانی لە دەست بدات بۆ دامرکاندنی مەراقێکی کەودەنانەی وەک دزیەتی هی ئەوتۆش پەیدان هەستیان کول دەبێت ئیتر مسیبەتی ئەرز و ئاسمان نایبزوێت و کەیف و شادی هەوەڵ و ئاخریش نایکێشێت. کەسێکی لە بەنگکێشی ڕابێت خۆی و دایک و باوکیشی دەفرۆشێت بۆ دوو نەفسەی «کەیف...» یان یەکێکی سەربە لایەن فکرێکی سیاسیەوە ئەو خوێڕیەتییە بکات کە بەنگکێش دەیکات، دڵنیاش بە لەوەدا کە ئاشتیخوازی ئەوتۆ دەبینێت هێندە تیژڕۆیە فەتوای کوشتنی هەموو ئەو کەسانە دەدا کە نەهاتوون ئیمان بە ئاشتی و بەزەیی بهێنن...

ملیۆنەها شێتی باوەڕی پەڕگیری هەن دوودڵی ناکەن لە تەقاندنەوەی ئەرز و هەرچی و هەرکەسی تێدایە بە نیازی پاک کردنەوە لە گوناحان... درێژەدان بە گەشتی ناو ئەم دەورە سەربە کۆتایی ناگەیەنێت لە هەر کولانەیەکەوە تێبڕوانیت موتاڵای سەیروسەمەرە دەکەویت لە کەینوبەینی ئەم مەخلووقەی کە فەلسەفە و بیردۆزی تۆڕی تەفسیر و تەعلیلی بەدەورەدا دەتەننەوە تا بتوانن خواز و ئومێد و «تصور»ی بکەن بە بەڵگەی ڕاستبوونی ئەو شتانەی تەمایان لێ ناوە هیچیشیان لێی بە ئاوات ناگەن مەگەر ئەوەی بە قەمچی یان ئیقناع یان گومڕا کردن مەیسەر بێت، جۆری ئەو تەرزە وەسیلانەش بێئەژمارن.

ئەو گوتەیەی دەڵێ مرۆ هاوچوونن هێندە سادە و بەستەزمانە وەک ئەوەیە بگوترێ ئەستێرەکانی ئاسمان وەک بە چاو دیارن لێک نزیکن.

بەڵام ئەوانەی بە ڕواڵەتی گوتەدا دەڵێن مرۆ هاوچوونن لێی ناگەڕێن بچێتەوە ژێر ئەو دەستوورانەی، بە پێی ڕانواندنیان، لە پێداویستەکانی سروشت و مجێز بۆیان دادەڕێژن. بگرە ئەو کەسانە لە هەموو سیاسییەک و دەسەڵاتدارێک سوورترن لە سەر زنجیر کردنی ئیرادە بە مانیع و بە پەرچ دانەوە چونکە بێگومانن لەوەدا گوتەیێکی بە مەهارەتەوە دەینەخشێنن بابەتی سیاسین بەکاری دەهێنن لە ڕەوا کردنی مەنع و پەستاوتن و لووتشکاندن و لێخوڕێنێکی بە دوایاندا دێت.

لەو پەڕی ئەوپەڕیشدا [بەری ڕاستەی بە لای چەپڕۆیانەوە] دەبینیت ئەوانەی کە ڕاست دەکەن و دەڵێن جوداوازی لە مجێزی تەبیاتی بەشەردا هەیە، ڕێ دەدەن بەو جوداوازییە خوازی خۆی هەڵبژێرێت، یاسای وەهاش دادەنێن کە لەگەڵ ئارەزۆی خەڵق بڕوات تا ئەگەر ئارەزۆی زۆرینە گۆڕا یاساش بەو پێیە بگۆڕێت، هۆی بیر و خۆڕوونکردنەوەش لە دڵخوازی هەموو کەسدایە و بووە.

ئاشکرایشە، بەر لەوەی حورمەتی بیروڕا قسەی لێوە بکرێت ئەو حاڵوبارە کۆمەڵایەتییەی کە دڵخواز و مجێزی تێدا بەدەنگ دێن هەرگیز بڕیار نادات کرپاچ و هەڕەشەی مسیبەتان بە کاربێت چونکە یەکەم خشت لە هەڵنانی بنیاتی کۆمەڵایەتی سەربە ڕێزنان لە «ارادە» بریتیە لە نوختە سەرەتای ڕێزنان لە زاتی تاک کە لە پێشەوە داوا دەکات دان بنرێ بە جوداوازیی بیروڕا و خواز و نیگای بەرەو دوارۆژ، ئەمەش لە سێبەری بارێکی کۆمەڵایەتیی ئۆگرگرتووی فەلسەفەی live and let live- «بژی و با خەڵقیش بژین» مومکین دەبێت بە جۆرێکی وەها کە کەمترین لێکخشاندنی ئیرادان ڕوو بدات، ئەوسا ناز کردنی هەرکەسێک بە بیروڕای خۆی نازی خەڵقیشی سەلماندووە، هەر جۆرە مەیلێکیش بۆ خەفە کردنی مافی خەڵک لە بەکارهێنانی خوازیان دەکێشێتەوە بۆ بەرەڵڵا کردنی بیردۆزیی «تناقض» لەو هەوڵەیدا کە سەرەنجام یارمەتی لایەنێکی بەهێز دەدات بۆ تێبردنی هەموو لایەنێکی دیکە. سەیر دەبوو ئەمما سەیر ئەگەر شیابا لە سەردەمی سۆمەر و فیرعەونەکانەوە مەبدەئی «تناقض» لە شکڵێکی بەرنامەی فەلسەفیدا خرابایە گەڕ و بەردەوام بوایە لە پاڵاوتە کردن و تێبردنی پشتاوپشت بکوتێت و ببڕێت و نەهێڵێت بە دەستی کرایەوە و بێ لەمپەڕ.

بەڵێ دەزانین تێبردن[26] نە کەم بووە و نە سووک بە درێژایی ڕابوردووی پڕ لە کارەسات بەڵام ئەو تێبردنە و خەفە کردن و هەڵکەندنەی لە مێژوودا ڕووی داوە شتێک بوو چ فەلسەفەیەک بە ڕەوای نەزانیوە و داوای نەکردووە دەستنیشانی ئەو تیرێژانە بکرێت کە نەهێڵانیان بە عەمدی و بە ئیسراری پێشەکی بڕیاری لەسەر درابێت مەگەر لە حاڵەتی بە سفتوسۆی وەهادا کە وشکە باوەڕی بە خۆوەگلاو سوور

---

[26]- تێبردن: اختزال.

بووبێ لەسەری. ئنجا ئەگەر پیرۆزی و ڕەوایی تێبردن لە ڕێی حەتمیبوونی ئەو شتانەی «تناقض» داوای دەکات بوو بەرنامە، دەرفەت نامێنێ خەڵک لە سێبەری لێک بووردن و پێکەوە هەڵکردن و ئاڵوگۆڕیی بەرژەوەندی هەناسەی ڕاحەت هەڵێنێت ئیتر هەر خانەیەکی گەڕەک لەوانەیە خۆ ئامادە بکات بۆ تێبردنی دراوسێکەی بە بەهانەی نەگونجانی بەرژەوەند.

هەر لە بواری ئەوتۆوە بووە، کەسانێکی لە عومریاندا مریشکێکیان سەرنەبڕیوە لە هەرای خوێناوی دیندا کەوتوونەتە چالاکی. گوێ نەدانە گیان و ناموسی خەڵک بە لای دەستدرێژکەرەوە ئاسان نابێت تا ئەو دەمەی حورمەتی کۆنینەی تازە نێچیرەکەی بە لاوە سووک دەبێت، مرۆی بەساڵداچوو دەست بۆ ناموسی بنیادەم درێژ ناکات ئەگەر لە ویژدانیدا تۆسکاڵێک حورمەتی ناموسەکەی لا مابێت، بەڵکوو ستەمکاریش خۆماندوو ناکات بە ڕماندنی خانە و پڕکردنەوەی بیر و بڕینی درەخت ئەگەر ئەو شتانە لەبەر چاویدا لە ڕێکاری بێنرخی و بێئیعتیباریش نزمتر نەبووبێتەوە دەنا بە کوشتنی خاوەنەکەیان دڵی دادەمەزرا و ئەرکی پڕکردنەوە و بڕین و ڕماندنی لە کیسەدا دەمایەوە، تووەمز ئەو شتانە بوون بە «نرخی گڵاو» دەبێ لە ناوبچن.

بە کۆتایی گەیشتن لە وێنەی ئەو ستەمانەی سوودی مادییان پێوە نییە کارێکە لە توانا بەدەر، هی وەهاشیان تێدایە تا نەقەومێ خەیاڵ بۆی ناچێت. ژماردن و مومکین نەبوونی ژماردنی ئەو وێنە ستەمانە وەها ڕاناگەیەنێت جیهان یەکسەر خراپەیە، کە بمانەوێت وێنەی ئەوتۆیی چاکە و ناموس باس دەکەین وابزانین جیهان یەکسەر چاکەیە، بەڵام مەبەستم لە جووت کردنی وێنەی لەیەکتر جودا، پتر، هەموار کردنی ڕێی سەلماندنی ئەو قسەیە کە دەڵێم سەرچاوەی پەسەندکاری و دزێوکاری مرۆڤەکەیە و هەر هۆکارییەکی بهێنینەوە لە ڕێی «تناقض» و بەرژەوەند یاخود هەر فاکتەرێکی دیکەوە بێ بۆ ڕاڤەی ڕەفتار [ی مرۆ] هیچی نیشانە ناپێکێت ئەگەر مرۆ بە کارای یەکەم و لایەنەکانی دیکە لە موعادەلەدا بە کارتێکراو دانەنێت. تۆ ناتوانیت ئیشتیهای مرۆڤ ببزێویت بە خۆراکی بەهەشت ئەگەر نەخۆش یان بەڕۆژوو بوو یان مجێزی لە خۆراکی دیکە بوو یان لێی حەرام بوو، نازدارترین کیژی جوانیش دڵی نابزێوێت ئەگەر منداڵ بوو یان پیری ئیفتادە بوو یان زێدە بە تەقیە بوو یان ئیشتیهای نەبوو یان دەربەستی سلوکی ناموسکارانە بوو، هەروەها هەرچی دنەدەر

هەیە یەک بیانگرە دەبینیت هەمووی بێ تەئسیرە ئەگەر بابای دنەدراو حەزی لێ نەکردن. کە ئەمە دەڵێم هەرگیز گرنگیی دنەدەران و دنەکوژان نەفی ناکەم کە دەزانم جیهان بە دەوری مرۆڤەوە سێ جۆرە: یارو نەیار و بێلایەن. بەڵام یاری و نەیاریی شتان لە پلەی بەڵگەنەویسدا نین چونکە یار و نەیار و بێلایەن بە پێی چەژ و نەریت و یاسا و ئایین و بە پێی حاڵوبار و لە ساڵێکەوە بۆ ساڵێک دەگۆڕێن، هۆی گۆڕانیش گۆڕانی ئارەزۆی مرۆ یان حاڵەتی یان بۆلوانی دەبێ، ئنجا هەر گۆڕانێکی بەسەر بابەتی فرۆشەمەنیدا[27] بێت. لە لایەن فرەچەشنی و زۆری و کەمیی ئەو بابەتانە لە فرۆشگایاندا هەمووی کردەی مرۆیە تا ئەگەر لەواندا مجێز بزێوییەک هەبوو ئەویش هەر سازشی مرۆیە مەگەر لە حاڵوبارێکدا کە بە دەگمەن پێستی سمۆرە و گەزۆ و گۆشتی نەهەنگ و چشتی سروشتکرد لە خۆوە نایاب بن ئەوساش مرۆ ڕاوی دەکات وەیا کۆی دەکاتەوە و بە جۆرەها فەندی دنەدان خەریکی دەبێت.

نووسەر و بێژەر لە کۆن و نوێدا هەبوون پایەی تاکیان لە بنیاتی کۆمەڵدا دەبردە پایەی ئەندام لە لەشی زیندوودا، وێک چوواندنەکەش شاعیرانە و جوان و هاندەرە بۆ هاریکاری و بەرژەوەند تێک بەستن بەڵام جوداوازییەکی زل هەیە لە نێوان هەردوو حاڵدا چونکە کەرەستەکانی لەشی زیندوو لە سەرەتاوە تەرخان کراوە بۆ بەردەوامبوونی ژیان، زۆر بە ڕێکیی کۆمپیووتەرانە لە هاریکاریدان و ژیانی هەریەکەیان بەندە بە هی ئەوانی دیکەوە کەچی تاکی مرۆ لە نێوان تۆڕێکی گرێیاویی کۆمەڵایەتی دەخەبتێت کە پڕە لە هاریکاری و جوداوازی و شەڕەچەپۆڵک و جۆرەها سازشت کە هەرازان تاکی تێدا دەفۆتێت بێ ئەوەی بکێشێتەوە بۆ مەرگی تاکەکانی دیکە چونکە پێوەندی کۆمەڵاتی زۆرداوی پێبەستی مەعنەوی چاودێرانەی تێدایە دەشێ خۆلێدزینەوەی تێدا بکرێت یان ڕووکاری بگۆڕێت کەچی پێوەندی ئەندامانی لەش زیندەڵی[28] و جۆشخواردووە.

---

[27]- فرۆشەمەنی: بابەتێکی بۆ فرۆشتن داندراوە. سلعة.

[28]- زیندەڵ: عضوي.

حەقیقەتێکی گرنکی لایق بە تێبینیش ماوە بگوترێ: بایی پێوەندی سەلامەتیی تاک بە سەلامەتیی کۆمەڵەوە پلەی ژیاری[29] و پێشکەوتن خۆ دەنوێنێ و هەستی بەرپرسیاری و ڕێز لە یاسانان و شیرازە پارێزی دەزێتەوە بەوەشدا پێویستی بە خەفە کردن و چپاندنی کەسایەتی کەم دەبێتەوە. ناشێ لە بیر بکەین، خواروژووریی کۆمەڵگان لە لایەن ژیارییەوە دەچێتەوە بۆ خواروژووریی مرۆیەکانی نەک ساختمان و ڤەترینەکانی خۆ ئەو شتانە نەڕوان وەک گیا لە کناران دەڕوێ بەڵکوو بڵیمەتیی کەسانێکی تێهەڵکشیبوون لە زانست و هونەر و تەکنیک بە مەلۆتکە خستنیە کۆشی کۆمەڵەوە بەوەشدا ڕێکاری[30] شەقام و فێرگە و چێشتخانەکانیان بەرزکردەوە.

تۆ بێنە عیمارەتێکی کۆندیشندار لە هۆڕ دروست بکە و ببینە هۆڕنشینەکان چۆن سەریان لێی سوڕ دەمێنێ. خۆ خانە و مصنوعات مامۆستا نین خەڵک فێر بکەن چۆن ڕەفتار دەکەن و پێش دەکەون. ئەگەر سەرنج بگریت لە ڕەفتاری تاکانی سەربە ژیار و پێشکەوتنی نزم و بەرز، لە خەبەربوونیانەوە تا نووستنیان، حیرەت دەتگرێ کە چەند لێک جودا و فرەچەشن و دژ بە یەکترن: تاکێکی بگرە لە تەنبەڵی کوشندەیەوە و بڕۆ بەرەو نوێژ و ڕۆژوویەوە هەتا خنکانی لە سەما و مۆسیقا و فووتبۆڵی... مرۆ هەرگیز ئەو خەڵقەندەیە نییە لە کتێبان سەری پێدا دەگریت وەک بوونەوەرێکی پوورەهەنگ و شارەمێروو هەر خەریکی دانەوێڵە داکردن و شەمێ و هەنگوین تێکەڵ کردن بێت: مرۆ دروستکەر و ڕمێنەرە، چالاک و تەنبەڵە، پەرستگار[31] و بێخوایە، فریشتە و ئەهریمەنە... بە پانایی نێوان ئەمپەڕ و ئەوپەڕی پەسەندی و گەنین و دزێوی و جوانی بەسەر جۆرەهای جۆری خەریکبووندا دابەش دەبن. خۆ ئەگەر مرۆڤ خەڵقەندەیەکی بەرژەوەند ئاکار بوایە بە پێی پێوانەی بیردۆزی و فەلسەفانەوە کەس نەیدەزانی بە کام پلەی پێشکەوتن و پاشکەوتن دەگەییشت، جا ئەگەر بە دوا سوودی خولاسە کەوتبایە بە ناچاری دەبوو بە کۆمپیوتەری لە لایەن عەقڵەوە تێکەڵ بە جانەوەر [ی بەرز] لە لایەن غەریزەوە، ئیتر بیر بکەوە لە «کۆمپیوتەری غەریزەدار» ئایا پاش

[29]- ژیار: حضارة. ژیاری: حضاري.

[30]- ڕێکار: مستوی.

[31]- پەرستگار: عابد، زاهد. بڕوانە لاپەڕە 212 کتێبی «زاراوەسازیی پێوانە».

لێدارڕنینی ئەو پەراوێزە بەرینەی تەبیات و خووی بە دەوری مرۆڤایەتیەوەی بوو چی دەکرد چونکە دەورێکی زێدە گرنگی هەیە لە چارەنووس و ڕاڕەوی وەک تاکێکی دابڕاو لە کۆمەڵ تا تاکێکی بەند بە کۆمەڵەوە: تۆ داوێک لە داوەکانی ڕەفتاری مرۆ هەڵبگرە و با بڵێین داوی حەزی یاری یا مەیلی زایەند[32] یان ماددەویستی یان ژووانپارێزی، سەیروسەمەرە دەبینێت لە هەڵگرتنی ئەرکی ئەو خووەی چۆن گیانبازی بۆ دەکات و بە قەدەر توانا لێی خەرج دەکات. وەی چارەڕەش خۆی، ئەو کۆمەڵگەی دەسەڵاتدار بەهێزەکەی گیرۆدەی دنەیەکی هەڵەشە یان هەوەسێکی شێتانە یان حەزێکی گەمژەڵ بێت: مێژوو بۆمان دەگێڕێتەوە، یەک لە شاهەکان، لە پێناوی شتێکی لێی خۆش نەهاتبوو فەرمانی دا بە یەک لە بەردەستەکانی هێندە هەزار چاوی بنیادەمی بۆ بکۆڵێت، کە چاوەکانیان ژمارد دەرکەوت جووتە چاوێک لە مەبەست کەمترە، شا ئەمری کرد جووتە چاوی ئەو بەردەستە بکۆڵن لە بری نوقسانیەکە.

دەشێ تاکی عادەتی بگرین بە تاکێکی دەسەڵاتدار کە ئەویش بە پێی دەسەڵاتە کەمەکەی و لە گوێرەی گەمژەڵیی خۆیەوە، خۆی و خەڵکیش ببەتڵێنێ. ماوە تێبینییەکی لە لایەنی «هۆشکرانەوە و بەرژەوەندبینی»یەوە بکرێت: وەک ئاشکرایە سەرەتاکانی تەمەن هەتا پلەی گەنجایەتیی ژیر و بەبڕشت قۆناغێکە بەر لە پلەی هۆشیاری و بەرژەوەندبینییەوە بریتیە لە ساوایی و فەراقەیی و دەمڕووتی و دوور لە فکری بەرهەم و لێزیادکردن و قازانجەوەیە. بە دوا ئەودا قۆناغی گەنجایەتی دێت کە هێز و کارامەیی تێدا کۆ دەبێتەوە کە دەوری سی ساڵێک دەگرێتەوە ئیتر تەمەنی داهێزان دادێت کە پیتۆڵی لەگەڵدایە بەڵام لە ڕووی هێزەوە زۆر داشکاوە. لەمەوە دیارە تەمەنی «توانا و هۆشکرانەوە» ئەوەیە دەکەوێتە نێوان سەرەتای کاڵی و ئەنجامی پووانەوە. ئەویش بە مەرجێک، ئەو هێندە تەمەنە، گرێوگاڵ و هێڕی و کشتی تێدا نەبێت و مەزاق و وڕێنەی لێ سڕابێتەوە کە هیچ تەمەنێک لێیان ڕەها نییە.

تێبینییەکی دیکەش دێتە حیسابەوە لەوەدا کە ئافرەت لە زۆر وڵاتاندا دووری ئەو موعادەلانە دەژیا کە فەیلەسووف بڕیارە مێژوویەکانی لەسەر هەڵدەنێت. تا ئێستاش لە زۆر وڵاتدا حاڵی ئافرەت هەروەهایە ئنجا چۆناوچۆنی سەرجەمی کاران ڕاست

---

[32]– زایەند: جنس Sex.

هاتووە لەو دەرفەتە تەسکەدا کە هێز و پیتۆڵیی «پیاو» تێیدا دەگەنەوە یەکتر؟ وەرامی یەکەم و بەر لە هەموان ئەوەیە کە ئەو سەرجەمە هەرگیز ڕاست نەهاتووە بە پێی ئەوەی کە فەلسەفە چاوەڕوانە پیاو هەمیشە داڵدەی بەرژەوەندی گرتبێتە بەر: نە هەموو کەس بە داڵدەیکەوە چووە و نە هەموو پێوەچوونێکیش بەرژەوەند ئامێز بووە. لە ڕابوردووشدا کە کار بە جۆرێک لە جۆران ڕاست هاتووە لەوەوە بووە باری ژیان لە خۆوە، ڕۆژ بە ڕۆژ گلۆر بۆتەوە بێ ئەوەی ئاوڕ بداتەوە لە خەفەتی فەیلەسووفان کە ناچارن ژیان و گوزەران هەڵنێن لەسەر بەرژەوەندبینی و هۆشمەندایەتی هەر هەتا بتوانن هۆکاریەکی هۆشگرانەی لێ دارێژن بۆ ئەوەی ماجەرای مێژووی تێبهاوێژن جیهانەکەش لە خۆوە دەگەڕا بێ تەگبیری ڕێکوپێک، حکوومەتانیش چەرخیان دەسوڕاند بە پێی لێهاتوویی خۆیان بە داد بێت یان بە ستەم. خەڵکیش مامەڵەی لەگەڵ بوونەوەردا دەکرد بەو کەرستەی گوزەرانی کە هەیبوو، داب و نەریتیش بە دەم ڕۆژگارەوە دەچەسپا و خەتێکی دەکێشا تازە بابەت سەر هەڵدات یان خراپە وەهای کەڵەکە دەکرد تەمای گۆڕانێکی لێ بکرێت هەرچەند ڕاهاتن لەگەڵ حاڵوباری ناخۆش توانای ڕەت کردنەوەی کەم دەکاتەوە، فیتنە وەیا ڕاپەڕینێکیش لێرە لەوێ سەری هەڵدەدا لەبەر زێدە ستەمی سوڵتان یان بەهێزبوونی بابایەکی خۆش تەما یاخود کرانەوەی هەستێکی گشتی وەیا چینایەتی (لە حاڵوباری دەگمەندا) بە زوڵم و زۆر، فیتنە وەیا ڕاپەڕینیش، هەرچۆنێک بێت، دادەمرکایەوە یاخود دەسەڵاتی دەگرتە دەست بێ ئەوەی گوێ بداتە بیروڕای وەرزێر و کاسبکار و خەڵکی گەڕەک و ناگەڕەک.

ئنجا کە حاڵ ئەمە بوو مادده و بەرژەوەند نازانێ چۆن بسووڕێ تاکوو فەیلەسووفەکانی سەربە تەفسیری سوودگیری لێی ڕازی بن. ناشبێ بگوترێ خەریکبوونی سوڵتان و بەرهەڵستەکەی بە مەسڵحەتەوە لەوەی دەیکرد و نەیکرد، بە پیتۆڵی وەیا بە گەمژەڵی لە حەق و ناحەقدا بە خۆی و تەفسیری سوودپەرستییەوەی بدرێتەوە بە حیسابی ئاپۆرەی ئەو خەڵکەی ملی ڕاکێشا بۆ فیتنەکە چونکە ئیرادە لە بەیندا نەما جووتیار و گاڕەش و گاسن کە بە بەرژەوەندی دەسەڵاتدار کاریان دەکرد وەکوو یەکیان لێ دێت، لەوانەیشە دەسەڵاتدار پتر لە پەرۆشی گاڕەشدا بێت تا

جووتیارەکەی چونکە گاجووت بێ کڕینەوە کەلێنی پڕنابێتەوە کەچی بەکرێگیراوێکی تازە لە بری هی کۆن لە مەسرەف زیاد ناکات.

پەرۆش و خەفەتم بۆ سووربوونی فەیلەسووفان لە دانەوەی «هۆی ڕووداو» بۆ حاڵوبار و سوود و مادده، یەکەو هەل، لە نادروستیی فکرەکەوە دێت کە من هەموو دەم گوتوومە، نە حاڵوبار و نە بەرژەوەند و نە مادیات لە کۆمەڵایەتی و مێژوودا وجودی دەبێت بێ مرۆ، ئاساریشیان هەر ئەو ڕەنگە دەگرێ کە لە مامڵەتدا بە مرۆی مامەڵەچییەوەیە، نە شێلمی فاسق و نە پێڵاوی منافق هەیە تا ئەو دەمەی بەدایەتیی فرۆشیارەکەیان بە سوودگیری ناپەسەندەوە لە شێلم و پێڵاوەکە بەدەر دەداتەوە، هەرچی بەدایەتی هەیە لەو مامڵەتەدا هی فرۆشیارە، هەر بەو پێیە لە زۆر حاڵدا بەدایەتیی یاسا لەو کەسەوە دێت کە تەنفیزی دەکا، قانوونی بەدیش ئاوێنەی یاسا سازەکەیە، هەروەها خراپە لە قاتڵەوەیە نەک لە تفەنگ، لە ئاژێڕی هەڵەشەوەیە نەک لە گەڕۆک. حاڵوباری گەندەڵیش لە کۆمەڵدا بەچکەی خەڵقەکەیە هەرچەند هۆیەکیشی ستەمکارەکە بێت کە ئەویش مرۆیە کە مرۆی وەک خۆی بەکاردەهێنێ بۆ لێخوڕینی ئەو خەڵکەی سەریان بۆ دانەواندووە. کە دێین بێگرفت دەڵێین نەزانی هۆیەکی زلی دواکەوتوویيە لە بیر دەکەین نەزانی وەک دووپشک و گورگ نییە خۆی لێمان دانووساندبێ بەڵکوو بریتییە لە کەمزانی و کەمفامیی بەشەر، ناشکرێ مرۆ و نەزانیەکە لێک جودا بکەینەوە هەتا نەزانی سەربەخۆ بێت هەروەک بەفر و ساردی و ئاوی کوڵاو و گەرمی لێک جودا ناکرێتەوە ئیتر ڕێگە نییە بۆ چارەی نەزانی مەگەر خوێندن، ناپەسەندیش لە مامەڵەی شتومەکدا ناسڕێتەوە مەگەر بە پەروەردەی ئەهلی بازاڕ و زبڵوزاری کۆڵانانیش بنەبڕ ناکرێت مادەم خەڵقەکە چەپەڵ بن.

هیچ شتێک لە پێکهێنەرانی حاڵوبار و بەرژەوەند و ئەو دەوروبەرەی سووڕیان لە مرۆ داوە ناتوانێ لە خۆوە کاریگەر بێت. ڕەقایی بەردیش، دوور لە بەرد، ناتوانێ کاریگەر بێت. پێویستە مرۆ هەبێت و بەرد هەبێت هەتا حاڵوبار و بەرژەوەند و زەرفی سروشت بە ڕەقایی هەبێت و کاریگەر بێت بە چاک یان بە خراپ. قسەش لێرەدا لەگەڵ کۆمەڵە نەک سروشت بە ڕۆژ و با و بروسکەیەوە کە ئەمانە جودان لە مرۆ و ملکەچی دەستوورەکانیان و گەیشتنی مرۆ پێیانەوە دوای هەبوونیان دێت نەک

خەڵقیان دەکات، لوانی مرۆ لەگەڵیاندا و کەوی کردنیان و بێدەسەڵات وەستانی لە ئاستیاندا شتی بەشەرین، ئیشارەتیش بۆ ئەم لایەنە نەکراوە.

پەرۆشم پتر سەر دەکات لە هۆیەکی ترەوە کە هێندەی مێژوو و کۆمەڵایەتیی لێرە بە دواوە بیرۆزایە ئەو سووربوونە لە سەر هۆی ماددی - بەرژەوەندی و چی بە دوایدا دێت یان لە بەراییەوە هاتووە لە بەستنەوەی ڕووداو بە «تناقض»ەوە، زەرەرەکەی لەوەندەدا ناوەستێ کە ڕووداو دەدرێتەوە بە غەیری هۆی ڕاستینە، کە بەشەرە، بەڵکوو کاوێژ کردنەوەی ئەم هەڵەیەی وەها زل لە لایەن خەڵقەوە وەک ئەوەیە چۆرێکی بەردەوامی بەنگ لەگەڵ بژێودا بچێتە لەشەوە بێ ئەوەی هەستی پێ بکات ئیتر پێی پڕ دەبێت و قەناعەتی پێ دەهێنێت و بۆی دەکەوێتە هەڵپە و لە ئاخردا تەسلیمی دەبێ بە سەلماندنی نەتیجە ناچاریەکەی کە بریتییە لە بەخشینی گرنگی و یەکەمینایەتی بەوەی پێی گوترا بەرژەوەندی ماددی لە تەفسیری ڕەفتار و ڕووداودا تا ئاخروئۆخری لە بیری دەچێتەوە کە خالقی بەرژەوەند، مرۆڤ، لە پایەی ڕەوای خۆی نزم بۆوە بۆ تەپڵی بنی فەرامۆشی و بوو بەو ئەسپەی بە پاشەڵی عەرەبانەوە بەسترابێتەوە. تیژ کردنەوەی زەینی مرۆ بە فکرێکی تاکە فکر بە دەم زەمانەوە و بێ دەمەتەقە و ڕەخنە و بەرهەڵستی بەبەریەوە هەیە شەقڵی خۆی لێ چەسپ بکات و بۆ دڵخوازی خۆی ڕایبهێنیت و گوێ و چاوی لە ئاست غەیری خۆی ببەستێتەوە، ئەم بەدیهیەش بە قووڵایی مێژوو و بەرینایی کۆمەڵگان شایەدی هەن، وا لێرەدا تەجربەیەکی خۆمت بۆ دەهێنمەوە تۆیش لە تەجرەبەی خۆت وێنەی ئەوت هەیە.

وا ڕێک کەوت مێوان بووم لە ماقووڵێکی پژدەر، بابەکراغای سەلیماغا، و شەوێک لە شەوانی شوباتی 1940 لای مامەوە و لێمی پرسی چۆناوچۆنی ئیرادەی بەشەر بووز دەخوا لەگەڵ ئەوەی مەلاکان پێی دەڵێن «جوزئی ئیختیار» و بۆ دەبێ «کل» تابیع بە «جزأ» بێت؟ منیش وەرامێکم دایەوە[33] بە دڵیەوە نووسا، ئنجا پرسی: بۆچی ئەوانەی شتی تازەبابەت دەخوێنن لە خواپەرستی دوور دەکەونەوە؟ هەر خۆی بەدەم

[33]- وەرامەکەم ئەوەبوو کە گوتم: لێرەدا مەسەلە زۆر و کەمی نییە، خۆت دەبینی پاپۆڕێکی هێندەی کەرتە شارێک بە جڵەوێکی هێندەی بێژینگێک بە ملاو بەولادا دەسوڕێتەوە جوزئی ئیختیاریش هەمان کار دەکات.

پرسیارەکەوە کەوتە سەر شێوەی وەرام دانەوە و گوتی: وا گومان دەبەم سەبەب ئەوە بێ کە ڕووداوان دەدەنەوە بە تەبیعەت نەک «خالق» قسەکەشی ماوەی دەمەتەقەی نەهێشتەوە و لزوم بە وەرامی من نەما.

دەبینی تەعلیلی شتان بە سروشتی کەڕەوار لە جیاتی خالقی هەمەزانی هەمەتوان وەرگەڕانە لە شتێکەوە بۆ دژەکەی، بە هۆی کاویژ کردنەوەی و ڕاهاتن. خۆ لە هەزار ڕۆشنبیری کە لە خالقەوە بۆ سروشت پەڕیەوە تاکێکی نەهات لە ڕێی پەی بردن بە نهێنییەکانی جیهان و دەستوورەکانی گەڕانی و هۆیەکانی دەوامەی ئەو ڕووەی بە لای سروشتدا وەرگێڕێت و بینینێکی بێلایەنی لێ هەڵێنجێت کە دڵ ئارام بکات بە پەیدابوونی زیندوو لە مردوو و دەرکەوتنی هەست لە بێهەست گۆڕانی پێزانین لە غەریزەی بێمەبەستەوە بۆ هۆشی بیرکەرەوە. ئنجا ئەگەر لە سەرەتای گوماناویبوونی هۆی ئەوتوی بە دڵدا هاتبێت بەرە و تەعلیلێکی تازەی بێ کەلەبەری جیهانییەوە ببات خۆ دواتر ڕازی بوو بۆ سروشت دان بهێنێ بە توانای خەڵق و ئیبداعێکی ئەوتۆ کە لێی قورس دەهات بە پشکێکی کەمی ڕازی بێت بۆ خالق. من لە بارێکدا نیم پەندی بێخوا[34] بدەم، بگەڕێتەوە بۆ «باوەڕ» من ڕووناکی دەخەمە سەر کارێکی کە ئۆگر گرتن و گوتنەوە و کاویژ کردن بە ویژدانانی دەکات، نموونەش هێندە زۆرە لە هەموو مەیدانێکدا ڕابوردوو و ئێستاکە پڕدەکاتەوە.

ئەو خەڵکە دابەش بوون بەسەر هەزاران باوەڕدا لە ڕێی خووپێوەگرتن و بە کارهێنانەوە بوو تا دەبینی چەند باوەڕی لێکتر جودا بە جیرانەتی لە شارێکدا هەزاران ساڵ پێکەوە دەژین بێ ئەوەی یەکتر بگرنەوە هەرچەند بەشداری یەک بازاڕن مامەلەش بەیەک جۆرە بابەت جۆرە بابەت دەکەن، کەمیش وابووە ژن لەیەکتر بهێنن یان خۆراکی یەکتر بخۆن یان بچنە پەرستگەی یەکترەوە.

ئەو گوتەیەی هەمیشە دەڵێ بەرژەوەندی ماددی هەنگاو بە خەڵق هەڵدەهێنێت و ئاکار دادەڕێژێت و چارەنووس دەسەپێنێت، بێگومان دەکێشێتەوە بۆ سستبوونی ئیرادە و سەنگرانەوەی لە ڕاستکردنەوەی خوار و خێچی پێوانە و ڕێبازان کە بە چ ڕەفتاری فلان و تۆغیانی فستان شێواو و زەدەبوون چونکە تەسلیمبوون بۆ خواری و لاری و

[34]- بێخوا: ملحد، Atheist.

بێدادی ئاسان دەکەوێ لەبەر قەناعەتی پێشەکی بە زاڵبوونی حوکمی سوود و تەماع ئیتر خۆ تێهەڵقوتاندنی من و تۆ بۆ ڕاستکردنەوەی لەنگەر کە لە پەرەسەندنی ڕیشوەت و داهاتی حەرام خوار بۆتەوە دەبێتە قووتەقووت و دەرچوون لە ڕیز و لەمپەڕ لە خورگەی ئاوێکی باغەکانی واقیعی چەوتوچویڕ تەڕ دەکاتەوە.

خەباتگێڕ کە دەبینێ پێشڕۆ و فەرماندەرەکەی تەڵە و تەپکە دەنێتەوە بۆ هاوڕێیەکی خۆی کە چاوی بڕیبێتە پێشەوایی ئەو ڕەفتارەی بە لاوە دروستە بە پێی تەفسیری سەربە بەرژەوەند ئیتر ئەویش خەریکی تەڵە نانەوە دەبێ لەگەڵیدا. لە سەرەتاکانی تەمەندا دەمدیت بەپێی عادەت و نەریتی پێی ڕاهاتوو ئارەقخۆرەوە ڕێزی دەدۆڕاند چونکە ئارەق برەوی نەستاندبوو بەڵام بەرتیلخۆر و قاچاغچی و ڕێگر بە لای خەڵکەوە مرۆی ئاسایی بوون ئەگەر کیژی کەسێکیان داخوازی کردبایە لێیان مارە دەکردن، کە لە ئارەق ڕاهاتن ئارەقخۆریش لە هەموو ڕوویێکەوە پلەی ڕووەتی بەرز بۆوە بۆ ڕێکاری بەرتیلخۆر و ڕێگر.

هیچ عەیبوعارێک نەبوە بەدەم زەمانەوە لە ڕێی تەفسیری بەرژەوەندییەوە نەبووبێتە کارێکی ئاسایی. تەسلیمبوون بۆ فەرمانی «جوداوازیی بەرژەوەند» و قبوڵ کردنی بە دەستووری گشتی بۆ بزاوتنی هێزە کاریگەرەکانی کۆمەڵ وای لە خەباتگێرانی یەک بەرە کرد لەسەر خوێڕیترین سەبەبی بەرژەوەندی مل لە تەفرەقە و ملانێ بنێن یان شەڕە چەپۆڵک بکەن لە پێناو دەقی دروشمەکان تا ئەوەی گەلێک لە کەسانێکی هەڕەشەی فۆتانیان بە دواوە بوو هەستێکی ئەوتۆیان نەدەکرد بە پێویستبوونی ڕێککەوتن بۆ ڕزگاربوون لە مەرگ هۆیەکەش ئەوەبوو بە لایانەوە ڕێککەوتن دژی «تناقض»ـە، وەک بڵێی دژی بیروباوەڕە، خۆ«تناقض»ـیش بنەمایەکی پاک و پیرۆزی گۆڕانکارییە بەرەو ئەوپەڕی ئامانج لەم جیهانەدا ئیتر ڕێک نەکەوتن لەسەر پووچەڵترین شت بەس بوو بۆ مراندنی گەورەترین ئامانج.

من ناڵێم پەند و ئامۆژگاری و قسەی خۆشکەڵەی ئەوتۆیی خۆی لە خۆیدا بەس بێ بۆ گەیاندنی جیهان بە بەهەشت و وەها دەکا خەڵک سەرتوێ و ئاوریشم بکەنە دیاریی سڵاوی سبەینان کە ئەمە خۆی بێژەیەکی سافیلکەی ئەوتۆیە گیروگرفت بە ئاسانتر دادەنێ لە «کش مەلیک». من تا بڵێی دوورم لە هەڵوەستی پەندیاران وەک کە دوورم لە خەیاڵاتی خزموخوای «تناقض» کە باوەڕ دەکەن سڕینەوەی ماکی

«استغلال» هەموو گرفتێک دەڕەوێنێتەوە، چونکە ئەو بۆچوونە تەنک کردنەوەیەکی سەرسووڕێنی کۆمەڵایەتییە کە لە ماوەی هەزاران ساڵدا ڕوواوە و لکی هاویشتووە و ڕەگی داکوتاوە و فرەبابەت بووە بەقەدەر ژمارەی کۆمەڵگان کە دەردی بێدەرمانی لەگەڵدا ڕەخساوە چ پێوەندایەتیی نییە لەگەڵ «تناقض»ێک گۆیا لە چەوساندنەوەوە سەری هەڵداوە.

نەختێکیش وردبوونەوە لە شیرازەی کۆمەڵ و پێوەندییەکانی دەریدەخات کە دزێو کردنی ئەو پێوەندییانە لە ڕێی ناوزڕاندنیان بە شەقڵی چەوساندنەوە کە دەزانین کۆمەڵگە نەبوو ئاڵووێر و مامەلەی سەربە قازانجی تێدا نەبووبێت، ئا ئەم دزێو کردنە سەرەڕای ئەوەی بە زەبری کوتەک دەرد و دەرمان لەیەک شتدا تێک دەپەستێت، خۆی لە خۆیدا دەبێتە شیرن کردنی چارەسەری پیرۆزی ئەوتۆ کە نەشێ چڵکنیی مامەلەی تێکەڵ بێت تا دەگاتە چارەسەری پاکژی موتڵەق، بەوەشدا لە ڕێکاری ڕەخنە و ڕەفز و داوای گۆڕین هەڵدەکشێت و دەبێتە ئاینێکی قورستر لە ئەرکی دینە کۆنەکان بە خۆیان و ڕەسم نەریتەکانیانەوە، لە هەمان حاڵدا پتر لەو ڕێڕەوانەی بە ڕووکارێکی دیکەدا دەنۆڕن گاڵتە بە ئازادی و چالاکی لە قاڵبێکی تاک و پاکدا کە ڕێ بە غەیری خۆی نادات.

خوێنەر دڵنیا بێ لەوەدا کە من بە کەس خۆش نابم[35] و نامەوێ هەستی کەس بریندار بکەم بە بیروباوەڕم، چ مرۆیەکیش شک نابەم هێندەی من خۆشحڵەو بێ بەرەو ئازادییەکی لە مرۆ بوەشێتەوە بە مەرجێک کە بە دەستووری لێک پرسینەوە نەک بە قەمە و زمانبڕین سەپێندرا بێت. هاوچوونیش لە بنەڕەتەوە بەندە بە دیمۆکراسی کە ڕێز لە هەموو بیروڕایەک دەنێت و لە زۆرینە دەسەلمێنێت یاسا بسازێنێت و ماف بە خەڵک دەدات زۆرینەیەک بە یەکێکی دیکە بگۆڕێت، پاش ئەمەش دەڵێم و دەڵێمەوە من لە هەرە پەرۆشدارەکانم بۆ ڕۆژێکی ببینم هەوڵی گۆرباچێڤ لە خستنە سووڕی خوێنی وشک هەڵاتووی ناو دەمارەکانی میللەتەکەی سەرکەوتوو بێت، لە قووڵایی ویژدان و دڵ و ئاواتیمشەوە دەخوازم لە نوێ کردنەوە و فرەچەشن کردن بەردەوام بێ، ئەو دەستەش کۆتا بێ دەیەوێ لەمپەڕ بهاوێژیتە

---

[35]- پێخۆشبوون بە واتای «شماتە» دێت.

چەرخی عەرەبانەیەکی کە خەریکە بەرەو پێشیەوە ببات، ئەو دەستە ئەمەریکایی بێت یان ڕووسییەکی لە وڕێنەدا دەژیت.

لێرە بە پێشەوەش چەندەم ئاوات بوو خروچێڤ زاڵ بێت لە لەقاندنی وەشکەباوەڕی مەفتەنەکەی و قەڵاتی پێ چۆڵ بکات، بە داخەوە قەڵات لە ئەرزی دا. ئەمە دەڵێم نەک لەبەر ڕەشایی چاوی کەسانێک هەست بە وجودیشم ناکەن: ئەمە دەڵێم لەبەر بەزییم بە منداڵەکانم و هەموو ئەوانەی خۆشم دەوێن و چاکەیانم دەوی لە هاونیشتمانیەکانیم و هەرچی گەلی دنیا هەیە چونکە سەرلەبەریان نمکێشی ئەو جۆرە فکرە دەبن کە لە یەکەم زێدی سۆشیالزم زاڵ دەبێ.

چی دەیڵێم یەکجار[36] دوورە لە قووچەکی مژدەدەری بەسەرەوە هەڵدەنیشێت چ لە میحرابی پەرستگەکان و چ لە مەزرای فەلسەفان بێت، هێندەش ئاشکرایی و هێزی بەداهەتی پێوەیە دەیباتە ڕیزی سووڕانەوەی زەوی بە دەوری ڕۆژەوە، ئنجا هەر وەکوو دانهێنان بەو سووڕانەوەیە بایی گۆڕینی خوێندنەوە لە ڕاست بۆ چەپ ئەرکی دەوێت و بەرباری تەفسیری هەموو دیاردەکانی ئاسمان دەبێت بێ ئەوەی پێویست بهێڵێ بەو فەلەکانەی وجودیان نییە، دانەوەی کۆمەڵایەتی و مێژووش بە بەشەر خۆیەوە نەک بە جوداوازیی بەرژەوەند و چی لەو بابەتە کە هەمووی لە بەشەرەوە هەڵکولیوە، ئەویش شتێکی ئەوتۆییە [وەک سووڕانەوەی زەوی] چونکە دانهێنان بەوە ناچارت ناکات بکەویتە تەئویل لەو شتانەی بەژەوەند و مادده و «تناقض» تەفسیریان ناکات.

ئەمەش شتێکە بەدیهە دیسەلمێنێ و بەڵگەی بۆ دێتەوە لە هەرچی سەربە بەشەرە لە هەرە نزیکی تا هەرە دووری، لە گەشترینیان تا ڕۆچووترینیان لە بەدایەتی و تاریکی: ڕاڤەی بەشەر هیچ شتێک لەدەست نادات و پڕە لە فاکتەری تەعلیل هەر لە «تناقض»ی چاک و بەدەوە هەتا وڕێنەی دارستاننشین وێڕای ژیار و هونەر و زانست و کەینوبەینی کۆمەڵایەتی و ڕووداوی قەوماو و نەقەومای مێژوو تا ئەگەر بمانەوێ شتێک بدۆزینەوە لەوەی کۆمەڵایەتی و مێژووە و کاری تاکە و شەبەنگی خەو و نەخۆشییە، بەر تەفسیری بەشەری نەکەوێت، هەموو هەوڵێکمان بەفیڕۆ دەچێت چونکە هەر وەک تێنامێنیت لە تەفسیری هەر عەمەلیەتێکی کیمایی بێت کە ئاسنی

[36] – یەکجار ڕاستە نەک یەجگار.

تێدایە هەروەهاش مرۆ بە تێکڕای زیپک و حەز و سیفەتەکانیەوە بە زەرووری، دەبێتە ڕاڤەکەری هەر ڕووداوێک کە خۆی لایەنێکی بێت، لەوەشدا گرفت نییە ئاخو لە دەرووی ئابووری یاخود ئایین مەراق یاخود زایەند... یاخود و یاخود... ەوە تێکەڵ بە مامەلەکە بووە. ئەو فەرقەش لە نێوان مرۆ و ئاسندا دەمێنێت کە ئاسن بێ خوایشت بارتەقای هەموو ماددەیێکی مردوو، تێکەڵ بە عەمەلییەتەکەوە دەبێت، هەرچی مرۆیە تاکە فاکتەری ئیجابییە لەو مامەلەی لەگەڵ مردوو و زیندووی سروشتدا دەیکات.

مرۆ لە جیهانە کۆن و بەرتەسکەکە و جیهانی تازە و بەرینەکەیدا کە هەتا حدوودی «مطلق» لە بەرینتربووندایە، موعادعەلەی کۆمەڵایەتی ئەوتۆ هەڵدەنێت کە لە نوختەنیگای خواز و ئیرادەوە هەمیشە یەک لایەنە. ئەویش مرۆ خۆیەتی، هەرچی ئاسن و ترێ و نەهەنگ و ئەستیرەگەشەیە هەمووی بوونەوەر و بابەتی سادەن چ دەوریان لە خودی کۆمەڵایەتیدا نییە مەگەر ئەو دەورەی تەختەی ڕەش و کاغەز هەیانبێت لەو موعادەلەیەی لێیان دەنووسرێ.

ئەم قسە زێدە ڕوونە بە ئیلحاحەوە داوا دەکات، لە ڕاڤەی مێژوویی و کۆمەڵایەتیدا مرۆ دابندرێ لە جیاتی هۆی ماددی و بەرژەوەندی و «تناقض»ی کە هەمووشیان بەشێکی مرۆڤەکەن چونکە هەندێکن لە دیارخەری کاریگەرایەتیی سەرکەوتووی و تێشکاوی. ئنجا کە ئەمەت کرد شتێکت کردووە لە بابەتی سەربە مرۆڤەوە وەک ئەوەیە کۆپەرنیکۆس لە فەلەکناسیدا کردی بەوەدا کە سووڕانەوەی زەوی بووە ڕاڤەکەری بە دوا یەکتردا هاتنی شەو و ڕۆژ و چوار کژەی ساڵ و نەجووڵی ئەستێرەی قوتب، لە زیمنیشدا لاربوونی زەوی بەسەر خەتی سووڕگەیدا بایی 23.5 پلە و وردە حیسابی دیکەی هەست پێنەکراو کە ڕاڤەی قەناعەتبەخشی هەیە لەو سووڕانەوەیەدا.

ئەو قابیلیەتە جوداکەرەوەی مرۆیە لە زیندەوەری دیکە تێتدەگەیەنێ بۆچی زیندەوەر ئایینی نییە و نازانێ درۆ بکات و ناتوانێ نمایشت و فووتبۆڵ ڕێک بیەخێت، نە «تناقض» و نە بەرژەوەندیش دەتوانن لەو بووارەدا هیچ بڵێن. مرۆ ڕاڤەکەری جوداوازیی ڕەفتاری دووبرایانە نەک بەرژەوەند و «تناقض». مرۆ ڕاڤەی خۆ بەزل زانین و پەیدابوونی ئابووری و قوتبوونەوەی بانک و ڕێکوپێکی بازاڕ و یاساکانی ئاڵوگۆڕ

و داخوون کردن[37] و وەدەرنان[38] و قرغاندن[39] دەکات، ئنجا ئەگەر بەرژەوەند و «تناقض»ت دۆزیەوە لە هەندێ کاروباری مرۆڤدا ئەوانیش لە مرۆوە چرۆیان کردووە.

لە وانەیە بەرژەوەند بە کاکە وریاوە خۆڕاگریێت نەک بە ئاسو یان لە گاووری پەیدا بێت نەک لە هیندۆسی. لەمەوە لە هەموو چشتێکەوە بەدیهە داخوازی دەکات مرۆ هۆی ڕوودان و بزوێنەری مێژوو و کۆمەڵایەتی و تاک بێت بەرەو جوانتری وەیا دزێوتریەوە نەک شێلم و ڕادیۆ و چەرخوفەلەک بزوێن بن.

ئنجا کە ئەمە کرا و مرۆ شوێنە بەدیهیەکەی خۆی پڕکردەوە، باسی سوود و زەرەر و «تناقض» و ڕێکی و سەرکەوتن و هەڵاتن لە ئاست ڕاڤەی شتی سەربە مرۆڤ، چ تاکی چ کۆمەڵی چ مێژووی، وەک ئەوەیە شتێک لە چەند لاوە تیشکی بۆ هاتبێت و چەندین سێبەری لێ کەوتبێتەوە ئیتر سەیر نییە بزانین دز بە «بسم الله» وە پارێز ببات و تەوەکول بە خوای لێ بکێشێت یان بابای ئیشتراکی ملیۆنێر بێت یان موفلیس بە هارووونەڕەشیدا هەڵبلێت وەیا گەمژەڵێک خێرخواترین کەس بێت.

کە هەڵکشایت بۆ ڕامیاریی نێو دەوڵەتان و ئابووری جیهانی دەبینی شت سەر دەکەوێت و دادەبەزێت بە پێی تەرمۆمەتری بەشەری کە بریتیە لە مجێز و قەناعەتی خەڵکێکی کارگوزاری ئەو تەرزە شتانە، ئیتر لەوانەیە شریکانی ئیدارەی بەنکێک و وەزیران لە دەوڵەتێکدا پێک نەیەن کەچی بیروڕای سیاسیەکانی چەند دەوڵەتی نەگونجا و هاوچوون بێت.

کە ورد بیتەوە دەبینیت تاقانەیەتیی مرۆ لە ڕێنموونی و پێشەنگی وەنییە هەر بۆ غەیری مرۆ بێت بەڵکوو کارامەی پیتۆڵ لەوانەیە تاکە کاریگەری ئیجابی بێت لە نێوان خەڵکی سادە و کەمفامدا وەک کە شەعبەدەباز دەتوانێ ئیرادەی سافیلکان لە سیاسەت و غەیب و بەرژەوەندی ڕۆژانە بسڕێتەوە. لادێ لە زۆر کاروباریدا پشت بە

---

[37]- داخوون کردن: واردات.

[38]- وەدەرنان: صادرات.

[39]- قرغاندن: احتکار.

شار دەبەستێت و نەخۆشیش هانا بۆ لای پزیشک دەبات چونکە مرۆڤ خۆی لەلایەن کاریگەری و ئیرادەوە زۆر پلەی خواروژووری هەیە، لەمپەرِ بۆ ئەوپەڕی سیفەتەکانی.

دانانی مرۆ لە جێگەی شایان بە خۆی نیوەی ڕێگەی بەرەو چارەسەرکردنی تەنگوچەڵەمانەوە دەبرێت چونکە چارەکە نزیکتر دەبێ لە سەرچاوەی گیروگرفتەکە. مەودایەکی بەرین هەیە لە نێوان ڕاڤەکردنی ڕەفتار بە بژێو و لە نێوان پشکنینەوەی مرۆ خۆی بۆ دۆزینەوەی مەیلی تا بە پێی مەیلەکەی نانی نیشان دەیت یان بە مۆسیقا و سەقافەت و هەڵبژاردن[40] و ڕۆژنامەگەری بیخافڵێنیت.

لە هەموو بارێکدا جێگیربوونی مرۆ لە پلەی ڕەوای خۆیدا تاکە دەرگەی ئومێدە بۆ ڕزگاربوونی لە جینگەنەیی زۆردار و بەدایەتی دەسەڵاتدار و هەوەسی هەوەسباز چونکە یەکەم کۆتی کە ئیرادەی مرۆ کەلەپچە دەکات ئەوەیە کە نەزەریەباز و خۆفەلسەفێن و خۆسەپێن دەبنە وەکیلی خۆکرد لە جیاتی ئەو دەستنیشانی حەز و ئارەزووەکانی دەکات، وەک بڵێ مرۆ ساوایەکە لە خانەی منداڵی بەرمەمکان دایان شەربەتی عەقیدەی پێ دەنۆشێت و بە گوتەی فەلسەفەی دەپۆشێت و زەقنەبووتی فکری کاوێژکراوی دەرخوارد دەدات.

ئەگەر زۆر کوتانەوەی ڕۆڵی مادده و بەرژەوەند و «تناقض» جێگەیەکی وەهایان بۆ هەموار دەکات لە مێشکاندا کە شایەنی مرۆڤە، تۆ بڵێ مرۆڤ چ پایەیەکی بەرزی دەبێت ئەگەر بەردەوام ناوی بێت بە سیفەتی خالقی ماددەی سنعەتی و حاڵوباری لێکتر جودا و «تناقض»ی تیژ و نەرم و بیروباوەڕی لێکتر دوور و هاوسێ بشگوترێ مرۆڤ خۆی بەرپرسی بەرودوای چاکە و خراپەیە لە جیهانی خۆیدا؟ بوتێکی مردوو بە دەوامەی ناوهێنانی و بە گرنگ گرتنی پایەی پیرۆزی هەیبەتی لێ دەنیشێت... دوو پنۆک لە تەوێڵ و خەتێک لە لاجانگ و وەشمێک بە چەناگەوە ساحیر دەگەیەنێنە پایەی سەرۆکایەتی لە عەشیرەتدا ئیتر بۆچی هەوڵێک نەدرێ مرۆ چەسپ بکرێ «مەلیک» لەو لکەی خۆی و ببێتە خاوەن شان لە چی دەقەومێت لە چارچێوەی کۆمەڵگەکەی... بۆ دەبێ ئەو دەورەی پێ نەدرێت کە دەرێت بە کەلوپەلێکی خۆی دروستی دەکات و ئەو خاکەی خۆی دەیکێڵێت؟ بۆچی مرۆ بەرپرس نەبێ لە هەرێمی

---

[40] – هەڵبژاردن: انتخابات.

مرۆ؟ هیچ مەردایەتییک هەیە لە بیروڕای کەسێکی نازوفیزی لووت بەرز تەبریر بکا بەو هێزەی لە دەستیدایە؟ ئەدی چ بڵێین بەو هەزاران و ملیۆنانی ئاپۆرەی خەڵکی ژێر دەست کراو؟ تۆبڵێی بەرد بن؟ ئایا دیلی حاڵوبار و بەرژەوەند و چشتی ئەوتۆن؟ ئایە هێزی تاک و دەسەڵاتی، تەفسیر هەڵناگرێ لە ملکەچی زۆرینەی خەڵک بێ ئەوەی بەرژەوەند و «تناقض» دەخلی بووبیت ؟ کەی بەرژەوەندی خەڵک لە «ملکەچ کردن بۆ ستەمکار» دایە؟ بۆچی «تناقض» بەهانای زۆرینەی دژی کەمینە نایەت، خۆ دەبوو وەها بایە؟ ئایا مێژوویەکی خەڵک دروستی دەکات موئامەرەیان لێ دەکات؟ ئەدی بۆچی سویسرەیی کەنەفت نییە؟ ئایا دەبێ بڵێ «تطور» کەرامەت و ئازادیی سویسرەیی سەپاندووە؟ تۆبڵێی «تطور»ی سویسرە وەکوو گیای شاخ و گۆلەکان دەڕوێت و دەچێتە بەرگیانی خەڵکەوە؟ ئەگەر کابرایەکی خۆشتەما و تەماعکار ویستی بەسەر سویسرییانەوە خۆهەڵشەنگێنێت و ئەوانیش ملکەچیی خۆیانیان دایە داخوازیی حاڵوبار و بەرژەوەند، تو بڵێی «تطور» لە خۆوە بێ دەخلی سویسرییان ڕاسێتە لادانی تەماعکارەکە و ڕزگار کردنی خەڵک و گۆڕینی حاڵوبار؟ نە حاڵ و نە پێشکەوتن و نە پاشکەوتن بێ تۆ ئەی مرۆڤ بایی فلسێکن. شاعیری میسریش وابزانم خلیل مطران بەر لە شەست ساڵ گوتی:

لیس القری ولا الدمن
بوطن انت الوطن

نەگوند نەمەزرا نیشتمانن
تۆ نیشتمانیت!

جا ئەگەر دەرفەتێک بۆ تەماعکار ئیرادەی خەڵک زنجیر بکات، ئەدی بەرژەوەندی خەڵک ئەوە نییە نەیەڵن زنجیریان بکات و بیاندۆشێت؟ تۆبڵێی بەرژەوەند و زرووف و پێداویست بە هێزێکی غەیبی دەبنە پۆلیس و خەڵک ڕەشبگیر بکەن بۆ خزمەتی غەسبکەر؟ ئایا شتێک نەماوە بیڵێین لە تەعلیلی ئیرادەی غەسبکەر و ملکەچی غەسبلێکراو؟ ئایا فەیلەسووف زمانی لاڵ دەبێ ئەگەر لە موعادەلەی کپ کردن و ملکەچی و بەرژەوەند و زرووف، مرۆڤەکە لە شوێنی ڕاستینەی خۆیدا دابنێت؟ چ

وڕێنەیەکە لە فەیلەسووفەوە کە دەڵێ دەرەبەگ هێزی بە دەوری خۆیەوە نا و ملکەکەی فرەوان کرد و دەستی دایە ستەم و چەوساندنەوەی خەڵک پێشم ناڵێ بۆچی خەڵکەکە هێزی کۆ نەکردنەوە وەک ئەو دەرەبەگە مەلعوونە؟ لەوەتەی شەش هەزار ساڵەوە تاکە کەس هێز و ملکایەتی کۆ دەکاتەوە و هەزارن تاکیش چ کۆ ناکەنەوە خۆیانی پێ بپارێزن، لێشمان داوا دەکرێ ئەو حاڵە بەرەواژە تەفسیر بکەین بە بەرژەوەند و «تناقض» و چ بەڵای تریش هەبێ لە «مرۆڤ» یش خامۆش بین کە دەبێتە بەیدەقی شەترەنج و یاریکەر بە ئارەزۆی خۆی بیبزێوێت بێ ئەوەی بەڵگەیەکی قەناعەتبەخش هەبێ لەوەدا کە مرۆ بە هەزاران هەزار دەبێتە بەیدەق، دەبوو هانابردنە بەر بەرژەوەند و «تناقض» پێمان بڵێ کەمایەتییەکی خەڵک ڕووبەڕووی زۆرینەی خەڵک بوو سەبەب بە دژایەتی بەرژەوەند یان، بە پێی حوکمی داخوازیی سروشت هێزی هەزار ئیرادە، ئیرادەی بیست سی کەسی شێلاو خستنیە زبڵخانەی مێژووەوە.

منیش وەک تۆ دەزانم کۆمەڵگەی پاشکەوتوو بە ئاسایی ناکەوێتە چالاکی دژی ستەم، بەڵام دەشزانم ئەو شتەی وەها دەکات کە پاشکەوتوو ستەم بسەلمێنێت بە بڕیاری بەرژەوەند نەبووە کە بە گژ بەرژەوەندێکی دیکەدا چووبێتەوە دەنا دەبوو ستەمدیدە بە کەمترین ستەم هەڵایسێت چونکە ستەم دژ بەرژەوەندە. تا بشڵێی فەرق هەیە خەڵک بۆ بژێو بخەبتێت تا ئەوەی خەڵکەکە ڕیز بن لە بەرهەڵست کردنی ستەمدا چونکە هەوڵی بژێو کاری هەموو گیانلەبەرێکە، هێندەش سەرەتایی و ڕووکەشە و بێدەلالەتە دەورێکی نەبووە لە گۆڕانکاریی مێژوویی (خەریکم بڵێم لە گۆڕانی بایۆلۆجیش) خۆ من گوتم لە ماوەی پێنج هەزار ساڵدا بە هونەری کێڵان و دروێنە هەر هیچ پێش نەکەوتووە. لە بەرەکەتی شارستانیشەوە گاسنی گۆڕی بە تراکتۆر. جا ئەگەر خەریکبوون بە بژێوەوە گۆڕان دروست نەکات، بەولاتەریقەوە[41] یاخود لە ڕێی قیاسی

---

[41]- بەولاتەریقەوە: ئەم زاراوەیە کە لە «طریق الاولی» هاتووە بە سەر زمانی مەلایانەوە بوو لە کوردیدا دەیانکردە بەولاتەریقەوە. بە ئەسڵ «قیاس بطریقە الاولی، من باب اولی»یە کە بریتییە لە قیاسێک بەڵگەکەی بەهێزتر بێ لە قیاسی ڕاستۆکی (عادەتی) وەک ئەوەی کە قورئان دەفەرموێ لە ئاست باوک و دایکدا: «ولا تقل لهما اف، واتە وشەی «اوف»ی وەرِسبوونیان لە ڕوو مەدە، ئاشکرایە کە ناشێ دەستیان لێ بوەشێنێت لێرەدا حەرامبوونی دەستوەشاندنەکە بە

ڕاستۆکییەوە نابێ دژوەستان و یەکتر پواندنەوە لە هەوڵی بژێوخۆراندا گۆڕینێک پێک بهێنێت چونکە کێشە لەسەر وڵات و بەشەملّکایەتی چەنگەچڕەیەکە تاکە یەک پیت ناخانە سەر فەرهەنگی ژیاری، بە تەواوی وەک پشلە و کەمتیار لە چەنگەچڕەدا ناتوانن بەرەو چاکترییەوە بڕۆن. بە ڕوونییش دەزانین ئەو چەنگەچڕانە هەتا ئەو دواییانە بە سەرکەوتنی کەمایەتی دەبرایەوە، تا ئێستاش لە زۆر وڵاتاندا هەروەها دەبڕێتەوە. گۆڕانی مێژوویی تەفسیرێکی دیکەی هەیە پێوەندی بە «تناقض» و بژێو پەیدا کردن و گەرمبوونەوە و نووا و زایندەوە نییە کە لەواندا مرۆڤ و جانەوەری بێزمان دەگەنە یەکتر تا ئەگەر هۆی «تطور» بانایە دەبوو هەموو جانەوەرەکان بگەنە ڕێکاری مرۆڤ: بەدیهە بڕیار دەدات کە هۆی گۆڕان ئەوەیە تایبەت بە مرۆیە لە نێوان هەموو زیندەوەراندا، بەڵام باسی ئەوە نایەتە ناو جغزی پەرۆشەکانی ئەم نووسینەوە.

وەکوو تۆیش دەزانم چپێنەر[42] و غەسبکەر چالاکترە لە خێرەومەند سەبەبیش لەوەدایە، ئەو حەرامخۆرانە بە حەرامەکە دەوڵەمەندتر و بەهێزتر دەبن کەچی خێرەومەند لە حەڵاڵەکەی دەبەخشێ کە بینیشی بە بەخشندەییەوە نا دەڕووتێتەوە. من ئەمە دەزانم بەڵام ئەوەی ویژدانم پێی هەڵناگیرێت و حوکمەکەی ڕەفز دەکەم چەسپانی قەناعەتی ملیۆنەها پەککەوتەکراوانە کە ڕازیبوونیان بە مەغدووریيان هەڵوەستە چاک و پاکەکەیە و لە هەزاران ساڵدا، هەر بە پێی بەرژەوەندیش، جێگیرێکی نەبووە، واتە بەرژەوەندیان لە تێچوونی بەرژەوەندیان بووە و حورمەتیان لە بێحورمەتیدا بووە و سەلامەتیشیان لەوەدا بووە گەردەنیان بخەنە بەر چەقۆی قەساب. من ئەمە ڕەفز دەکەم بە یەقینی وەک 2=1+1 چونکە نهێنی کارەکە لە مرۆڤەکە خۆیدا، کە خۆی تەفسیری ستەمی خۆی دەکات کە لە حاڵی دەسەڵاتدا دەست بەسەر ماڵی غەیرەدا دەگرێت و دەشبێتە ستەملێکراو کاتێک چی هەیەتی لە دەستی دەردەهێنن و بە تەنهایی ناتوانێ لەسەخۆی بکاتەوە. بێحەیایی زاڵمیش لە دەربڕینی نیەتی خۆی وێنەیەکی وەرگەڕاوە حاڵی تێکڕای مەزڵوومان عەکس دەکاتەوە،

---

«قیاس من طریق الاولی»یە نەک هەر لە قیاسی عادەتی، لە نموونەدا دەڵێم: کە جنێودان حەرام بێ بەولاتەریقەوە کوشتن حەرامە.

[42]- چپێنەر: قاهر.

«تناقض»ـێکی بێئامانیش لە نێوان زاڵم و مەزڵووم دەردەیەخێت کە جووڵە بە مەزڵوومان ناکات لەبەر شەپڕەلێدراویی ئیرادەیان: قەت باوەڕ مەکە بەو قسەیەی خاوەن نەزەریە خێرەومەندەکان دەیجوونەوە لەوەدا کە «تناقض» بە درێژایی ڕۆژگار زۆرینەی هاڕدراوانی ورووژاندووە دژی کەمینەی ئیرادە خەسێنەکانیان چونکە ناچێتە عەقڵەوە لە ماوەی پێنج هەزار ساڵدا هەولی سەد خێزان بۆ خۆدەربازکردن لە زوڵمی تاقە خێزانێک نەزۆک بێت و کە دەزانین نیسبەتی ژمارەی مەزڵوومان لەگەڵ زاڵمان بە لای کەمەوە سەد بە یەک بووە.

ئەم سەلمێنەیەی تەسلیمبوون بۆ زۆردار لەبەر شەپڕەلێدراوی ئیرادەی خەڵک تا ئیمرۆکەش زیندووە و دەماری لە فرکەدایە لە زۆرینەی وڵاتاندا، پتریش ئازاربەخشە بە هاڕداوەکان سەبەب بە زۆربوونی هۆی پەکخستن و زاڵبوونی لای زۆرمەند و سستیی فراژیبوونی ئیرادەی لایەکەی تر، دەشبینین لە دەمی ئاژاوەدا تاقمی بێپەروا دەتوانێ سواری شانوملی خەڵکی گوند و شارەکان بێت و ملزەمیان بکات بۆ هەوەسەکەی کە دابین نابێت.

ئەمما ئەوەی دەگوترێ لە بەردەوامبوونی خەبات و نارەزایی دژیی ستەمکار بە درێژایی ڕۆژگار، وا من قسەی یەقینی تێدا دەکەم لەوەی دیتوومە و هەستم پێی کردووە: بە دەگمەن نەبێ فەلاحی نیشتمانەکەی کوردستانم تا پاش جەنگی دووەم جووڵەی نەکرد، کە کردیشی لە سەرینایی پەیدابوونی حیزبی سەربە خەباتی چینایەتی و زەنەی بیروباوەڕی ئەو حیزبانە بۆ چینە هەژارەکان لە نێوان کۆتایی جەنگ و سەرەتای پەنجاکاندا بوو.

ئەو جەڕومەنگەنەیەی سوور بە ستەمکار و ستەملێکراو دەدات ئیرادەی خۆپارێزییە نەک دۆڕانی بەرژەوەند، خۆ ئەو بەرژەوەندە ڕۆژگارەها بوو دۆڕابوو کەچی جووڵەی بە خەفەکراو نەکرد بەڵام کە ئیرادەکەی، بە جۆرێک لە جۆران و هۆیەک لە هۆیان، بە ئاگا هات دەستی دایە بێئۆقرەیی و نافەرمانی. چەندێکیش لەسەر دەستنیشان کردنی «هۆ» خیلافمان هەبێت، چ ڕێگەی خیلاف نەماوەتەوە لەسەر هێندێ کە بەرژەوەند سەدەها ساڵ نووست بەرلەوەی بە نووکە چەقۆی ئیرادە بۆ ملانێ بجووڵێت. ڕادیۆ لە ماوەیەکی کەمدا دەورێکی دیت لە بە ئاگاهێنان و جووڵاندنەوە داینەمیکیەتی «تناقض» لە سێ هەزار ساڵدا نەیکرد. لێرەشدا دەبێ بڵێم دیفاعێکی وەرزێر لە

کێڵگەکەی خۆی دەیکات فڕی بەسەر خەباتی چینایەتییەوە نییە بەڵکوو وێنەیەکە لە پەلەی ژیان ژووشکیش دەیکات: بەرگری کردنی فەلاح دژی غەسەبکەر و پاراستنی بەرخەکەی لە گورگ چ فەرقێکیان نییە کە دەزانین غەسبکەر گورگی دوو پێیە. خەباتی چینایەتی جموجموولێکی گشتییە لە چینێکەوە دژی چینێکی دیکە، هەر هەوڵێکی تاکە کەس لە ئاپۆرەی خەڵک دابڕا بێت نابێتە دیفاع لە چین یاخود لە نیشتمان تەنانەت لە گوند و گەڕەکیش.

شەپڕەلێدراوی ئیرادەی چێنراو لە ئاست چێنەر چاکتر ڕوون دەبێتەوە و واقیعیتریش خۆی دەنوێنێ کە دەبینین زۆرلێکراو لە خۆوەماڵی خۆی بە شەعبەدەباز دەبەخشێت و خزمەتی دەکات چونکە لەگەڵ شەعبەدەباز موفلیسترە تا لەگەڵ دەرەبەگدا، وێڕای ئەوەی کە ناچار نییە بەخشندە بێت لەگەڵ ڕیشێکی درێژ و تەسبیحێکی سەدویەک دانەیی.

قسە لە بارەی حاڵوبارێکی هەزاران ساڵەی بەسەر خەڵکدا دێت کۆتایی نایەت، کنەکردنیش لە تەفسیری هەر ڕووداوە بە هۆیەکەی کارێکی بە ئەرکە و گۆشەی جوداوازیی لەسەر ڕاڤەکردنیان دەم دەکاتەوە، من درێژەی پێ نادەم و بە کورتی دەڵێم: مرۆ خۆی هۆی ئەو ڕووداوانەیە، هەرچی بەرژەوەندە تەنها بایی ئەوەی پێوەندایەتیی بە ئیرادە و هۆش و خوازیەوە هەیە تێکەڵ بە تەعلیل دەبێت، بەرژەوەندیش وەک تووڕەیی لەسەر ڕیزشکان و نەرمونیانی بۆ دۆستایەتی و چاوەدێر کردنی ئەمەک و پەرۆش و بیروباوەڕ و چشتی ئەوتۆییە هیچیشیان ناچنە مەفهوومی بەرژەوەندەوە.

دەشێ دەوری بەرژەوەند لە قەپێلکی ئەم ڕێژەدا وێنەکێش بکەین: مرۆ شتێک دەکات کە بە لایەوە لە بەرژەوەنددا بێت، لەوانەیشە بەرژەوەندەکە ماددی یان ئیعتیباری یان وەهمی بێت ڕێژەکە هەموو ئیحتیمالان دەگرێتەوە هەر لە تەسلیمبوونەوە، پێبەپێ، هەتا دەگاتە شەڕ. مەودای نێوان ئەم قۆناغانەش پڕاوپڕە لە هەزاران هەزار جۆری هەڵوەست لە هەموانیشدا بەرژەوەند تێ خوێندراوەتەوە لەو ڕووەوە کە بەرژەوەند وەک هەر دنەدەرێک یان بەرهەڵستێک لە حاڵوباری هەموو جۆردا بە هەڵوەستی مرۆوە بەستراوەتەوە.

ئەو خەڵکەی حاڵیشیان یەکچوونە دەشێ ڕەفتاریان یەکچوون یاخود، کەموزۆر، لێکتر جودا بێت بە پێی جوداواریی تەبیات یاخود مجێز یاخود باوەڕیان: حەتمیبوون لە موعادەلەی سەربە مرۆ پەیدا نییە کە دەزانین مەخلووقێک نییە تاکەکانی هێندەی تاکەکانی مرۆ لە تەبیات و هەڵاوێر[43] و لە ڕەفتاردا لێکتر جودا بن چونکە تەرکیبی مرۆ لەچاو تەرکیبی جانەوەران هێندەی دوورایی و گۆشە و ناوەڕۆک تێداییە لە ژمران و چەندوچۆنی نایەت و بەربەریەوە هەیە هەموو ئەو شیمانانە بزێتەوە کە لە نێوان سادەیەتیی بەر لە پەنجاهەزار ساڵی و ژیاری ئێستاکەی گەشتی نێو ئەستێرانی دمەو شەبەقی سەدەی بیستویەکەمدا هەیە.

بەخێری خۆت ئەو قسە خۆشکەڵەی بەنگکێشانەی خاوەن قەڵەمان، بە نیازی چاکە یاخود ناچاکە، دەیلێنەوە لە بیر خۆتی ببەرەوە گۆیا «مرۆ هەرئەو مرۆیەیە لە هەر کوێیەک بێت» چونکە هەر لەو شتانەدا یەکچوونن کە زیندەوەری دیکەش تێیدا یەکچوونن. تۆ کە ورد بیبتەوە دەبینیت ئەو زیندەوەرانەی لەگەڵ مرۆ ئاشنا بوون ڕەنگ و قەڵافەتیان گۆڕا کەچی گورگ و چەقەڵ و پینگوین وەک خۆیان مانەوە، سەیری هەرە سەیریش لەوەدایە کە بە ڕەهایی قسە لە یەکچوونیی مرۆ بکرێت کەچی ئەرکی دوور و درێژیش لە شەرحی نیزاع و جەنگی نێوانیان دەکێشرێت.

دێمەوە و دەڵێم: باسی ڕابوردووی مرۆ درێژ دەکێشێت و زۆر لکان دەهاوێژێت و ڕەنگە تێیدا نەگەینە ڕۆژگاری سەردەم مەگەر بە ئەرکێکی زل. هەرچەند حاڵیبوون لە ڕابوردوو، وەک هەیە، دەشێ بە چاوی کرایەوە بۆ سەر واقیع و بە زەینی بەڵەد لە گیروگرفتەکانی تەسلیمی ئیستاکەمان بکات. بەڵام دیسانەوە باوەش پێداگرتنی لە زیمنی و تووێژێکی سەربە شتێکی دیکەوە تا بڵێی دژوارە، چاکتر ئەوەیە قسە تەرخان بکەین بۆ مرۆی ئەم ڕۆژگارە وەیا «باری ماددی» ئەم ڕۆژانە بە پێی ڕاوێژی چارەسەری ماددییەت کە بەشەر ڕاڤە دەکا بە بەرژەوەند و پێداوێستی حاڵ دوور لە بەشەرەکە خۆی، گوتم «دوور لە بەشەرەکە خۆی» سەبارەت بە مەفهوومی بێ تەئویلی واتای فەلسەفەی ماددی. چونکە کە ڕەفتاری مرۆت دایەوە بە بەرژەوەند و

---

[43] - هەڵاوێر: مزیة. ممیز. ئەم وشەیە وەکوو «توانا» بۆ ناوی واتا abstract و ناوی کارا subject دەڕوات.

حاڵوبار ئەو لایەنەت فەرامۆش کردووە کە بەرژەوەند و چی وەک ئەوە زەنە لە بەشەرەوە دەکات: سەرلەبەری باری کۆمەڵایەتی، چ سیاسی بێت و چ سەقافی و ئابووری و ویژدانی و شەیتانی هەموو جۆرە کەیف و کشتی و تەنگەتاوی تێکڕای هەر مرۆیە و ناشێ بە غەیری ئەو بدرێتەوە. من لاریم نییە لە قسەی کەسێکی بڵێ مرۆ دیلی حاڵوبارێکە خۆی دروستی کردووە وەک کە وڕێنەیەک بکات و بوتێکی بۆ دابڕێژێت یان دوژمنی زەنجیر بکات وەیا بە هێڕێیدا ببات یان ڕایبهێنێ... دێم و دەڵێم حازر نەبۆتە سەردەمی ڕابوردووی لە دەست دەرچوو، دەتوانین بێ چاوغەڵەتان و سەرسوڕکێ و ئارەزۆبازی مامەڵەی لەگەڵدا بکەین و هەستمان لێی بە پێی ڕاستینەی هۆیەکانیەوە بێت و چشتە بەد و چاکەکانی بە ناوی خۆیانیانەوە ناو بنێین.

تۆ سەیری، وا زاناکانی ئاتۆم و فەلەک بۆ قووڵایی ئاسمان بڕۆن کەچی فەیلەسووفەکانی سەربە بابەتی بەشەری نەگەییشتنە ئەوەی کە وەرزێر لە هەزاران ساڵدا چی ئەوتۆ بەرەوپێش نەچوو مەگەر چشتێکی لە شارستانەوەی وەرگرتبێت. فکرێکیش نەزا مەگەر کێهەی ڕۆچووە لە وڕێنە... ژیاری بۆرژوازی ڕەگی لە لادێ نییە بەو پێیە کشتوکاڵ و دەرەبەگەوە سەری هەڵنەداوە، کە مرۆڤیش پێش دەکەوێت هەر خۆی دەورووبەری بەرەو پێش دەبات نەک بە بەرەوپێشچوونی ئامرازێکی دروستیان دەکات چونکە ئەوانیش لە مرۆڤەکەوە کەوتوونەتەوە: بۆ ئەوە قەڵەم هەبێ دەبێ مرۆیەک هەبووبێ بیەوێ بنووسێ.

چەند سەیرە ڕەفتاری مرۆ بە ئابووری و بیروباوەڕ و قۆناغی مێژوویی و زەرفی کۆمەڵایەتی و ماددی تەفسیر بکرێ لە جیاتی ئەوەی ئەو شتانە بە مرۆ تەفسیر بکرێن. ناشێ زیممەت بە بەرتیل بکرێدرێت ئەگەر مرۆ زەرفێکی پێک نەهێنابێت بەرتیلی تێدا بە برەو بێت دەبێ پێشتریش بەرژەوەندێکی ئەفراندبێ بەرتیلی پێوە بدرێت و پارەشی دروست کردبێت نرخی کڕینی پێوە بێت و یاساشی دانابێت کە بەرتیلخۆر و بەرتیلدەر ناچار بن لێی فێڵ، بەستنەوەی ئیرادەی مرۆ بە دروست کراوە بەد و پەسەندەکانیەوە بە نیازی دۆزینەوەی ئەو دەستوورانەی ڕەفتاری ڕاڤە دەکەن دەبێتە دوور کەوتنەویەکی قووڵ و فرە لە ڕاستی ئەگەر لە ساختەوە نەبێ دەشبێتە گۆمڕاکردنێکی تاوانبار ئەگەر بە نیازەوە بێت.

بەڕاستی لە سەیر سەیرترە کە فەیلەسووف دوودڵی بکات لەوەدا بڵێ ڕەفتاری مرۆ لە تێکڕای ئەو هەڵاوێرانەوە هەڵدەقوڵێت کە لە زیندەوەرانی جودا دەکاتەوە بەڵام دوودڵی ناکات لەوەدا بڵێ ڕەفتاری جانەوەران لە غەریزەیانەوەیە... سەیرە ئەمما سەیر کە تەپڵ لێدانی دەمی مانگگیران بداتەوە بە تەئسیری دیاردەکە خۆی نەک بە هۆشی مرۆ کە دیاردەکە بە هەڵە ڕاڤە دەکات، خۆ هێندەی بەدیهیە ڕوونە کە جانەوەر هۆشێکی نییە بە سەهوو بچێت تا تەپڵ لێ بدات. تۆبڵێی دیاردەکە تووشی شەپڕەی نیولایی بووە کار لە زیندەوەر ناکات!

نیگایەک لە چاوی نیوەکرایەوە و هۆشێکی نیوە ئاگا بەسە بۆ تەفسیری ئەمە: هەرچی لە جیهان هەیە، دیار و نادیاری، تاکە مەخلووقێک بەرەو جوانکاری و بەرهەمهێنی و پەرستن و تەقدیس و لەعنەت و گاڵتە پێکردنەوە نابات ئەگەر بەولای غەریزەوە هۆشێکی هەڵکشاوتری نەبێت، شتان بە «تێکبەستنی هۆشەکی»[44] لێک گرێ بدات و موعادەلەی لەسەر هەڵستێنێت و ئاکامگری[45] لێوە بکات، چ بە ڕاست چ بە هەڵە، تەنها مرۆش لە نێوان هەموو گیانلەبەراندا هۆشی هەیە لە شتان بە سەهوو دەچێت و دەشیان پێکێت، بەرەو هیدایەتیەوە دەبات یاخود گومڕایی، چ ڕێگەش نییە بۆ قسەیەکی دیکە لەم بارەوە بگوترێت چونکە دژی بەدیهە و ڕوواڵەتی حاڵ دەردەچێت. کێشەکە ڕویەکی دیکەی ماوە گرینگتر لە دانهێنان بە «حقیقة» کە خۆی حەقیقەتە:

گوتمان ڕاهێنانی فکر بە باوەڕێک دەیکاتە ئاڵقەبەگۆش و سێبەری دوایەوە. ئەمیش شتێکی بەرهەستە.[46] و دەمەتەقە هەڵناگرێت کە هەر خۆی تەفسیری هەرای نێوان دوو برایان و خیانەتی ئەمانەت و خۆکوژی و هەموو شتێکی ژیرانە و گێلانەی جیهانی کۆمەڵایەتی دەکات کە غەریزە تێکەڵ بە هۆش دەبێت و هەزاران هەزار وێنەی گونجاو و نەگونجاو لە ڕەفتاری تاک و کۆمەڵ دەزێتەوە. منداڵ کە لە ساواییەوە ڕایدەهێنن بە پەرستنی بەرد و حورمەتی تەپاڵە دەچێتە سەر ڕاڕەوێک پشتەوگازە لە هەرچی کێشانە و پێوانەی هۆش و مەنتیقە.

---

[44]- «تێکبەستنی هۆشەکی»: ربط عقلي.

[45]- ئاکامگری: استنتاج.

[46]- بەرهەست: محسوس.

هەر بەو پێیەش کە گۆش دەدرێت بە یەکەمینایەتیی دەوری مادده و بەرژەوەند لە دارِشتنی رِەفتاری مرۆ خۆی بە کەم دەگرێ و مادده لە جێگەی خۆیدا دەکاتە بگێرِی جیهانی دەورییەوە. ئنجا چونکە مرۆ لەم رِۆژگارەدا دەوردراوە بە دروست کراو و شتومەکی مرۆڤکرد کە پێویستیەتی لە مردن و ژیندا و بە درێژایی ساڵ خەریکی پەیدا کردنیانە ئیتر بەخشینی یەکەمینایەتی بەو شتانە لە تەختەی کۆمەڵایەتیدا دەبێتە حورمەتی شتێک کە پرِاوپرِی دەوروبەریەتی خۆیشی و چارەنووسی پێیەوە بەندە، لەوەوە رِێزنان لەو شتە و پلەی تەئسیری لە قەناعەتیدا کەڵەکە دەکات و بە ئاسانی خۆی تەسلیمی ئاکامی ئەو قەناعەتە دەکات و دەستی شل دەبێ لە نرخی ئیرادە و مەیلی خۆی و زۆر بە ئاسانی حەپەسانی لە ئاست شکۆی فرِۆک و TV دەبێتە مانیع لەوەی بحەپەسێ بۆ هێزی ئیبداعی دروستکەری هەردوویان. مرۆ بەر لە پەنجاهەزار ساڵ بایی نیسبەتی 99% بە بوونەوەری سروشتی و ئابڵووقە درابوو کە هیچ دەخلی بەسەر هەبوونیانەوە نەبوو، لەوەشدا خۆشجڵەوبوونی بۆ هێزی سروشت و دانانی بە سەرچاوەی دەسەڵات لەو دیاردە سەرسوورِهێنانەی دەیدیتن، ئاکامێکی بەرچاو بوو، ئیتر سەیر نییە هانا بباتە بەر تۆتەم و تەڵیسم و قوربانی لە دەردەست کردنی رِەزامەندیی و رِەواندنەوەی غەزەبی.

بە دەم رِۆژگارەوە دروشمی حاڵ گۆرِا تا وابوو دەستکردەکانی مرۆ 99%ی دەوروبەری خەڵقی سەردەمی پرِ کردەوە، وێرِای ئەمە فێرگەی فکر و باوەرِ کە ئەرکی تەفسیری بوونەوەر دەکێشن و پێوەندایەتیی مرۆڤی پێوە رِاڤەدەکەن لە زیاد کردندا بوون و ئەو فەلسەفانەی مادده دەکەنە رِاڤەکەر بوون بە زێدە هێزی دەسەڵاتی مادده و دەوروبەر بەسەر ئیرادەی مرۆڤدا و زێدە بێفەرِی پایەی مرۆ خۆی لە موعادەلەی گوزەران و گۆرِانکاریدا. دوور نییە لە حەقیقەت بڵێین پایەی بەرژەوەندی ماددی لە عەقڵی کەسێکی بەرنامە زانستییەکان دەخوێنێ، سەرەرِای زل کردنی دەوری مادده، ئا ئەو پایەیە دەوری تۆتەمی ئەفسانەیی دەبینێت لەو واقیعە تەماوییەی کە لە تێکەڵبوونی دوو شتی دژ بە یەکتردا پەیدا بووە، واتە لە تێکەڵبوونی «علمانیة» لەگەڵ «مادیة»، چونکە باوەرِ بە زانست (علمانیة) تیشکێکی خولاسەی مرۆڤایەتییە و باوەرِ بە مادده (مادیة)ش مادده بە خوازانینێکی رِووتە، ئاکامی تێکەڵبوونیشیان ئەوە بوو تاکە کەسی دوو مەفهوومی ناجۆری لە تاکە شتێکەوە بۆ

پەیدا بێت، ئیتر وابوو کەسێکی ماددیی هۆشپەسەند لە لایەکەوە دەڵێ مرۆ خالقی چارەنووسی خۆیەتی کەچی لە لایەکی دیکەوە دەڵێ گۆڕانی هۆی بەرهەم دەکێشێتەوە بۆ گۆڕانی پێوەندایەتیی سەربە بەرهەم و لەوەدا وەها و وەها دەبێت لە مەیدانی گۆڕان و پێشکەوتندا. بەو پێیە لەسەرەتاوە مرۆ دەباتە خانەی تەقدیس، دوایی تەسلیم بە هۆی بەرهەم دەبێ لەوەشدا گوێ ناداتە هێندێ کە هۆی بەرهەم سنعەتێکی مرۆیە بە دەم ڕۆژگارێکی درێژ لە پێشکەوتنی بەشەرەوە پەیدا بوو.

ئنجا هەرچونکە هۆی بەرهەم تێک بەستن و کۆ کردنەوە و ڕێکخستنێکی مرۆیە و لە مێشکییەوە زاوەتەوە هەرگیزاو هەزاریەکی پەلکەزێڕینەی ڕێز لەو هۆیەی بەرهەم نەناوە. مادده و بەرژەوەند و دەستوورەکانیان کە بە بزوێنەری مێژوو دەژمێردرێن، کاتێک بوون بە جێگیری مرۆڤ لە هەڵنانی کۆمەڵ و دارشتنی چارەنووسی، دەبینین ڕێگە خۆش دەکەن بۆ ئەوانەی چاویان بڕیوەتە حوکم و دەسەڵات (کاتێک بوون بە حاکم) ناز و فیز بەسەر خەڵقدا بکەن بە ناوی مادده و بەرژەوەند و «تناقض»ـەوە و زمانی حاڵیشیان دەڵێ: ئێمە لە بەرەکەتی نەزەریە و بە هونەری تێگەیشتن و دروست لەکارهێنانی، خۆراک و پۆشاک و چی مومکینە لە گوێزەمەنی[47] و کەیف و سەرجەمی پێداویستییەکانی گوزەرانمان دەردەست کردن، دەسا پتر و پتر تێکۆشن و سپاسی ڕیژێمێک بکەن «أطعمكم من جوع»... تا کۆتایی ئەو چەشنە قسەی پڕووپووچ و تاوانباریش... خۆ خۆراک و نۆشەمەنی بە سەدەقە لە ئەنباری باب و باپیریان دەرنەچووە هەتا شوکرانەی لەسەر بژمێردرێت، هەرچی هەیە دەسکردی ئەو خەڵقەیە کە مێشکیان بە قسەی وەها گومڕاکەر پڕ دەکرێتەوە و کاریگەرایەتیی مسکێنان دەدزێتەوە بۆ مادده و بەرژەوەندی کەڕ و لاڵ تا دەماغیان پێ بشۆنەوە و باوەرهێنانیان بەخۆ بچێنن و پایەی نیمچە خوایان بەسەر عەرشی ناز و کەشوفش بچەسپێنن بەوەشدا «پاداش بە پێی بەرهەم» سەرەوبن دەبێت چونکە خاوەن نەزەریەکان و مەعلانەکانی لە بووزدان[48] کۆمەڵەی حەسایەوەن، گوتە دەبەخشن و ڕێنموونی بەرهەمهێنانێک دەکەن مڵکایەتییەکەی هی دەوڵەتە چ

---

[47]- گوێزەمەنی: مواصلات.

[48]- لە بووزدان: تخريج.

زەرەریکیش ناکەن لە هەڵە و وڕێنەیەکی تێکەڵ بە ڕێنموونیەکانیان ببێت کەوا بێگومان لە مل کەسانێک دەپێچرێن ڕەنجدیدەی بەرهەمن.

ئنجا کە شادی بە ڕەهایی لە گلەیی و بە حەسانەوەی پاداشی پتر و دەسەڵاتی تەسەلتر دابینیان دەکات ڕەنجدەریش دەتلێتەوە لە ماندووەتی و بەرپرسایەتی و بێئیرادەیی و پاداشی کەم، مافی مانگرتن و ڕازی نەبوونیشی نییە بە پێچەوانەی حاڵوبار لە جیهانی سەرمایەداری کە لە بیردۆزیی «تناقض»دا بە چەوساندنەوە و چپاندنی کرێکار هەڵدراوەتەوە، ئیتر هەر وەک پێشخستنی دەوری هۆی بەرهەم لە دەوری مرۆ کێشایەوە بۆ دابەزینی پایەی و لە دەستدانی مافی ئیختیار. هەروەها خاوەنایەتیی «سەرزارەکی»ی کۆمەڵ لە هۆی بەرهەم بووە بەهانەی سڕینەوەی مافی مانگرتن لە لە لیستەی مافەکاندا.

قسەیەکی زۆر سەیریش کە بە بەرینایی دنیا دەگوترێتەوە ئەوەیە گۆیا فلانە حیزبی فەرمانڕەوا لە فلانە وڵاتدا بۆ هێندە سەد ملیۆنە مرۆیە بژێو پەیدا دەکا وەک بڵێی ئەو ملیۆنانە هەموویان «تەنبەڵەکانی سوڵتان»ـن تێربەزگ لە سفرەی دیوەخانەی حیزب دەخۆن. دەوڵەتێکی وەکوو چین ملیارێک و سەد ملیۆن کەسی تێدایە، لە خاک و ئاو و مەعدەن و سەرچاوەی دیکەی سەروەت نیسبەتێکی پتر لە نیسبەتی سەروەتی تایوان (فەرمۆزە)ی هەیە کەچی تایوان لە ڕێکاری ئابووریدا چ بۆ تاک چ بۆ کۆمەڵ پێش چین کەوتۆتەوە. خۆ ئەگەر چین دابەش بکرێ بە 100 دەوڵەت گیروگرفتی زیاد دەکات چونکە ئیروویی ئابووریی[49] چینی پانوپۆڕ بەو کەرت و پەرت کردنە و هەڵبڕینەوەی پێوەندایەتیی نێوان کەلەشەکان، دەپووکێتەوە.

بەڵێ کۆمەڵگەی زل هەوڵی پتری دەوێ بۆ ڕێکخستنی کاروباری، بەڵام دیسانەوە ڕاستە بڵێین دانیشتووانی دەخەریکێن و بژێو بە ئارەقەی تەوێڵ پەیدا دەکەن، پانایی کۆمەڵگەشیان دەرفەتی بەرینتر بۆ پێشکەوتن دەڕەخسێنێ ئەگەرسەرچاوەی داهاتەکانی بە مەعلانی لە کاربێن، مەعلانیەکی ڕێک بێ لەگەڵ تەبیاتی مرۆ نەک لەگەڵ بیردۆزیی پیرۆز. تۆ ئەگەر لە تاکدا تاکایەتیت کوشت لە ڕێی ملکەچ کردنی بڵ فەرمانی هۆی بەرهەم و ئیبداعیت کوشت بە تواندنەوەی لە دەریایەک مرۆی

---

[49]- ئیروویی ئابووری: تكامل اقتصادی.

بۆئیرادە دەگەیتە ئەو موعادەلە سەختەی کە بریتییە لە بینی باڵی تەیر و پەڕاندنی قاچی هاموشۆکەر. بە دەوریشتەوە هەلهەلەی موژدەدەران بە نەهێشتنی چەوساندنەوە تێهەڵدەکات.

هەرچۆنێک بێت، نە بەرژەوەند و نە ئینساف و نە داد و نە ڕاستی هەیە لە پاشخستنی دەوری مرۆ بە دوا دەوری غەیری خۆی لە گۆڕانکاریدا، هەر دروستاندنێکیش[50] زەینی بلێمەتان پێی بپشکوێتەوە بۆ پەکخستنی ئیرادەی مرۆ بە نیازی سەردانەواندنی بۆ هۆی بەرهەم بریتییە لە چەسپاندنی زیللەتی زۆرینە و باغڵبوونی کەمینە. ئەگەر پەنجەت لە گوتەی «بە گۆڕانی هۆی بەرهەم پێوەندییەکانی بەرهەم دەگۆڕێن» گیر بوو و خستە ئەم قاڵبەوە «بە گۆڕانی مرۆ ئامراز و حاڵوبار و ڕێژیمی دەگۆڕێ» هەڕەمە سەرەوبنەکەت خستەوە سەر بنگەی خۆی و وڵاغت بردەوە بەرایی عەرەبانە و مافت دایەوە بە خاوەنی و پەندیارەکانی سوڵتانت خامۆش کرد کە سووربوون لەسەر نۆکەرایەتیی مرۆ بۆ ئالەت.

باوەڕهێنان بەماددیبوونی مەسنوعات تا ئەوەی ببێتە کاریگەر لە دارِشتنی مرۆ بێ تێخوێندنەوەی پێوەندیی نێوان دروستکەر و دروستکراو و بێ گوێدان بە ئیرادەی مرۆ و حەز و مەیلی لە ڕەفز و قبوڵی شتان وەک ئەوەیە، بە پێی ڕواڵەتی حاڵ، بگوترێ ڕۆژ بە دەوری زەویدا دەخولێتەوە، یەک لە ئەنجامەکانی ئەم گوتەیەش ئەوەیە زەوی مەرکەزی جیهان بێت و هەندێ ئەستێرەی کە بیست ملیار ساڵی تیشک لێی دوورن بە خێرایی ملیارەها جار پتر لە خێرایی تیشک دەخولێنەوە و چەندین ئەنجامی دیکەش لە فیزیا و فەلەک و ڕاستییەکانی بوونەوەر هەمووی دەپووچێنەوە.

گوتەی ماددیبوونی دروستکراوەکان و نۆکەرایەتیی مرۆ بۆیان، هێندەی کە گوتەی سووڕانەوەی ئاسمان ڕاستییەکانی جیهان سەرووبن دەکات، ئەویش هێندە کاریگەر دەبێت لە هەڵوەشاندن و دزێو کردنی کەسایەتیی مرۆ، گرینگترین تەئسیریشی لە مرۆدا ئەوەیە ئیرادەی خۆی دەدۆڕێنێت و ملکەچتر دەبێ بۆ فەرموودەی بیردۆزان لە بابەت تێکەولێکەی سەربە مەنتووجاتەوە. ساحیر و شەعبدەباز و غەیبخوێنەکان توانیان مێگەلی مرۆ بە دوا خۆیاندا ڕاکێشن بە نامەی دەسەڵات ڕاکشان بەسەر

[50]– دروستاندن: تبریر.

چارەنووسدا، ئەمەشیان بۆ لوا لە ڕێی دزینەوەی هۆشی خەڵک بێ ئەوەی ئەنباری خەفە کردن بەکاربهێنن کەچی ئیمڕۆکە فەیلەسووفێکی دەسەڵاتدار ئیرادەی خەڵک دەدزێتەوە بەوەدا کە پێشکەوتن و گوشادی و گۆڕانکاری دەداتەوە بە ئالەت و فرۆشەمەنی دەسەڵاتی خۆیشی بەسەر مەسنوعات شتومەکدا دەبەستێتەوە بە شەرعییەتی خۆسەپاندنی و بە واجیبی سەر کەچ کردن لە خەڵکەوە بۆی ئیتر لە ڕێنموونی و کارگوزاریدا بە پێی پێویست جارێکیان هونەری وشە و جارێکیشان هونەری قەمچی بەکاردەهێنێت.

چەندێکیش بیر دەکەمەوە لە چارەکردنی بەڵای قەمچی و زیللەتی سەر دانواندن هەر ئەوەم بە بیردا دێت کە هۆی بەرهەم لە عەرشە هەڵبەستراوەکەی دابەزێت و مرۆش دانیشێ لە جێگەی ئەو جێگەی هەرچی جێی مرۆی گرتۆتەوە لە تەفسیری مێژوو، بە چین و «تناقض» و حاڵوبار و داخوازیەکانیەوە، کە لە ڕێی فەلسەفەوە پێوەندایەتییان بە ئیرادە و وەعی مرۆوە هەڵبڕاوەتەوە.

پەنا بردنە بەرنمایشت و مانگرتن کاریگەر نابێ ئەگەر لە چارەچێوەی ڕێژیمێک نەبێ ڕێز لە ئیرادەی مرۆ دەنێت دەنا نمایشت بۆ بەرەی نمایشتکاران نارەوا و سەرکوت کردنیشی ڕەوا دەردەچێت بۆ فەیلەسووفێکی خۆی بە وەکیلی میللەت داناوە لە هەڵسووڕاندنی کاروبار لە ڕێی دەست داگرتنی بەسەر ئەو بژێو و هۆی بەرهەمەی لە دەقی نەزەریدا جڵەوەی مێژوویان گرتووە.

داڕنینی کاریگەرایەتی لە دروستکەری کەلوپەل و بەخشینی بە کەلوپەلەکە وەک ئەوەیە دەوری دکتۆر لە برینکاریدا پەک بیەخیت و هونەرەکەی شیفابەخشی نەخۆش بدەیتەوە بە ژووری برینکاری و تیشکی کارەبا و چەقۆ و مۆرفین، ئەوپەڕی فەرقیش لە نێوان هەردوو حاڵەتدا هەر ئەوەیە کە فەیلەسووفی خۆسەپێن ناتوانێ یاری بە ئامرازەکانی دکتۆر بکات، لەبەر نەزانین، بەڵام قوماش و هێلکە بە ئارەزۆی خۆی دەبەشێتەوە، بە فێڵی تەنگ کردنەوەی ئازادی و بڕیار لەسەر مزەی مانگانە و دیاری کردنی خانووش دەست بەسەر ئیرادەی دکتۆردا دەگرێت هەر بەو جۆرەش بەسەر خاوەن مەهارەت و ئەدەب و هونەر و بیریاری و دۆزینەوەدا زاڵ دەبێت.

سەیر نییە لە ڕێی دانانی ئالەت بە فەرمانڕەوا لەسەر مرۆ مزەی کرێکاری هەڕەمەکی زیاتر بکات لە هی دکتۆر هەرچونکە کرێکار نریکترە لە ئالەت. دکتۆر و ئەندازیار و تێکرای بیریارەکانیش ئەرکی سەربە ماسوولکە هەڵناگرن و بە لە کارهێنانی فکر و زیرەکی و ئەفراندن و ئیبداعەوە خەریک دەبن. بەڕاست بەرزکردنەوەی پایەی ئالەت بەسەر پایەی مرۆدا، لە ڕێی بەخشینی گۆڕانکاری بە ئالەت، زیادەی مزەی ئەرکی بێ مەهارەتی ماسوولکەی مسۆگەر کردووە چونکە ئالەتیش بەزۆری ئەرکێکی ماسوولکەیی بێفکرە بە ئەستۆوە دەگرێ.

ئنجا ئەگەر ئەرکی گێل لە ئالەتدا ڕێزدار بێت بۆچی لە مرۆدا ڕێزدار نەبێت، کە دروستکەری ئالەتەکەش پایەی بە دوا پایەی ئالەتدا بێت بۆچی نەخرێتە دوای پایەی خاوەن ئەرکی ماسوولکەییەوە! بە بەختم سوێند، هەڵاواردنی کرێکاری ڕەشۆکی بەسەر خاوەن ئیبداعانەوە هۆشمەندانەترین و «مەنتیقی»ـترین کارە لە بەستنەوەی کۆمەڵایەتی و مێژوو بە هۆی بەرهەمەوە نەک مرۆ.

من لەم دەمەمدا بەبەر تواناوەم نییە خۆ تەرخان بکەم بۆ پێشکەش کردنی جێگرێکی تەفسیری ماددی «تناقض»ی بەرژەوەندی لە قەوارەی بیردۆزییەکی سەرلەبەر دەست بدات یان بشێ بخرێتە گەڕ بەو سەبەبانەی بنەماکەیان هەڵناوە و بە دنەدەری بەرەوپێشچوونیەوە و بە هێمایەکی ڕووەو دوارۆژێک کە لە لێکدانەوەدا خۆ بە حەتمی یان لەگوین[51] یان موحتەمەل بنوێنێ، چی لێرەدا دەیڵێم بانگەوازێکە بۆ وازهێنان لە موژدەی دڕی و تێکدان و بنەکێش کردن بۆ سەر ڕێبازێکی بەرەو دوارۆژێکی گەش، تا ئەگەر بە یەکێکم گوت: برات مەکوژە، نابی تەنگەتاوم بکا بە داوا کردنی کارێک لە بری براکوشتنەکە دڵی خۆی پێ ڕاگیر بکات، ئەوەندەی بەسە باوەڕی براکوژی بەلاوە بنێت و خەریکی تەماشای هاموشۆکەران بێت... ئەستێران بژمێرێت... کراسە دڕاوەکەی بدوورێتەوە.

ئەم جیهانەی بە دەورمانەوە زۆر نموونەی وڵاتی ئەوتۆی تێدایە بەسەر پۆپەی ژیارییەوە، بەهێزترین وەسیلەی تێهەڵکێشان و تەسەلی و ئەمینی قوتار بون بوو لە بیردۆزە پیرۆزەکان و وازهێنان لە نەڕەنەڕی وێرانکاری و کوشتن و سوتاندن تا کەوتە

---

[51]- وشەی «لەگوین» بەرانبەر «مرجع» دێت. داڕشتنەکەی کۆنە وەکوو وشەی «لەبار».

سەر ڕەفتاری ئەوتۆوە کە نیهادی پاک و نییەتی چاک ڕەها لە چنگاڵی غەریزەی کوێر، پەسەندی دەکات. یەکێک لە گوتە عەجایبەکانی ئەو ڕۆشنبیرانەی بەگەڵ مەنتیقی مونافەسەی سەخت و خۆبەستنەوە بە هێزی ماسوولکە کەوتوون و ڕووبەڕووی دەکەنەوە ئەوەیە کە دەڵێن وڵاتە پێشکەوتووەکانیش بە قۆناغی توندوتیژی و کوشتوبڕیندا تێپەڕیوەتن و بە بازێک نەچوونەتە ناو بەهەشتی ئەمانەوە بێ سوورایی خوێن و تۆزی ملانێ، بەوەشدا وڕێنەکانی جیهانی دەیەمینمان لە بەرچاوی ئەو ڕۆشنبیرانەدا مەفهووم و دروست دەدیترێن و دەچنە خانەی بەداهەتی بێ دەمەتەقە.

چ موبالەغەی نییە کە دەڵێم: تەبریری ئەوتۆیی بۆ بەردەوامبوونی جیهانەکەمان لە شەڕەقۆچێ و یەکتر سەربڕین عەیارەیەکی نموونەییە لە گێلی و کەودەنی و هۆش سەکەتی چونکە مەنتیقی شێتیش ناسەلمێنێ بتوانین دەست لە گیا و گوڵ هەڵبگرین بۆ چارەی نەخۆشی و هانا ببەینە بەر ئەو جیهازە سیحرییانەی «پزیشکی» کە هەمووی تازە بابەتی ژیارین ئنجا ڕۆژگارەها بەسەر ببەین لە پێکوتەی نیزاعەکانی سەدە ناوەندییەکان هەر هەتا ئیسپات بکەین کە گۆڕانکاری بە بازێک مومکین نییە. ئێمە لە ماوەی مانگگێدا شوێنپێیان هەڵدەگرینەوە لە بەکارهێنانی سەنعەتە مرۆ حەپەسێنەکانیان ئیتر چۆناوچۆنی دەتوانین گێل گێل وەک مێرووڵە بڕۆین بەرەو ڕەفتاری ژیارییانەوە؟

براله! نگبەتیی جێوانەوەی ئەم جۆرە شێتییەی وەها پووچەڵ گەلێک بێڕەزاترە لەوەی بە خۆفریواندن لێی ڕەها بم و بڵێم: بڕیاری ناچارییە و زەروورەتە! ئاخر چۆن متمانەم بێت بەوەدا کە زەروورەت دەمانبا بۆ قبوڵ کردنی ڕادیۆ و ڕەفزی بەزەیی و داد و ئەمان لە تەجرەبەی ئەو میللەتە ژیارپەسەندانە؟ زەروورەت لە «ئاسانی»ی ڕادیۆ و «ئەستەمی»ی بەزەیی هەڵنەقووڵاوە: دڕندەیی ئەو گورگەیە خۆی لە ناخماندا حەشارداوە و فەلسەفە تیژی دەکاتەوە کە هەر فەلسەفەکە خۆی ڕەفزی بەزەیی و نەرمونیانی دەکات.

ئەوەی خەفەتیشم لەم بەڵایە تۆقێنەرەدا زیاد دەکات کە پێشەنگاکانی ڕۆشنبیری و خەباتگێڕەکان، نەک ئاپۆرەی نەزانان، وڕێنەی عوزری پووچەڵ دەجوێنەوە چونکە ئاپۆرەی خەڵک لە بنەڕەتەوە ئاگادار نییە چۆن و کەنگی هەڵستاوەکان قیت بوونەتەوە دانیشتووەکانیش گامەڵاس بوون. هەتا بە بەهانان خۆ بگنخێنێ و عوزری بێسەروپێ

هەڵبەستیٔ، ئنجا خەفەت چەند جاران زیاد دەکات کە لێم سوورە ڕاهاتن لە فرۆک بە چاولێکەری کارێکی قورسە چەندەها پرۆژە و مەشق و فەند و زانستیی گەرەکە کەچی خۆگیری کردنی برا و برادەر و هاونیشتمانییان لە یەکتر سەربرین هەر هیچی تێناچێت، ئەوەندەی بەسە دەست لە کوشتن ڕاگرن خەریکی چەنەچەن بن یان وەک «اهل الكهف» بچنە خەوەوە. ئەوساش ئاواتەکانی نیشتمانپەروەری و ئامانجەکانی سەربە چارەنووس سەلامەتتر دەبن تا دەمی بەئاگابوونیان بۆ زۆرە ملیٔ. ئەگەر شەڕی کوشندەی برایان و هاوبەشانی چارەنووس هەر بە فەلسەفەی وروووژێنی بەلگەبەندکراوی لە مەنتیقدراوی ڕێکخراوی بەرپا ببێت ئەوسا بانگهێشتنی تێکهەڵقژاوان بۆ ڕەحم کردن بە خۆیان و برایانیان و نیشتمانەکانیان تەنها یەک وەسیلەی گەرەکە بتوانیٔ ئەو فەلسەفانە لە مێشکیان بسرێتەوە، ئنجا وەسیلەکە شاڵڵا عەقلانی یان ئەفسوونانی یان شەعبەدەبازانی یان وڕێنانی دەبوو کەیفی خۆیەتی.

جا ئەگەر یەک لە بەهانەگران بەرهەڵست بوو بە نامەی خەسارەتێکی لە سڕینەوەی نەزەرییان پەیدا دەبیٔ دەڵێم: لە تۆڵەی نەزەرییەکان ئەوەندەمان بەسە گەل و نیشتمان بەسەر خەریتەی جیهانەوە لە ئەماندا بن، فاتیحەش بۆ ڕۆحی فەلسەفەی مردوو بە ڕیٔ بکەین پتری سێبووری تێدایە لەوەی بۆ ڕۆحی زیندووی مردوو بەڕیٔ بکریٔ.

هەروا بە دەم ڕچەی ئەو بابەتە قسانەوە دەڕۆین: ئەگەر بەدیلێک پێویست بیٔ بۆ ئەو بیردۆزییانەی دنەی ملانیٔ دەدەن بە نامەی ئەوەی خەڵک لە بەتاڵایی فکریدا ناژێت بەتایبەتی ئەوانەی فرچکیان بە هەڵسوکەوتی ئایدیۆلۆژییەوە گرتووە، بەش بە حاڵی گەلی وەک ئێمەمانان پلەی خۆڕزگار کردن (لە داگیرکەر) لە خۆوە بەرباری بیردۆزییەک دەبیٔ لە هەموان بەهێزتر و ئاشکراتر و پاکتر ئەویش بیردۆزی ئازادبوون و باوەڕی ئازادبوونە.

بۆ ئەوەی خەڵک لە دەسەڵاتی بێگانە ڕزگار بیٔ تاکە دینێک و تاکە فکرێک و تاکە بڕیارێکی بەسە ئەویش «ئیرادەی ڕزگاری» یە بیٔ پرینگاندنەوە و زرەنەخشاندن. ئیرادەی ڕزگاریش بێگومان «وەسیلەی ڕزگاری» دەخوازێت کە لە ڕووی زەرووڕەتەوە هەموو جودایی بیروڕا، و هەموو فرەسەرۆکایەتی و هەموو بەهانان بەلاوە

دەنێ مادەم ڕێگە دەرناکات بۆ ئەو ئامانجەی ئیرادەی ژیان دەیسەپێنێت کە هەر خۆی دایکی ئیرادەی ڕزگارییە.

هەرچی وەسیلەی ڕزگارییە، بەهێزترین و بڕندەترین و مسگۆگەرترین ڕێژەیەک بۆی «یەکیەتیی بیروڕا»یە لە پلەی یەکەم و دووەم و دەیەمدا ئنجا دەوری موژدەدان بە قەڵەم و بە زمان و بە فیشەک دێت، چونکە نە قەڵەم نە زمان نە فیشک شەرەفی «پاراستنی ژیان » و «ئیرادەی ڕزگار»ی وەرناگرێت ئەگەر لە دەرووی جوداوازیی بیروڕاوە دەرچێت. ئەوەی لێرەدا دەیڵێم چەند سادە و ئاشکرایە بۆ بەدیهەی مرۆ، ئەو فەلسەفە و فکرانەی لە قۆناغی ئازاد کردندا خەڵک بڕبڕ و کەرت کەرت دەکەن، چەپەڵییەکەی ئەوانیش هێندە سادە و ئاشکرا و بەدیهییە.

دوای ئازادکردنیش هەر بە چەپەڵی دەمێنێتەوە ئەگەر لەسەر ڕێبازی توندوتیژی مایەوە بۆ چارەکردنی موشکیلە. بەڵگەیەکی ڕاستبوونی تەئسیری ئۆگرگرتن بە جێوانەوەی فکر و بیروڕا ئەوەیە کە بارەها ڕەخنەم لێ گرتووە لەوەدا کە زوو بە زوو جوداوازیی گۆشەی نیگا سەربە کوشتن و بڕینەوە دەنێ چونکە هەر لایەنە نوختەی خیلاف دەجوێتەوە بەو جۆرەی حەق بە لای خۆیدا دەهێنێتەوە لایەنی دیکەش تاوانبار دەکات. ئەم جیهانە دواکەوتووەی خۆمان حاڵەتی وەها سەیروسەمەرەی هەیە کە لەوانەیە دوو گرووپی سیاسی لەسەر ناوڵێنان ڕێک نەکەوون، یەکیان «ئیشتیراکی دیمۆکرات» و ئەوی دیکەیان «دیمۆکراتی ئیشتیراکی» بێت، لە حاڵێکدا هەردوو گرووپ لەبەر یەک دوژمن هەڵدێن، ئنجا ئەگەر ڕێکەوت لە دەمی فیرار کردندا کۆی کردنەوە، پیتۆڵی سیاسی(!!) ڕووی سیلاحیان پێدەگۆڕێت لە دوژمنەوە بەرەو یەکتر بۆ چارەکردنی خیلافە بنەڕەتیەکەی ناولێنان چونکە شۆڕشگێڕ هەرگیز هەوڵی مێژوویی!! بۆ چارەکردنی «تناقض»!! لە دەست نادات.

ڕەنگە کەسی وەها هەبێت بڵێت، چ سوود هەیە لە بوغزاندنی خیلاف و براکوژ و چ دادمان دەدا خەریکی پووچاندنەوەی ئەو بیردۆزییانە بین کە چارەی گیروگرفت لە «نقض النقض» دا دەبینێ لە حاڵێکدا جیهانی کۆن و نوێ پڕ بووە لە خیلاف کێشە و ملانێ لەسەر بەرژەوەند بێ یان وەهم بێ و چۆن دەشێ چاوەڕوان بین لەوانەی خەریکی مەرگ و ژینن باوەڕ بە سوودی چارەکردنێک بێنن کە بریتی بێت لە پەندی

ئامۆژگارییەکانی یەکێکی وەکوو من کە پێیان دەڵێ: واز لە کوشتاری ناوخۆیی بهێنن هەمووتان هەڵەشەن!

چ عاقڵێک چاوەڕانە لەوانەی یەکتر دەبڕنەوە هەموو ئەو بەهانە و هۆیانە فەرامۆش بکەن کە گەیاندنیە گەورەترین تەهلوکە و گوێ بدەنە ڕێبوارێکی لە پەرستگەدا بە دەم وەنەوزی حەسانەوەوە نوشتووان دەنووسێ لە پەند و ڕێنموونی پاک و پیرۆز کە لە سەرەتای تێکهەڵقژان و یەکتر بڕینەوە و لێکتر ترازانەوە ڕەفزیان کردبوو؟

جیهانی فەلسەفە و بەرژەوەندی تێکهەڵقژاو حۆجەی نییە بە گوتەی شاعیرانەی ڕازاوەیەوە بە نییەتی چاک و هەستی مەردانە کە پێشتر هەرچی دەماری باوکەتی و دایکەتی و ڕۆڵەیەتی هەبوو تێیدا پووابۆوە و شیرازەی برایەتی و خزمایەتی و دۆستایەتی پسابوو، ویڕای ئیفلاسی شیرینایی کۆبوونەوە بە دەوری خوانی تەبایی پڕ لە خۆشترین خۆراک و نۆشەمەنی.

ئەو جۆرە قسەیەی لە خۆمی دەکەمەوە بەرهەڵست دیارە دەدا کە من بێئاگا نیم لە ماجەرای دنیا و لە ئەستەمیی داخوازیەکی بەدەم شریتەی و توێژەوە دەری دەبڕم. نەک ئەم و بەس: ئیمکان نییە بخزێمە قەڵاتی زۆرانبازی و مەیدانی شەڕ و هەرا بە خۆم و بلوێری شوانەکەی کە جبران خلیل جبران لێیەوە ختووکەی دەهێنایە هەستەدەماری خەواڵووان بە سترانە خەونبینەکەی جیهانی خەیاڵکردی:

أعطني الناي وغن فالغنا سر الحياة

بلوێرەکەم بدەرێ و بچرە، ستران نهێنی ژیانە

نە ستران نهێنی ژیانە و نە بلوێریش نەیژەن بە دەنکە توویەک دەگەیەنێ و نە کێچێکیش دەگێڕێتەوە لە پێستی بابەکی لەسەر خاک نووستووە، ئاخوئۆفی خۆیشی ناگەیەنێتە دەروازەی پاسەوانی قەڵاتی «تناقض» و زۆرانێ...

ڕاستییەکەی من هەرچی دەنووسم بە ڕەخنە لە ئایدیۆلۆژیی توندوتیژایەتی و بنەڕەتایەتی و فەلسەفەی ملانێی ڕیشەکێش لە هونەری بیتاقەی بانگهێشتنێکەوەیە

ڕێم پێ دەدات بە خۆم و بیروڕامەوە بچمە سەر سفرەی ئەو ماسوولکەبادراوانەی پڕ چەک و دەمارکشت بە پەڕگیری چونکە من بڕندەیی و توندی ڕەحمپسێنی و ئاشتینەویستی دەنرخێنم بەو مەنتیقەی کە ئەو هەلاکەتانە لە سەری هەڵچەقیوون لە ڕێی دۆزینەوەی هەڵەشەیی و خەلەل و زەرەریانەوە، هەنگاویش بە قەڵەمم هەڵدێنم لەبەر ڕۆشنایی ئەو نەتیجانەی ڕوویان داوە و چی دەشێ ڕوو بدەن تا ئەوپەڕی مەوداکانی توندوتیژی بە تەنیشت ئەو نەتیجانەی لە جیهانی پێشکەوتووی ژین و ژیاردا ڕوویان داوە کە هیچ تیژڕۆییەکی تێدا نەبووە، تاکە سەلمێنەیەکیشی[52] بەرز نەکردۆتەوە ڕێ دەرکات بۆ تاکە شەقامێکی چ لکی لێ نابنەوە: من لە هەرچی نووسیوەتم هانام نەبردۆتە بەر بیردۆزەییەکی حازر بەدەست بە خۆی و پێشەکیەکانی و بەڵگەکانیەوە ڕوو ببڕتەوە لەگەڵ چارەسەری بنەڕەتی و بۆچوونەکانی ماددی و خۆبەستنەوەی بە «تناقض»ەوە چونکە ئەمەم کردبایە لەوەم تێپەڕ نەدەکرد کە عەقیدەیەک بکوتمەوە پێشتر مەدرەسەی ماددی ڕەتی کردۆتەوە هەر وەک نامادی ڕەفزی ماددی کردووە، مەعلوومیشە من لە جێوانەوەی بیروڕای غەیر ناگەمە خاوەنەکەی لە دارشتن و قەشەنگی تەعبیر و پەی پێ بردنەوە.

مەدرەسەی ماددیش لە قسەمدا ناوی دێت چونکە بنەما و بەڵگە و شێوازەکانی لە دنیای کوڵان و هەڵچوون و چارەی بنەڕەتی و ڕیشەکێش کردندا برەویان ستاندووە منیش ڕێم بە خۆم دا تەعبیری «مادية» لە نووسینمدا ڕووپێوێکی لە خۆی بەرینتر بگرێتەوە لە جیهانی شەڕەدندوکێ و خەباتدا. ڕاستییەکەی من لە گۆشەی قەلەندەرانەی بێتوانای تەئسیر و تەغییرمەوە هەموو جۆرە توندی و پەڕگیری و گردەبڕایەتی و هەڵوەشاندنەوە و پوواندنەوە و چی کەمیش بێ لە پەکخستنی خەڵک دژی قەناعەتیانەوە تێکڕایان تاوانبار دەکەم.

ئنجا چ هەوڵێکی بۆ پەرەپێستاندنی مەزهەبێک لە سنووری، کوردی گوتەنی، حوسنوڕەزای خەڵک تێپەری کرد لە هەموو ڕوویەکەوە مەرفووزە. من پەڕگیرم و بنەڕەتیم و نەسەلمێنی چاوپێدا گێڕانەوەم لە مەسەلەی «دڵخواز- اختيار» چونکە چەندێکی لە تۆبزکاری بسەلمێندرێت دەکێشێتەوە بۆ زۆری، دەرگەی بەرەو تەئویلیش

---

[52]- سەلمێنە: مسلمات Axiom.

بۆ دنیادۆست دەکاتەوە چونکە لەبەر کەمتەرخەمی خەڵک لە ئاست مافەکانیان دڕەندەترین کەرستەی چپاندن، بێ تەئویل، بەکار دەهێنن چ جایی ئەوەی بەهانەیەکیان دەست بکەوێ. ئەو یاسایانەی زۆرینەی خەڵک پەسەندی دەکات بەسە بۆ جوداکردنەوەی ڕەوا و ناڕەوا.

لە ڕووی پاکییشیانەوە بەسە کە بلوێ لەلایەن زۆرینەی ئازادانەوە بگۆڕدرێن، بۆ ئێمەش بەڵگە لەسەر دروستیی ئەو حاڵە بەسە کە دەبینین جیهان ئارامە و داد لە برەودایە و پێشکەوتن بەردەوامە لە هەر وڵاتێکی پێڕەوی لە ئازادیی بیرو باوەڕ و لەعنەت لە زۆرکاری دەکات.

بەهەمەحاڵ وەرامی من بۆ کەسێکی لە پایەی ئەو قسانەم دادەلەنگێنێ کە لە قەڵەمی مرۆیەک دەچۆڕێتەوە قەڵەمی هەڵاواردوە بەسەر تیغ و پەتدا، کە دەڵێم: ئەوا چاوم پۆشی لە هەرچی شیاوی و نرخ و گرنگی هەبێت لەو بەڵگانەی گوتم و دەیڵێم بە پاڵپشت لە گۆشەنیگام، وا خۆم و پەرۆشم و خەریکبوونم خستە بەختی ئەو هێندە ئینسافەی وەک خلتە لە قووڵایی ویژدانادا مابێت لەوەدا کە من نەموێراوە ئازادیی تەعبیر بەکاربهێنم بایی هەزار یەکی ئەوە بکات کە ئاپۆرەکوژی بێگوناحان و تێکدەری شار و دێ و کێڵگان بە مجێزەوە و ڕێگری ماڵ و گیان و ناموس بە فەخرەوە دەیکەن لە ژێر دروشمی ئەوتۆ بە شکۆوە دەدرەوشێتەوە و بە نامەی پاکی و پیرۆزییەوە هەڕەشە لە هەموو مرۆیەک دەکات کە لێو بە ڕەخنە ببزێوێ.

قسەی خۆمان بێ: لە کۆنەوە وەها عادەت بووە. هەژارێک تەبیاتی دەسەڵاتدارێکی لێڵ کردبێت پاداشەکەی لە خەڵکەوە بەدمدا هاتنەوە و تێڕاخوڕین و بەهەڵە دەرچواندن بووە چونکە خەڵقەکە ڕاهاتووی ناز ڕاگرتنی مرۆی دەسەڵاتداری ستەمکار بوون کە ئاکامی یەکەمی ئەم عادەتە گاڵتە کردن بوو بە گەدایەکی پێ لە بەڕەی خۆی پتر ڕاکێشێت، ئا ئەو گاڵتە و تیز پێکردنە ڕوویەکی مەیلەو شرایەوەی پڕ لە مەرایی و هەلپەرستی پێوە بووە و هەیە بەوەدا کە تیز کردووەکان خۆیان دەپەڕێننەوە لە خامۆشبوونیان بەرانبەر زوڵمەکە، لەگەڵ ئەو پاکانەیش هەستێکی نێرەمووکانەی لە

خۆڕازیبوون دڵیان دەداتەوە: وا لێرەدا سێ کەتنی[53] زل لە ناوتوێژی هەڵوەستێکی مەینەتاوی سەربە جەرگەی کۆمەڵایەتیمان پەیدایە:

- کەتنی یەکەم تاوانبار کردنی مەردایەتیەکی بەخشندە.
- کەتنی دووەم، پیرۆزبایی لە باغڵبوونی زاڵم ڕووبەڕووی کۆمەڵەی ورەبەرداوان.
- کەتنی سێیەم پاکانەیەکی ساختەکارانەی گەل بە بەهانەیەک کە پیرۆزبایی زاڵم تێکەڵ بە شکاندنەوەی مەردێکی ستەم نەسەلمێن دەکات.

من نەهاتم ئەو جۆرە سەرشکێنییە بەکاربهێنم ئەگەر بمدیتبایە گەدایەک بابی دەیەکی سەلماندنی زوڵمی زاڵم چاوپۆشی کردبایە لە گەدایەکی دیکەیان هەر نەبایە گەدای سەرشکێن نەکردایە لە بەدەمداچوونەوەی ئاست زۆردار خۆ ئەمەش پێی دەڵێن «اضعف من اضعف الایمان – ئیمانی زەعیفتر لە زرەئیمان».

من دیتومە گەدا بینە قاقەی گەدای گرتووە تا سنووری هەلاکەت، چ بە کوژەری و چ بە کوژراوی بێت، دیتووشمە تا ڕادەی زیللەت دەستەو نەزەری زاڵم ڕاوەستاوە، خۆ ئەگەر نەختێکی دڕایەتی گل دابایەوە لە ئاست گەدا و هەندێکیشی سەرشۆڕی کەم کردبایەوە لە ئاست زۆردار لەنگەری تەرازووی گوزەرانی دانەدەلەنگا. بەڵام ئۆگر گرتنە بە عادەت کە بەرەو هەڵوەستی بێلزومیەوە دەبات.

قورئان، بێقسوور، گلەیی لە پێغەمبەر کرد کە ڕووگرژ بوو لە کوێرێکی وەڕسی کرد بە پرسیاران لە حاڵێکدا پێغەمبەر خەریکی شتی گرنگتر بوو ئیتر ئایەت ڕیزیان بەست لە «عبس وتولى أن جاءه الأعمى» تا گەیشتە ئەوپەڕی گلەیی لە «أما من استغنى فأنت له تصدى» ئیتر بۆ دەبێ حاڵ بەرەواژ بێتەوە دوای سێزدە سەدە لە بەرەوپێشچوونی زانستی بەوەدا هەژار گلەیی لێ بکرێت هەر چونکە یەک لە نیوەخوایەکانی نەختێک سەغڵەت کردبێت؟ من ئەگەر پەرۆشێکی نەزۆک دەخۆم لەو گلەییەی خەڵک لە هەژاری دەکات، خۆ ئەو گلەییکارانە یەک بە یەک پەشیمان دەبنەوە لەو

---

[53] – کەتن: جنایە.

خۆگنخاندنەی ئاست تاوانبار کردنی ستەمکار و تەنبەڵی کردن لە یاریدەی کەسێکی لێی ڕاسا بێت هیچیان ڕزگار نابن «لە ڕۆژێکی ستەمکاری باغڵ دەرگەی لێ دەدات و ددانی لێ جیڕ دەکاتەوە و لە هەقوحسێبی دەپێچێتەوە بە پێی یاسایەکی دارستاننشینان، ئەوساش پەشیمانی و بابەڕۆ داد نادات»[54].

لێرەدا قسەم بەسەر هەموو لایەکدا ڕاکشا کە بە ئەسڵ ڕووی لە کوماندەی پێشەنگان و تێکرای خەباتگێڕان بوو کە خۆیان هەڵگری مەشقەڵی شۆڕش و چەکوچی شۆڕشی عەکسین و نامزەدی یەکەمن بۆ هاڕین و کوتان لە ئاشی تەفسیری بەرژەوەندی ماددی «تناقض»ی چونکە ڕکەباریی ناوخۆیی ڕێکخراوی خەباتکەران، بە پانایی جیهان، بە حوکمی فەلسەفەیەکی دەیبزێوێت و دواکەوتنێکی لەو وڵاتانەدا هەیە، چالاکیەکی بە برەو و بەردەوامە تا ئەگەر لێک خشان و پێک کەوتنەوەی خەڵکی لە یەکتر دوور مومکین نەبێ خۆ لە نێوان خزمان ناچارییە: سەیروسەمەرەش لە تەجرەبەی کەسانێکی نۆرەی لەناوبردنیان دەگاتێ، لەو تێکۆشەرانەی جیهانی سێیەم، حەفتەم، دەیەممان ئەوەیە کە هەرگیز بە بیریاندا نەهاتووە پەتێکی بە دەستیانەوەیە لە ملی خۆیان بئاڵێت، تا ئەگەر «بلغت التراقي»[55] هەرچی فەلسەفە و ئایدیۆلۆژیا هەیە بە خۆیان و چارەی بنەڕەتییانەوە دەپوێنەوە و دەبنە پنۆکێکی ڕەش کە خەست بۆتەوە لە تاریکایی خۆ فریواندن بە نیعمەت و خۆشیی خۆیان و هەڕەشە کردن لە غەیر.

کەسێکی بە درێژایی عومر لە ڕێی شانازی کردن بە عیلمانیەت و چارەنووسایەتی خۆی فش هەڵێناوە بەسەر خەڵکدا کاتێ دەگاتە ڕۆخی مەرگ دەبێتە قەپووچکەیەک بە نووکی دەرزی دەفشێتەوە: لەو دەمە تەنگەتاوە خەفەکەرەدا یارمەتیدەرێکی بۆ

---

[54]– «لە ڕۆژێکی ستەمکاری باغڵ دەرگەی...» ئەو دوو دێڕەی نێوان کەوانە تەرجەمەی تەعبیرێکە هەر لەو زمانە خۆشە کە بۆی بووە بە قاڵب، وا لێرەدا بە دەقی خۆی ڕایدەگوێزم «فليس واحد منهم بناج من يوم يطرق فيه المنجبر بابه ويكشر له فانه ويطلبه حساب بشريعة من شرائع الغابة ولا ساعة مقدم والنواح من مأتم».

[55]– «بلغت التراقي»: بەشێکی ئایەتێکی قورئان لە باسی ڕوح کێشاندا «إذا بلغت التراقي وقيل من راق وظن أنه الفراق».

خۆگیری نییە مەگەر بە گەڕانەوەی بۆ لای بەزەیی و میهرەبانی کە بە درێژایی ڕۆژگار ڕەفزی کردووە.

ئایا یەک دوو دەقیقەی بەر لە مەرگی بەشی ئەوە دەکات کە عومرێکی بەسەری برد لە ئیمان هێنان بە سووتاندن و خنکاندن و هاڕین بپێچێتەوە لە جێی ئەودا ترنجۆکێکی موژدەی سەلام و گەشایی ڕابیەخێت هەتا گیانی یان هێزی ژیانی گاگۆڵەی بەسەردا بکات بەرەو گەشتی بەسەرچوون و بڕانەوە؟ وا مەزانن ئەم گوتەیەم نەخشێکە بە پەراوێزی گەشتنامەی ژیانەوە و ناچێتە نێرتکی ئەو هەرایانەی لە مێژوودا گەمەیان پێ دێت، خۆ ئەو خەباتگێڕانەی نەعرەتەی پاڵەوانی و داستانی شاڵاوبردنیش لێدەدەن لە کەرتوپەرت کردن بەولاوە هەر وشەیان پێشکەش کردووین، هیچ کامێکیان یەک خشتی لەسەر قوڕی دیواری وێرانترین زنج دانەناوە، هەرچی فەرموویانە لەسەر سەکۆی دەسەڵاتەوە بە ئەمر و نەهی خەڵکیان ناچار کردووە بە کردن و نەکردن، من و یەکێکی دیکەش بارتەقای ئەوانین کە کووتاڵی وشە پێشکەش بە ئاپۆرەی خەڵک دەکەین فەرقێکیش هەبێ لە نێوان هەردوو کوتاڵدا وەک فەرقی نێوان شیرینی مۆسیقا و گرمەی تۆپە.

ئەگەر مۆسیقای ئێمەمانان بۆی نەلوابێ موژدەکانی خۆی بچڕێت تا بزاندرێ چ خەرمانێکی لێ دەکەوێتەوە خۆ چەندین وڵات لە پلەی سەرەژوورچووندا گەیشتنە کەمانژەنی لە بری تۆپ تەقاندن بۆ جودا کردنەوەی ڕەوا لە ناڕەوا، لەو وڵاتانەدا مەودای نێوان سێتار و شەستیر ڕوون بۆتەوە لەلایەن گەشاندنەوە و توونا کردنەوە.

قسەی من و غەیری من زیان بە کەس ناگەیەنێت، خۆ ئەو تەقەمەنییە نییە خەباتگێڕان مەرحەبای بنەڕەتیی پێ لەیەکتر دەکەن، ئەوپەڕی زەرەرێکی تێشدا بێت بەفیڕۆچوونی ئەرکی فکر و نووسینیەتی، تۆبزیش لە کەس ناکات. ئەگەر بەدترین ئاکامیشی لێ کەوتەوە بەوەدا خەڵک دوای کەوتن و سوودیان لێ نەدیت خۆ هەرنەبێ شەڕیان پێوە نەدیتووە: وامان دانا ئەو ئەرک و کاتەی خوێنەر لە خوێندنەوەیەدا خەرجی کرد، لە حەللی وشەی تێکهەڵکێش یان ڕیوایەتێکی «ئەرسین لوبین»ی بە فیڕۆ دا. گرنگی فکر لەوەدایە ببێتە بەرنامەی چالاکی، بە خۆی و ئەرک و ئاکامەکانی کە وەک ئاڵقەی زنجیر بە دوا یەکدیدا دێن، هەرچی ڕەخنەی پاکە کە لە

تاوانبارکردنی توندی و گردەبڕیەتی[56] بەکاردێت ئەوەندەی بە بەرەوە هەیە، هەر نەبێ، وەک زەیت ئاسنی ژەنگاوی پێ چەور بکرێت تا ڕەونەق بداتەوە و لە ڕزین بپارێزرێت، دامان نا زەیت نەبوو، یان ڕژایە سەر لمی داخ، خۆ زەرەری کەسی تێدا نییە هەرچەند بەخەسارچوونیشی دڵی کەس خۆش ناکات چونکە بەفیڕۆچوونی ئەرکێکی چاکەی خەڵکی تێدا مەبەست بووبێ کەلێنی پڕ نابێتەوە.

دەزانم قسەیەکی سەبرۆکەی وەک ئەوەی من سکاڵای پێ دەکەم لەگەڵ خوولیای کەسانێکی دەیانەوێ ڕزگار بن لە دەست توندوتیژیەکی بە ئاگریەوە سووتاون و یان گوێی تیژڕۆیی سەر ڕچەی گردەبڕی و ڕیشەکێشی پێ دەزرینگێنمەوە، ئا ئەو قسەیەم هێند کورت لە هەوڵی ڕاستکردنەوەی چەوتی و چوێڕی و هەڵستاندنەوەی حەق، وەک ئەو کزە شەماڵەش نابێ کە لە فرتەنەدا بیەوێ کەشتی بگەیەنێتە کناری سەلامەتی، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا و لە ڕقی ئەوەشدا و بەهۆی ئەمیشەوە کارەکە دەچێتە پایەی «مقدس» ێک کە لێ هەڵاتنی دەبێتە گوناحێکی گەورە تا ئەگەر هەموو خاوەن قسەی نەسیمی خامۆشبوون گوناحەکە وەک «فرض الكفاية»[57] هەموان دەگرێتەوە چونکە خامۆشی سەرلەبەر لە ئاست «باطل»ی بێسنوور هەموو خامۆشەکان تاوانبار دەکات: تۆ بێنە بە خەیاڵ مێژووی خەباتی چاکە دژی خراپە خاڵی بکە لە نەعرەتەی «ابوذز» و نرکەی «احمد بن حنبل» و خاوەن ویژدانە زیندووەکان بە درێژایی تێخزانی زەمان لە مەکان «ذلك ان خلو التاريخ من قولة ((لا)) تلقاء الباطل المستفحل هو تعطيل لنصف قوة الحق في طلب الكمال لان دحض الباطل نصف المسافة الى تمام البرهان».[58]

---

[56]- گردەبڕیەتی: حدية.

[57]- «فرض الكفاية»: لە شەرعدا ئەوەیە، وەک نوێژی سەر مردوو، ئەگەر کەس نەیکرد هەمووی تێدا تاوانبارە.

[58]- «ذلك ان خلو التاريخ من...» ئەم عیبارەتە چڕوپڕە دەبێ مامڵەتی تابلۆیەکی هونەری لەگەڵدا بکرێت چونکە تەرجەمەی دەقاودەق هەڵناگرێت. مەبەس لێی ئەمەیە: پێویستە «باطل» و بەڵگەکانی بپووچێنەوە نەک هەر بەڵگەی چەسپاندنی «حق» ڕەپێش بخرێت چونکە «باطل»یش بارتەقای حق بەڵگەی خۆی سازداوە بۆیەیە پووچاندنەوەی «باطل» بڕینی

خەفەتێکی زلی ئەم بوارە گوتەیەکە پەککەوتەکان دەیڵێنەوە لێیان دەبێتە نیشانەیەکی زەق بەسەر فرکەی مسکێنی لە دەرماریاندا کە دێن بە دەمی بەشی شێوە باوەشکەوە دەڵێن: ڕۆژەکی دێت ماڵی زاڵم کاول بێت، بەمەشدا سێ بەرگی ئەستووری «باطل» لەبەر «حەق» دەکەن: یەکەمیان ئەوەیە باسی ماڵکاوولی مەزڵووم ناکەن کە لەم ڕۆژەدا بەرچاوە نەک هی دوارۆژ، چما ماڵی دادپەروەر لە کاوولی ڕزگاربووە؟

دووەمیان ئەوەیە مەسەلەکە دەداتەوە بە ڕۆژگار کەوا بێ خەمخۆریی خراپەنەویستی و چاکەخوازی، کۆتایی بە هەموو شتێک دەهێنێت. سێیەمیان ئەوەیە، ڕمانی ماڵی زاڵمێکی وا بە پێوە سەرەتای زاڵمێکە هەر بزانە بە پێوە بوو، نەک کلیلی دەرگەی بەهەشتە.

وەی کە ئەو خەڵکە چەند چەوت بیردەکەنەوە! ئەوپەڕی سێبووری لەو گوتەوە بنیشێتە دڵی بیسەرەوە هەر ئەوەیە، زاڵمێکی دەست نیشانکراو هەتا هەتایێ بەردەوام نابێ، ئەو سێبوورییەش وەک ئۆقرەی بەرخێکە ڕۆژێکی بێ سەربڕینی تێپەڕاندبێت. دەشبێ بزانین لەوانەیە ماڵی زاڵم ئاوەدان بێ و پشتاوپشت بۆ زاڵمان بە میرات بڕوات و مەزڵوومیش ملی بۆ کەچ بکات. ئیتر چ هەستی درۆزنی ئەمینبوون لەو قسەیەدا هەبێت بریتییە لە کمێک بەنگگێشی کە بەدیار گوشادیەکی نادیاری بەرتەماوە خەڵک بهاوێتە سەر باری کەمتەرخەمییەوە ئەوپەڕی شانایەکی تێشیدا بێت تاوانبار کردنی زوڵمە بە دەم ڕۆژگارەوە، شانازیەکش بەڵگەی پووچەڵی خۆی لەگەڵ خۆیدایە بەوەدا کە ئەو پەندە لە هەزار ساڵەوە دەگوترێتەوە بێ ئەوەی دەستە تەرازووی داد قورستر بکات وەیا بایی دەنکە خەردەلێک تەرازووی ستەم سووک بکات، گومانیشم نییە زاڵم هەبێ پێی وەتەنگ هاتبێت یان خۆی دزیبێتەوە لە گوتنەوە وەک کەسێکی تۆز لە شاقەڵی کەوای بتەکێنێت.

چی فەلسەفەی عارد و فەلسەفەی ئاسمانیش هەیە پەککەوتە دەبێت ئەگەر خەڵکێکی بە دواوە نەبێ بە نیازی لە کارهێنانی ئیمانی پێ هێنابێ، چاکەش بابەتێکی ناسکە زوو دەبەتلێ و بارمتەی بەهێزی گەرەکە لە ئاکاری کۆمەڵایەتی خەستوخۆڵ و کرداری

---

نیوەی ڕێگەیە بەرەو بەڵگەی بێ کەلەبەر دەنا «حق» نیوەی هێزەکەی پێوە نامێنێ لە هەوڵی خۆ تەسەل کردنی.

تاکەکانی هەتا سازشی بەردەوام بێ، چ بەهانەگری و زرە تەئویلانیش بە خۆوە ناگرێت لە چەندوچۆنی واتاکەی و لەوەی دەیپارێزێت: هەر جۆرە لەنگەربەزینێک پەیدا بێ لەو جۆرە دەستە تەرازووی لەنگەر ژیاریی وڵاتە پێشکەوتووە ناسراوەکانی بەسەرەوە وەستاوە لە ئاکامدا دەکێشێتەوە بۆ داوەستانی واقیعی کۆمەڵایەتی بەو جۆرەی زاڵم کەیفی پێ دێت: هەرگیز جیهان لەخۆوە بە خولگەی چاکە و پیرۆزی و حۆریەکانی بەهەشتدا نەسووڕاوەتەوە. لەوانەیە بابایەکی جیرەتەبیات «تێبنووسێ لە ڕاکێشانی کەوانی»[59] جەدەل و بڵێ: بەهەر حاڵێک بێت، تێژەنین لە زوڵم چاکترە لە خامۆشبوون و پتر دەوامەی فرکەی هەست کردن بە چاکە و خراپە لە دەماراندا ڕادەگەیەنێ: منیش بە ویژدانێکی ئارامەوە دەڵێم ستەمکار لە خۆی بایی دەبێ کە لە حزووری خۆیدا زووڵم ئابڕووی بزرێت چونکە لێی سوورە خووگرتنی دەروونان بە مەرایی و دووڕوویی ناهێڵێ مەبەستیان ئەو بێت، لە زراندنی ناوی زوڵم.

فەرموو چاو بە مێژووی دووڕوویی شاعیراندا بگرە لە تەرخان کردنی مەدحەکانیان بۆ ستەمکار سەیرت دێتەوە لەو هەموو جورئەتەی شاعیران کە دێن بە «پاکی»ـدا هەڵدەڵێن ڕووبەڕووی کەسانێک پیسترین وێنەی فاسقی تێیاندا مەییوەتەوە و مەدحی بەزەیی جەللادی زەمانی خۆی و هەموو زەمانێک دەکەن ئیتر برۆ بەرەو پێڕستی ڕیاکاری لە بەرەواژ کردنی مەعنایان تا دەگەنە برشتی کام جلکی ناسکترە و ڕوونترە و شەفافترە و شەرەفدارترە بۆ باڵای کام زۆرداری بەدتەبیاتتر و درخووتر و کوێرویژدانتر، ڕەنگە لێرەشدا «متنبي» کە لەقەبی «ابو المسك» ی بە کافووری قولەڕەش بەخشی دەرگەیەکی ژیرانەی دۆزیبێتەوە بۆ ڕزگاربوون لە تەنگانە بەوەدا کە خۆی لارێ کرد لە مەرایی دزێوکردنی سپاسی بۆ خاتری سییایی ئیتر شیرن کردنی ڕەشایی میسک بوو بە ئابڕووپارێز و گلەیی ڕەوێنەوە. شتێکی لەم بابەتانە کە هەستە دەماری مرۆی هەستیار دەگوشێ ئەوەیە، بێژەیێکی ڕیاکارانە بۆ خاوەن دەسەڵات بە دیاری دەچێت هەرگیز نەخراوەتە ناو بۆتەی تاقی کردنەوەی ڕاستی و درۆیی، هەر ئەوەندەی لەگەڵدا کراوە کە بە تەرازووی ڕەوانبێژی هەڵکێشراوە تا

---

[59]– «تێبنووسێ لە ڕاکێشانی کەوانی»: تیرهاوێژ بە پێی دووریی نیشانە، ژێی کەوانە ڕادەکێشێت تا ئەوەی هەردوو سەری کەوانەکە بە یەکتر دەگەنەوە.

ئەگەر دارِشتنەکەی بێعەیب بوو نەختێکیش ئارایشتی لەگەڵدابوو دەچێتە پایەی لایق بە پەخشانی نازدار و هەڵبەستی تۆقەڵان ئیتر پشتاوپشت بە ڕێزەوە و حەپەسانەوە دەخوێندرێتەوە:

ارهبت اهل الكفر حتى انه
لتخافك النطف التي لم تخلق

«وەهات کافر تۆقاندووە نوتفەی نەخوڵقاویش لێت دەترسێن»

وەهاش دەبێ پاش ئەوەش ئێسک و پرووسک دەبن بە خاک، چ هی مەدحکەر و چ هی مەدحکراو، ترسی ئاکامی ڕاستگۆیی لە نرخاندنی شوێنەوار و خەبەران لە دڵاندا نامێنێت، لێرە و لەوێ ڕەخنەیەک و توانجێک سەرهەڵدات، بەڵام سەرشکێن کردنی بێدەسەڵات کە قەباحەتی زلە پیاوان بە قەباحەت ناو دەبات بێوەخران و بێبەزەیی و بێشەرەفانە ئەنجام دەدرێت چونکە چپاندنی بێدەسەڵاتان هەلی خۆهەڵدانەوە بە مسکێنتەبیاتەکان دەدات کە چڵێسی ئەوەن هەڵوەستێک ڕاوەستن لە ڕواڵەتدا هێزێکی مەوهوومی تێدا بێت، لایەنگیری کردنیشان لە دەسەڵاتدار بە توێکڵێکی ڕووکەشەی ئامۆژگاری پیتۆڵ و پەندی ژیرانە [ڕووبەڕووی بێدەسەڵات] تەمایەکی ڕەزامەندی دەسەڵاتداری پێوەیە کە هەرنەبێ لە گەزەندەی ڕزگار دەبێ. لە تێکڕای مەسەلەشدا ڕێ خۆش کردنێکیش هەیە بۆ خۆ بەسەهووبردن لە پەسەندایەتیی سەردانەواندن بۆ هێزی ستەمکاران. هێشتان بۆ دووڕوو بە شەرەفترە کە بێ پێچوپەنا مەرایی بکات و بۆ لووتبەرزیش شەرافەتمەندترە خوێڕیەتیی خۆی بەسەر لاتەوە بێدەنگانە لەکار بهێنێ. بەڵام دەڵێی چی! مەیلی دڵان وەلای ساختەچییەتی مەزەدار مەیلی وەلای حەقیقەتی سادەوە دەکوژێت.

یەکێک لەو خەفەتە بێڕەزایانەی بە ڕواڵەت جێی سەیرپێهاتنە ئەوەیە، دڕی و شڕیی خەباتگێڕان لە شەڕی ناوخۆیی، لە هەڵمەت یا لە پاشەکشەدا، نێزیکترە لە جانفیدایی و قارەمانەتی و عەزمی پتەو تا ئەوەی لە تێکهەڵقژانیان لەگەڵ دوژمندا پێیانەوە دیاربێ. لەوانەیە خەباتگێڕێک ڕووبەڕووی یەکێکی وەکوو خۆی لەسەنگەردا پێگیربێ وەک تاوێرێکی دووبەشی لە خاک ڕۆچوو بێت: یا مەرگ یا سەرکەوتن نەبێ هەڵناقەنێ.

ئازایەتیەکە لە شەڕی دۆستی دوێنێی لە دەماری دەکوڵێت تا کۆتایی هەنگامە، کاتێک ڕووبەڕووی دوژمن بوو، فاکتەرەکانی گیانپارێزی و خەفتیانی سەلامەتی و خۆدانان بە یەدەگی خەباتی دوارۆژ و چەندین تەبریری ئەوتۆ لە پێویستبوونی پارێز و خۆنەدانە هەلاکەت کە بە شریتە دەلیلی ڕاستبوونیان لە مێژووەوە هاتووە تێیدا بە خەبەر دێن، ڕەنگە هەمووشیان دروست بن بەڵام حیسابی بۆ هیچیان نەکردووە لە شەڕی خەباتگێڕێکی بەرەی خۆیدا.

هۆی ئەم دیمەنە بەرەواژە شتێکی دەروونی و ئیعتیبارییە هیچ پێوەندیی، نە ڕاست نە درۆی نییە، بەو بەرژەوەندەی لە فەلسەفەی خەباتدا ڕەچاو دەکرێت و ئەو هەڵوەستە هەمەجۆرانەی بەرژەوەند کە داوایان دەکات چونکە نە بەرژەوەندی ڕاستینە نە هی وڕێنەکرد نییە لە نەرمبوون لەگەڵ دوژمن و دڕبوون لەگەڵ خێزانی ماڵەوە. سەبەب لەوەدایە کە دۆستی دوێنێ مرۆیەکی ئاساییە بە خۆی و عەیب و نوقسانی و بێهێزییەوەی تا ئەوەی ئاهەنگی پرخەی خەوی و تەقەی قرچێنەی جودای دەکاتەوە لە هی دیکە، لەوانەیشە ئینتەلای پاش جەمی چەوری بەس بێ بە لای برادەریەوە کە پلەی بەرزی پێ ڕەوا نەدیترێ کاتێک خێر و خۆشی بەسەر تێکۆشەراندا دارەبەش دەکرێت!! دەشبێتە عەیبێکی زل و بێسەبەب ئەگەر تێکۆشەر لە ئاست یەکێکی وەکوو خۆیدا خاو ببێتەوە کە لە خۆی پتر قارەمانیەتی نەنواندبێت، گۆیا چ مەنتقێک هەیە لەسەر کیسەی ئەو شەرەفی سەرەفرازی وەرگرێت و نوشستیش بۆ خۆی بێت.

تێکۆشەر لە حیسابی سوود و زاندا ئەم لێکدانەوەیە دەکات تا ئەوەی لە حەفتاکاندا دیتمان سەدان لە جانفیدایانی کێشەیەکی بەناوبانگ خۆیانیان دایە دەست دوژمنە مێژووییەکان کە تەفروتوون کردنی [ئەو دوژمنە] تاکە ئامانجێک بوو بۆی دەکۆشان و بەقوربانی دەبوون کەچی نەیانسەلماند چەک فڕێ بدەن بۆ ئەو هاوڕەگەزانەی چەند ساڵ بوو لێیان مێوان بوون.[60]

تێکۆشەرانی بەرەی فەلسەفەی گردەبڕی و ڕیشەیی، لەوانەن پێکەوە هەڵکردنی هێمنانەیان لەگەڵ دوژمندا بە بەرێکی پەسەند لە بەرەکەتی مێشکڕوونی حیساب بکەن کە تیشکی داوەتەوە لە نەزەریەیانەوە بۆ سەر واقیعی خەبات بەڵام مومکین نییە

---

[60]- هێمایە بۆ ئەوەی، لەهیچە، نێوی نرا «ایلول الاسود – ئەیلوولی ڕەش».

لەگەڵ ئەو هاونیشتمانیانەدا هەڵ بکەن کە ویژدانیان بۆ بیروڕایەکی بردوون نەختێک لە زەمینەی ئابووری وەیا ڕۆشنبیری، جودا بێ لە عەقیدەی ڕەسمیی زۆرینە، لەوانەیشە ڕۆژگار ڕاستی و دروستیی عەقیدەی کەمینە بە ئیسپات بگەیەنێ، پاش تەفروتوون کردنیان... ئەمما وەستاندنی شەڕ لەگەڵ دوژمنی هەرە سەر ڕەق، ئەمیان، تەعلیلێکی دەدرێتێ کە لە مجێزی نەوس نەک بڕیاری بەرژەوەندەوەیە، ڕێکیش دێت لەگەڵ خۆشجڵەوی تێکۆشەر بۆ ڕازیبوون بە سەرکەوتنی دوژمن لەچاو سەلماندنی سەرکەوتنی دۆستی دوێنێ و پێرێ. هەرچی دوژمنە خەڵقەندەیەکە چەندوچۆنی و کاروبار و تەبیات و ئاکاری نەزاندراوە و نوقسانیەکی هەیبێ وەک هی دۆستی دوێنێی دەرناکەوێت. بۆ لایەنی ئازایەتیش ئەو بەڵگەیەی بەسە کە مل دەنێتە شەڕێکی مردن و ژینەوە، ئیتر هەرچی لێی بەدەر دەدات دەچێتە حیسابی ئیجابییەوەی، کە قیاس بکرێ لەگەڵ دۆستی دوێنێ پشکی لایەنی سەرکەوتنی پۆزتر دەبێ، هی لایەنی تێشکانیشی بە تاڵتر دەبێ و هەرگیز وەکوو مرۆیەکی ئاشنای عادەتی لەبەر چاوان تەخت و تەنک نابێتەوە.

لەمەش بترازێین، شکانی تێکۆشەر بەرانبەر دوژمن ئیحتیمالێکی حیسابیە بە نیسبەتی لە سەدا پەنجا، ئەمما شکان لە شەڕی ناوخۆیی بەرانبەر دۆستی دوێنێ شوورەییەکی ڕووت و هەڵاتنەکی نەکردەنییە و باوەڕ دۆڕاندنێکە لە پلەی خیانەت... تێکۆشەری گردەبڕی و ڕیشەکێشی ئەم شێوەیە فکر دەکاتەوە، لە پەناوپەسێوی هۆشی ونیشی، بگرە هۆشی ئاگاداری، خەیاڵێکی خۆشکەڵەی خۆ نازۆکردن بە ماڵ و دەسەڵاتی حەڵاڵ و زەڵایی بەر تیشکی عەقیدەکرد هەیە وازی لێ ناهێنێ بۆ برادەری دوێنێ نە لەبەر خاتری مەنتیقی پاڵاوتەی حەق و نە بە چاودێریی نان و نمەکێکی لە نێواندا بووە، هەر ئەو نان و نمەکەش بوو برادەری دوێنێی پێ تەنک بووبۆوە بە جۆرێک چ ناوەڕۆکێکی حەزۆ و دزۆ بە خۆیەوە نەگرێت.

چاوێک بە مێژوودا بگێڕە و لیستەیەک بگرەوە بۆ ئەو گەردەنە بێتاوانانەی تیغێک بڕینی داوای حەقپەرستی دەکرد... بۆ ئەو ئاواییانەی بەسەر وەرزێرەکانیاندا، بە ناوی خزمەتی وەرزێر و یارمەتیی بەرهەم، کاول کران و بۆ ئەو [کارە] گیانکوژ و ماڵبەرانەی کە بە لێزمەی بەڵای ناگەهان دادەبارینە سەر بێتاوانان لە بن خێوەتێک کە بۆ پاراستنی داد هەڵدرابوو!! بژمێرە، کە ناژمێردرێ، بەرهەمی هۆشی جوانکار کە

به دەستی نەزانی و چەپەڵی سووتێندران، ئنجا لیستەکە بناخنە بە جۆرەها دامەنپیسی و لە ڕیز دەرچوون بە «باطل»ی حەقپۆشکراو و دزێو بە جوان نیشاندراو و بە وەگێڕانی ناوی شتان، دەبینی لیستە بە درێژایی مێژوو درێژ و بە پانایی مێژوو پان هەر لەو ڕۆژڕا حەق لە ناحق جوداکراوە و چاکە لە خراپە ترازا تا ئەم ڕۆژگارەی کەوڵی «لە گەردەن دان» لە زۆربەی وڵاتانی خوا ڕاخستراوە و یاسای شکەفت و دارستانی بە سەرەوە دەگەڕێ دەشزانین ئەو تەرازوانەی دەستەی حەقیان سووکە و هی ناحەقیان گرانە کێشانەی حەق و ناحەق لەیەک وڵاتدا دەکەن و دەستیان ناگاتە دوورە وڵات تا کێشانەیان بۆ بکەن لەو زەهر و زەققوومەی دەرخواردی خزم و برادەرانی دەدەن، ئەو دەستەی تەرازووەکەشی هەڵبڕیوە، بە زاهیر، دەستی پارێزگاریەتی نەک دزەکەی.[61] ئنجا فەرموو خەفەتێک لەو خەفەتانە هەڵبژێرە و مەینەتی تێبرژێنە.

پەرۆشێک لەو پەرۆشانەی هیچ فەرهەنگی پزیشکی نایگرێتەوە لەو فەرهەنگانەی هەموو دەردە کۆمەڵایەتییەکانی گرتبێتەوە، بەڵایەکە لە مێژووی جیهانی سێیەمدا وەک هەوری ئیقلیمگیر پنۆکێک خۆڵ و تاکێک لە خەڵک نابوێرێت، زلییەکەشی لەوانە نییە ڕستە و دوو ڕستە وەسفی بکات، بەڵکوو نزیک خستنەوەی بۆ بەر زەین نموونەیەکی گەشی گەرەکە تا بنیشێتە قەناعەتی خوێنەرەوە دەنا باس کردنی بێسوودە و پێ داگرتن لەسەری وەک چەنگ گرتن لە هەوایە و خەریکبوون بە مەزموونیەوە خەیاڵ و ورێنەیە: نموونەکە لەسەرگوزەشتی پێغەمبەر مووسا [لە قورئاندا] هاتووە کە گوتی «لا أبرح حتى أبلغ مجمع البحرين أو أمضي حقبا» تا گەییشتە «عبدا من عبادنا صالحا» بوو بە هاوڕێی بە مەرجێک نافەرمانی لەگەڵدا نەکات. «حتى إذا لقيا غلاما فقتله»[62] ئێمەش لەگەڵیدا دەگەینە ئەو شوێنی مەبەستمان بوو بۆ ڕوون کردنەوە: عەبدە ساڵحەکە لە تەبریری کوشتنی ئەو منداڵە گوتی «وأما الغلام فكان أبواه مؤمنين فخشينا أن

---

[61]- ئیشارەتە بۆ «حاميها حراميها».

[62]- ئەم سەرگورشتەیە لە سووڕەتی «الكهف»ـدا هاتووە کە مووسا پێغەمبەر دەبێتە هاوڕێی «خدری زیندە» بە مەرجی ڕەخنە نەگرتن. لە جاری سێیەمی بێمەرجیدا خدر لێی جودا بۆوە.

يرهقهما طغيانا وكفرا» واتە: ئەو منداڵە دایک باوکی ئیماندار بوون ترساین [منداڵەکە کە گەورە بوو] بە کفر و لە خۆدەرچوون بیانڕەنجێنێ.

لە مێژووی جۆشان و خرۆشان لەوەتەی خەبات و جۆش هەبووە، نموونەی ئەو منداڵە زۆر هەبوون کە پێگەییشتن بە کفر و بەڵا خەڵکیان هەراسان کردووە. ئنجا ئەگەر دۆزینەوەی بەدایەتیی لە سروشتی منداڵەکەی ناو قورئان بەند بوو بە ڕێنموونی لەلایەن خوای جیهانەوە بەو جۆرەی یەقین ببەخشێت و کوشتنی حەڵال بکات، خۆ ئەو تێکۆشەرەی لەوانە بێت خەڵک هەراسان بکات لە سەرەتاکانی خەباتییەوە بە دڕی و توندی و فڕوفێڵی گەیشتن بە دەسەڵات وەها ئاشکرا و بەرچاوە کە نەدۆزینەوەی جێی سەرسووڕمان بێ.

ئەو شڕ و دڕ و توندەتەبیاتانە لە جۆری ئەو منداڵەن بەڵام کەسێکیان بۆ نەڕەخساوە وەک خدری زیندە بێ و دمی غەیب مەفتەن و گەل لە شەڕی ئایندەیان بپارێزێت بەوەدا لە منداڵیەوە بیانکوژێت ئنجا (کە نەکوژران) جووڵەی دووپشکانەیان بەرەو گەنجایەتی دەبێتەوە فراژیبوونی مەیلیان بۆ ئازاردان و توانایان لە زەدە کردن و مەشقیان لە چپاندن و دەستدرێژی.

جا ئەگەر هەڵکشانیان لە پێپلیکەی دەسەڵاتێکی بە جۆرەها فێڵ و داڵدەدان و ترساندن لە ئازاردانی خەڵک بەکاربێت، ئا ئەو هەڵکشانە گڵاوە لەواندا شتێکی سروشتکرد و داخوازیی بەدایەتیەکەیان بێت، خامۆشبوونی خەڵک لەو هەموو گۆنگەر و باتڵی دەیکەن و وێڕای ئەو نموونانەی مێژووی دماودەم و نووسراو بەخەبەردەر و ئاگاکەرەوە دەیگێڕێتەوە، ئەو خامۆشبوونە جۆرێکە لە ئیمزای حوکمی خۆ ئیعدام کردن.

من تێدەگەم برە مەڕێک ڕازی بێت گورگ شوانی بێت چونکە مەڕ مێژوو ناخوێنێتەوە و فەندی خۆپاراستنیش نازانێ و چ ئیرادەشی نییە مەگەر بێچارەیی، جگە لەوەی کە بەهەمەحاڵ دەخورێت لە لایەن گورگەوە بێت یان مرۆ، ئەمە دەزانم بە پەرۆشێکەوە بۆ بەڵایەکی ڕەت نابێتەوە. ئەمما ئادەمیزاد وەک مەڕ تەسلیمی زرە بەدکارێکی بچووک بێت کە لەبەر چاویدا خەریکە دەبێتە بەدکارێکی وردوخاشکەری تێکشکێن، هەرچەند لە حوکمی واقیعی ئیفلیجی یاریدەدەری زوڵم مەفهومیش بێت،

دیسانەوە ئەو سێبوورییەم ناداتێ کە لە مەسەلەی مەڕ هەستم پێ کرد چونکە ئەو تەسلیمبوونە تاکە «خیار»ی ناچاری نییە کە دەچێتە ڕیزی «بێ خیاری» چونکە ئەگەر مەڕی سکوتلەندە هاوچوونی مەڕی ئۆگەندە بێ، ناشێ مرۆی هەموو وڵاتان مەڕی مل ڕاهێشتوو بن بۆ چەقۆی جەللادەکەیان تاکوو حەسرەت هەڵێنان بۆیان وڕێنە دەرچێت وەک حەسرەت لە سپیبوونی مووی مرۆی پیر یان نەبوونی هەرمێ بەسەر دارەوە لە کوشندەی زستاندا یان کەلبوونی مانگ دوای بوونی بە بەدر. بەشی هەرە گرنگی ئەم قسەیەش تێکڕای تێکۆشەران نەک نیوەنوستووانی مەبەستە وێڕای ئەوەی کە مەینەت [ی یەکترکوژی] لە هەنگامەی خەبات زەنە دەکات، نەک هێزێکی ستەمکار بە ملیدا دەبڕێت و چاوغەڵەتێنی تێدا دەکات بە جۆرەها هێڕکردن.

ئایا نابێتە بێباوەڕی بە خەبات کە تێکۆشەر دوو جاران دەیکاتە قەشمەرجار، هەر جارە بایی سەربڕینێک بێ، یەکەم ئەوەیە، خەباتەکە بە جۆرێک دەگێڕێ ملکەچی دەکا بۆ ئیرادەی هەڵەباشان، دووەم ئەوەیە، کە توانا بە خەباتەکەوە ناهێڵێ خۆی لە چنگاڵی هەڵەباش قوتار کات بە بەهانەی «یەکیەتیی بیروڕا» کە بریتییە لە سەردانوواندن بۆ فەرمانی تۆقەڵان، بێ بەند و بێ مەرج.

ئەم وڕێنەیە بە هاراوی لە کار دێت بۆ دەوامەی بێدەسەلاتیی خەڵک تا سەردەنێ بە گوتەی «دیکتاتۆرایەتیی دیمۆکراتانەی گەل» هەر چونکە ناشچێتە عەقڵەوە گەل [هەتا سەر] خۆی کەلەپچە و دڵخواز و مەنتیقی توونا بکات سەرەنجامی پەندە بەرەواژەکە ئەوە دەبێ کە کەمایەتیی بژادە یاخود زراوڕژێنی هەرە زەبەللاح سووڕی گۆپاڵ و شرقەی قەمچی بەکاربهێنێ، هێندەی بەدیهیش ئاشکرایە کە گەل بە تەواوی پەککەوتە دەبێ لەوەدا گوتە مەشوورەکە بگۆڕێ بە «دیمۆکراسی دیمۆکراتانەی گەل» هەروەک سویدی و فنلەندەیی و سکۆتلەندەیی و جرِ و جامشتی! ئەوتۆیی کردوویانە ئیتر بەرەکەتی دیکتاتۆرایەتیی دیمۆکراتانە بەردەوام دەبێ بە تامی «ترش و شیرن»ـیەوە تا لە خۆوە بە دەم ڕۆژگارەوە دەپوێتەوە یاخود «ليقضي الله أمرا كان مفعولا... چی خوا حەز بکات».

با لە بیر نەکەم بەدەم قسانەوە، قوتاربوون لە چەنگ ئەو تێکۆشەرەی نموونەی منداڵەکەی حیکایەتی مووسا پێغەمبەر بوو بەو جۆرەی باس کرا لە پایەی محاڵدایە چونکە ئەگەر تێکۆشەرە نامزەدەکەی تۆغیان و یاغیبوون پێش گەییشتنی بە

دەسەڵات بکوژریت دەبێتە قەتلێکی بێ سەبەب و بەهانە چونکە نە بە یەقین و نە بە تەرجیح ناسەلمێ فلانە تێکۆشەر لە دوارۆژدا غەرڕا دەبێت و هەڵدەچێت و هەڵدەشاخێت هەتا ئەو ڕۆژەی لە واقیعدا غەرڕا دەبێت و هەڵدەچێت و هەڵدەشاخێ. ئیتر پێشدەستی کردن لە کوشتنی دەبێتە مانیع لە سەبەبی کوشتنەکە، بەوەشدا تاکە کەرستەی قوتاربوون لەو بەدایەتییە دووبەختییەی بوون و نەبوون هەر بەوە دەبێ دەرفەتی گەییشتن بە دەسەڵات و سەرۆکایەتیی لێ ببەستریت کە دەزانین لە هەموو خەباتی سەربە شێوازی بنەڕەتی ڕیشەکێش کارێکی زێدە سەختە چونکە زۆربەی تێکۆشەرانی ژێر سێبەری ئەو فەلسەفانە لایەنگیری دەسەڵاتی کەمایەتین و دوژمنی شێوازی هێمنانەن، لەوانەیشە هەر یەکەیان بەتەما بێ لە هەلێکی بەختەوەردا ببێتە فەرمانڕەوای خودبەسەر، لەوەوە چ ئومێد نامێنێ ڕێژیمێکی بناغەی لەسەر گردەبڕایەتی و ڕیشەکێشی دامەزرا بێت چەردێکی گیانی دیمۆکراسی ڕاستینەی تێبگەڕێت وەک ئەو وڵاتە تێهەڵکشیوانەی خاوەن ڕێژیمی دوور لە کپ کردنی ئیرادەن.

لێرەدا دەبێ بڵێین فەرق لە نێوان گردەبڕایەتی سەربە باوەڕی چینایەتی و گردەبڕایەتی حیزبێکی ناچێتەوە بۆ چینایەتی وەیا تاکە زۆردار دەیگرێتە بەر، هەموویان دەگەنە یەکتر لە پەستاوتنی ئازادی بایی ئەوەی دەنگی جەماوەر تەئسیری پێوە نەمێنێ. لە ئاست هەڵچوونی تاکە کەسدا تێبینی لەوەدا دەکرێ، هەر چونکە جیهازێکی حیزبایەتی ئەوتۆی نییە وەک ڕشتەی دەماری خوێن یان هەستەدەمارەکان[63] لە بنیاتی کۆمەڵدا تەنیبێتەوە، دەستی بەسەر هەموو ورد و درشت ڕاناگات، لێرە و لەوێ، مەودای هەناسەیەک و دەرفەتی حەسانەوەیەک دەمێنێتەوە بۆ خەڵک لە دەرەوەی جغزی دەسەڵاتی دایەرەی ئەمن کەیفێک بکات و چەند سەعاتێک بە خۆشیی ڕابوێرێت چونکە دایرەی ئەمن لەو ڕێژیمەدا ناتوانێ وەک ئەمنی سەربە ئامۆژگاریەکانی حیزب توندوتۆڵ بێت.

یەک لەو خەفەتانەی بینەر سەرەدەری ناکا لێی قوتار بێت ئەوەیە، تێکۆشەرانی جیهانی سێیەم هەموو بەڵایەک و داماوییەک و بەدایەتی و چەپەڵی دنیای خۆیان

---

[63]- هەستەدەمارەکان: اعصاب.

دەدەنەوە بە فروفێڵ و شەیتانی ئاشکرا و بزری ئیستیعمار. لە پێشەوە دەڵێم لەعنەتی بەرودوایی لە خراپەکار و ستەمکار و شاڵاوبەر و داگیرکەر بێت بە کۆن و نوێییەوە و ڕیسوایی بۆ هەموو تاقمە ولاغێکی پێکۆڵی لە غەیری خاکی خۆیدا کردبێت... بتلێنەوە ئەوانەی ڕماندن بە بنیات و دیل کردن بە ئازادی و کفر بە ئیمان گومڕا کردن، بە ڕێموونی لە قەڵەم دەدەن.

دوای ئەم «نعوذ بالله»یە دەڵێم: جۆرێکی ڕق پێدارشتن بوو لە زوڵمی کۆن کە گەلان بەردەوامبوون لەسەر دابڕینی ناوی «مستعمر» بەسەر دەوڵەتی ئەوتۆدا هیچ موستەعمەرەی نەمابوو هێندەش لە لایەن گرنگیەوە دابەزیبوو تۆمەتی «استعمار» بۆی دەبووە شانازی وەک بە موفلیسێک بڵێی: پاشای سەعادەتمەئاب. سەبەبێکی لەمەش بەهێزتر بۆ بەردەوامیی ئەو سیفەتە لەوەدا بوو کە دەوڵەتە خوێڕووەکان بە فێڵوفڕ بۆ داپۆشینی بێچارەیی و تەعلیلی بێهێزییان سەبەبێکی ساختەیان هەڵدەبەست کە ناوی ئیستیعماریان دەهێشتەوە تا وەک ڕست جلە شۆڕاوەکانیانیی پێدا شۆڕبکەنەوە. تێکۆشەرانیش، نەک تەنها دەوڵەتەکان، زاراوەی دەرەبەگیان[64] بە یەدەگ دانا بە نامەی سەبەبێکی مێژووی بۆ نەزۆکبوونی هەوڵی چاکە لە وڵاتی ئەوتۆ دەرەبەگێکی تێکۆشەران و ئەو حکوومەتانەی پێشتر دژی دەرەبەگ و پاڵپشتەکانی شۆڕشیان کردبوو، کە بە نیازێکەوە پاشماوەی لێ هێشتبوونەوە. سەرمایەیداری[65] زوڵملێکراویش خرایە لیستەی دوژمنانی پێشکەوتن لە خەباتی گەلی ئەوتۆدا جارێ سەرمایەی تێدا نەڕسکابوو ئیتر دەیانگوت و دەیاننووسی: بمرێ دەرەبەگایەتی، کە کفن و دەفن کرابوو تێرمەرگیش بووبوو، برمێ سەرمایەداری، جارێ تەنانەت بەسەر پێیانەوە خۆی نەگرتبوو.

---

[64]- بە کورتی دەڵێم: لە کوردیدا دەرەبەگ بۆ هەموو زەویدارێک ڕۆیشتووە کە خۆی زەویەکە ناکێڵێ و مزەی لێ وەردەگرێ. ڕاستییەکەی کوردەواری Feudalی بە مەفهوومی ئەورووپای نەبووە خۆ کورد هەرگیز ڕێژیمێکی نەبووە لەو ژێردەستایەتییە مێژووکردەی کە وەک شەپڕە بۆی بوو بە دەردی بێچارە.

[65]- خۆزیا کورد سەرمایە و ژێرخانی سەرمایەداریی دەبوو. بە هەموو عومری تاکە «صراف»ی لێ پەیدا نەبوو چ جایی بانکی کوردی و کارخانەی کوردی و فڕۆکەخانەی کوردی...

لە پێداگرتنی تێکڕای چەپ لەسەر وەپاڵدانی ناوی «مستعمر» بۆ ئەو دەوڵەتە کۆنە داگیرکەرانەی یەک بست خاکی غەیریان لە دەستدا نەماوە، وا پێ دەچێ، ئەو ناوەیان لە کۆڵ نابێتەوە مەگەر وەک ئێمە دەست پان بکەنەوە و بڵێن: خێرەومەند، سندووق سەرت... یاخود شۆڕشێکی پەڕگیریان تێدا بەرپابێ تۆز لە دامەنیان بتەکێنێ کە ئەوسا گلەییشی لێ ناکرێ وڵاتی خەڵک داگیر بکات چونکە پێی دەبێتە ڕزگارکەر تا ئەگەر داگیرکەریش لەو وڵاتەدا نەبوو لە خۆیانیان ڕزگار دەکا هەروەک کە ڤێتنام لە کەمبوجیە و ڕووسیا لە ئەفغانستان دەیکات...[66] وڵاتێکی وەکوو ژاپۆن شەڕی دۆڕاند و بەندی خرایە سەر لەلایەن چەکەوە و ئەرزی لێ دابڕا و هەر پێی دەڵێن «مستعمر» هەرچەند ماددەی خامی پێویستیشی نییە بۆ سناعەت، تەنها شتێک هەبێ هۆی ناوزڕانی بێ بە وەسفی ئیستیعمار هەر چالاکی میللەتەکەی و دەستخاوێنییان لە ئیش و ڕژدییان لە وەدەست هێنانی زانست و تەکنەلۆژیایە ئیتر بەس بوو بۆ ئەوەی سیفەتە دزێوەکەی پێوە بندرێت کە شان بە شانی میللەتانی ڕیزی هەرە پێشەوە، بەڵکوو لە پێشیانەوە بێت شۆڕشێکی چەپڕۆیانەشی نەکردبێت «بمرێ ئیستیعمار و برمێ دەرەبەگ»ی پێوە بجێویتەوە.

چەندم لێ گران هات کە دیتم مرۆیەکی دڵ هۆشیاری نیگافراوانی وەکوو هاوڕێ گۆرباچێڤ لە دوانە سیاسییەکەی دەمی کۆبوونەوەی بیستوحەفتەمی پارتی کۆمیونیستی ڕووسی، بە زمانی لیژنەی ناوەندی حیزبەوە، لە ڕۆژی 25-2-1986 بێ دووڵی و بێ گومان ژاپۆن بە موستەعمیر دابنێت. ئنجا ئەگەر گوتەی ئەوتۆیی ببێتە عەیارەی چاکە و خراپە و جیهانی سێیەم بەرودوای خۆی پێ بپێوێت لێی حەرام دەبێ ڕۆژێک لە ڕۆژان ببێتە وڵاتێکی وەدەرنێر[67] دەنا دەبێتە کۆلۆنیالیست.

سەرجوملەی ئەو گوتانەی لە وڵاتە دواکەوتووەکان و لە نێوان ڕیزی بەرەی چەپ دەیبیسن بریتییە لە کاسێتێکی پڕاوپڕ لە خۆ ڕەهاندن[68] چ لە ڕووی تەفسیری پاشکەوتنی خۆیانەوە بێت بە جۆرێک گلەیی بخاتە سەر غەیر چ لەوەش پتر کە دێن

---

[66]- ئەم نووسینە هی ساڵی 1988 ـە.

[67]- وەدەرنێر: مُصَدِّر.

[68]- ڕەهاندن: ئەمیش وەک دروستاندن بە واتای «تبریر» دێت.

هەر پێشکەوتنێک و گەشانەوەیەکی بۆ خزمەتی خۆیان تەرخان نەبێت تاوانباری دەکەن تا ئەگەر مرۆی ژاپۆنی تێروتەسەل بوو لە پیشەسازی و تەکنەلۆژیادا شان بە شانی ئەمەریکا ڕاوەستا دەبێ بە مشتنی خوێنی جیهانی سێیەم بدرێتە دەم یەک لەو تەفسیرانەی تێیدا مەعلان بووین و لە مجێزمان خۆش دێت و ئێستاکە و دوارۆژیشمان دەکوژێت و دەبێ بزانین سڕکردنی هەستەدەمارەکانمان، چەندێکیش مەزەدار بێ، بە لۆمەی غەیر چ دادمان نادات لە چارەی گیروگرفتەکانمان، بایی مەودای یەک ئەنگوستیش بەرەو پێشمانەوە نابات، ڕۆژێکی حەسانەوەش نابینین هەتا نەگەینە ڕێکاری هەڵوەستێک کە بتوانین دان بە تاوانباریی خۆماندا بهێنین لەو شتەی تێیدا تاوانبارین بە ڕەهاندنی خەڵک لەوەی تێیدا بێسووچن.

لە سەردەمی شۆڕشی فڕەنسەوە بەر لە دووسەد ساڵێک تێکۆشەران ئۆگریان گرت بە ڕێز لێنان لە مەنتیقی ناواقیعی و نامومکین و حەزکردن لە گوتەی کشت و وشتی وەک حاڵەتێکی تێیدا دەژیان دیاردەکەش پتر دەوامی کرد لەوەی چاوەڕوان دەکرا هەر چونکە بیردۆزەکان و تێکۆشەرەکان کەمتر بەرپرسی گوزەران و پێگەیاندنی منداڵانن ئیتر کاریان بووە وشە پێوان و دورشم نەخشاندن و نمایشت ڕێکخستن و چالاکیی ئەوتۆ کە مەبەست لێی گۆڕینی ڕێژیمە بە نیازی نۆرە حوکمی خۆیان، تا ئەگەر بوون بە فەرمانڕەوا خافڵاندنی خەڵکیان بە دوژمنایەتی ئیستیعمار و دەربەگ و بۆرژوا و یاریدەدەرانی شۆڕشی بەرهەڵستیان[69] بە مفت زانی بۆ بەردەوامیی خۆیان ئیتر مانی ئیستیعمار لە ئەدەبی سیاسی شۆڕشگێڕ بوو بە پێویستێکی زەرووری هەرچەند سەردەمیشی تێپەڕیبوو ئنجا زیرەکەکانیان ساختە «ئیستیعماری نۆی» یان هەڵبەست، ئەمیشیان فیڵێکە تا بڵێی عومر درێژ، لەوانە نییە وەک کۆنە زاراوەی ئیستیعمار لە برەو بکەوێ چونکە بەستراوەتەوە بە هەبوونی دەوڵەتی پێشکەوتووی سنعەت و تەکنیک و زانست، سەبەبێکیش نابینی بۆ نەمانی ئەو جۆرە دەوڵەتانە چ موژدەش پەیدا نییە دەوڵەتە فراژییەکان[70] (جاران پێیان دەگوترا دواکەوتوو) بگەنە

---

[69]- شۆڕشی بەرهەڵست: ثورة مضادة.

[70]- دەوڵەتە فراژییەکان: الدول النامية.

پلەی خۆگری و چەسپان و پێشکەوتن پێویستیان نەمێنێ بە هەڵبەستنی داروەکازی وەهمی بۆ ڕاگیرکردنی باڵای لەرزۆکیان.

دۆزینەوەی زاراوەی «شۆڕشی بەردەوام» یش داهێنانێکی زەرووی بوو بۆ دەوامەی سەرپەرشتی کردنی یەکسەر لە ئاپۆرەی «زەحمەتکێش و هەڵبەستبێژان».[71] زۆریش لەوەدا سەرکەوتوو بوو کە خۆی بێ ئەرکی ئەم و ئەو خۆی بەردەوام دەکرد. زاراوەی «ئیستیعماری نوێ»ـش خەریکە بارتاقەی ئەو بێت لە ڕووی وزەی بەردەوامییەوە. بەم جۆرە بازنەکە بەسەر خۆیدا دادەخرێت: شۆڕشی بەردەوام لە ژوورەوە و ئیستیعماری بەردەوام لە دەرەوە. بە خۆم نییە، ئەو فێڵەی لەو حاڵوبارەدا تێکۆشەر لە میللەتی خۆی دەکات گەمەی «چاوشارکێ» ـم بە بیردا دەهێنێتەوە، فێڵەکەش بێ کۆتایی و بێ پشووی حەسانەوەیە: ڕۆژووی بێفتارە.

کۆڵۆنیالیزم بە کۆن و نوێیەوە، لە مێشکی تێکۆشەر و ڕێژیمی شۆڕشگێڕ شوێنی شەیتانی ناو عەقیدەی ساغ و سەلیمی سەربە غەیبی گرتەوە تا بوو بە نەریتێکی سیاسەتی چەپ، چ پێوەندییەکی بە واقیعەوە نەما. وەک دیاریشە، بایی ئەوەی بوونی شتێک بە ڕاستیی زیندووی بەرهەستەوە نەبەسترابێتەوە دەوامیشی پەکی لەسەر شتێک ناکەوێت کە لە زیمنی ئەسڵە سەرچاوەکەی نەبێت، لێرەشدا سەرچاوە خەیاڵگەی تێکۆشەرانی چەپە (نەک حەقیقەتی واقیعی زەق). لەمەدا خەفەتێکی زل بۆ ڕەعیەی عالەمی سێیەم دەڕەخسێ: ئەو ڕەعیەتە چاو بەسەر تێری و ئەمینیدا هەڵناهێنێت بەرلەوەی ماوەیەکی درێژ ببرێت بەسەر شەقامی بێساختەی واقیعدا: چ ئومێدێکی نابێ نان لە هەنگوین و سەرتوێ هەڵکێشن بەر لەوەی قامووسە زلەکەی تەماوی و بەهەڵەبەری وشە بسڕێتەوە، ئەمیش مومکین نابێ هەتاکوو چەپایەتی دەست بەسەر شانۆی مێژووی سەردەم و دوارۆژدا بگرێت، دەست بەسەردا گرتنەکەش تەواو نابێ مەگەر بەرەی چەپ لە خۆوە واز لە نەریتی سیاسی خۆی بهێنێ بۆ ژیانێکی بێ «طقوس» و دارنینی بەرگی قودسییەت لە ئەدەبیات و دروشمەکان و مەفهوومەکانی بەڵکوو ببنە چشتی بەشەری کە هەڵەبوون هەڵدەگرێت

---

[71]– لە دەقە عەرەبییەکە «جماهیر الکادحین و المادحین» هاتووە، لە بەرانبەردا «زەحمەتکێش و هەڵبەستبێژ» هاتنە پێش.

و داوای ڕاستکردنەوەش دەکات: ئەگەر قبووڵ بکەین لە شاعیری میسری: لە ئاست کوژرانی بەرپرسێکی ئینگلیز، کە لە تۆڵەیدا سەدان هەزار «جنیە» لە خەڵکی میسر ستێنرا، بەم دێڕە شیعرە بڵێ:

قتل شخص فی غابة جريمة لا تغتفر
ونهب شعب امن مسألة فيها نظر

بەو پێیە، دەبێتە پێداویستێکی ئینسانی کە کوشتنی هەزاران کەس لە خەڵکی «حەما» بە دەستی هێزی ئەمنی سووریە تاوانبار بکرێت، هەر لە بیریشمانە، داگیرکەری فڕەنسەیی لەسەر تۆپبارانی شام و کوژرانی چەند کەسێک بە توندی تاوانبار کرا، ڕەنگە کوژرانی شام لە پەنجایەکی هی حەمای تێنەپەڕاندبێت.

بەڵێ دەبێ داگیرکەر وەک لێی دەوەشێتەوە ڕیسوا بکرێت، بەڵام ڕاستە و هەزار جاریش ڕاستە کوشتنی خەڵک و کاول کردنی ماڵەکەی نابێتە هەنگوین و شەکر هەر چونکە بە دەستی حکوومەتی خۆی ڕووی داوە، زوڵمیش هەر زوڵمە چ دوژمن بیکات چ دۆست. دە کەسی کوژراویش ئازاربەخشترە لە تاکێک، پیاوکوژەکە کێ دەبێ با ببێ. گەلان ڕانەمەڕ نین تا ئەگەر گورگ یەکێکی لێ خواردن مەینەت بێت و ئەگەر هەزاریشی لێ ڕۆیی بۆ بازاڕی گۆشت و بۆ سەربڕین ببێتە مامڵەتی سوودبەخش. لەلایەن دەلالەتەوە فەرقێک نییە لە نێوان کوژرانی کرێکارێک لە نمایشی بەسرەی ساڵی 1954 و دوای شۆڕشی تەمووز بوو بە هۆی ئیعدامی وەزیرێکی[72] سەردەمی ملووکیەت و لە نێوان داپەڵۆسینی کۆمەڵێک کرێکاری جگەرە پاش دوو ساڵ[73] لە بەرپابوونی شۆڕش. ئەگەر فەرقیش هەبێ لە دوو لایەنەوەیە: یەکیان ئەوەیە، شۆڕش بەرپا بوو هەتا کرێکار لە بری داواکردنی «ماف» نەکوژرێت نەک خوێنی پاماڵ بێت. دووەمیان ئەوەیە، کوژرانی کرێکارێک کەمتر تاوانبارە لە کوشتنی کۆمەڵێ کرێکاران. فەرقێکی بەرحیسابیش لەوەدایە کە حاڵوباری نمایشت پتری بە بەرەوەیە قوربانی تێدا بێت لەچاو حاڵەتی مانگرتن لە چوار دیوارەی مەعمەلدا.

---

[72]- وەزیرەکە مەرحووم سەعید قەزاز بوو.

[73]- ڕاسترە بڵێین: دەوری دوو ساڵ.

من نامەوێ لە خۆڕایی شتێکی نارەوای بەر لە شۆڕش بڕەهێنم. من دەمەوێ وێنەیەکی خۆڕهاندنی چەپ کە لە شۆڕشی فرەنسەوە برەوی ستاند بهێنمە بەرچاو، دەرگاکەشی وەها کرایەوە لە سنووری مەعقوول و نامەعقوولی تێپەڕاند تا گەییشتە ڕەوادیتنی برادەری بەرەی یکگرتووی دوێنێ و، ئنجا، لەناوبردنی دۆستی ئەمرۆکەش بە بەهانەی حازربەدەست کە هەرە شیرنی تاڵە و هەرە جوانی نافرەجایە.

جلک هەڵخستن لەسەر ڕستی ئیستیعمار، یاخود غەیری ئەو جگە لەوەی نیشانەی کاڵوکرچیی هۆشی سیاسییە، زینهارێکیشە بۆ کوتەکوتی میللەتان بەسەر ڕێگوزەری مێژوودا، کە بیدەیتە بەر لێکدانەوەیەکی بەدیهیش، وەک ئەوەیە بڕیار بدەیت زەمان لە شەستەکانەوە بێ جوولە وەستابێت، چونکە ئەو ساڵانە دوایین تەمەنی ئیستیعمار بوون. ڕاستییەکەی دەشێ شەڕی دووەم دابنرێ بەو دوایینە چونکە مەعلووم بوو ئیستیعماری فرەنسەیی، پاش دۆڕاندنی شەڕی 1940، ئەستێرەی لە ئاوابوونی بێ دەمەتەقەدایە، ئیستیعماری بریتانیش بەبەریەوە نەما خۆ بسەپێنێ بەسەر کشەیەکی زلی وەکوو هینددا، لێکتر دووری موستەعمەرەکانیشی لە ڕۆژگاری وەها بێئۆقرەدا، زۆر نابات، گیانی گەلی بریتانیا دەکێشێت کە خۆی کەنفتی شەڕ بوو.

بەو پێیە ساڵەکانی دوای شەڕ پشووی ڕوحکێشانی ئەو ئیستیعمارە بوو کە تا ئەوان نزیکانەش ڕۆژ ئاوا نەدەبوو لە خاکی. شەڕی «عدوان ثلاثي» ش بوو بە ئاخر پڵتەی چراکەی کە هەرگیز هەڵنەبۆوە. هەرچی دەوڵەتەکانی «محور» بوون دۆڕاندنی شەڕیان لزومی نەهێڵشت باسی بەسەرچوونی دەسەڵاتیان بکەین. لەگەڵ ئەمەشدا دەشێ لە شێوەی لێکدانەوە بڵێین، لەوانەبوو ئیستیعمار ماوەیەکی دیکەش بژیت ئەگەر میحورەیەکان شەڕیان لە ڕۆژئاوا و لە ڕۆژهەڵات (ڕووسیا) بردبایەوە چونکە هەموو سەرکەوتنێکی زل تایبەتە، تەوژمێکی هەیە تەمەنی سەرکەوتوو درێژ دەکاتەوە چ جایی سەرکەوتنی دەوڵەتی تازە تەمەنی گەرموگوڕ و ئیشتیها ساف، بە دوایانەوە ئاپۆرەی حەپەساوی قارەمانەتی ورووژاو هەن کە داغداریشن لە تێشکاوەکان.

کەسیش نازانێ شکڵی دنیا لە سێبەری سەرکەوتنی میحوەردا چۆن دەبوو یان کەنگی تەقەڵی دروومان نێوان دەوڵەتەکانی هەڵدەوەشایەوە و چەرخی ڕق و بێئۆقرەیی سەرجەمی مرۆڤایەتی چۆناوچۆنی بەسەر تازە میراتگراندا دەسووڕایەوە. بەهەمەحاڵ مێژوو خەڵکی حەساندەوە لە ئەزبەر کردنی ڕووپەڕەیەکی نوێ لە داستانی گەلان کە

بە خۆیان و غەیرەوە خەریکن، واش دێتە دڵەوە کە تەجرەبەی ژێردەستان لەگەڵ فاشیزم بە ئەرکتر دەبوو.

سەرلەبەری ئەو قسانەش جۆرێکە لە ئەستێرەخوێنی و بەردی ڕەشاوێژ[74] هەرچەند لەسەر بنگەی لەباری پێوانە و ئاکامگری[75] هەڵنراوون. هەرچۆنێک بێت وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە دوای شەڕەوە بوو بە هێزی هەرەزلی ئابووری و سیاسی کە شوێنی تۆقەڵەی گرتەوە لە نێوان ئەو دەوڵەتانەی پێڕەوی ڕێژیمی ئازادی هەوڵی تاکیان کرد لە جغزی ئەو پێداویستە ناچارییانەی کە مۆرکی خۆیان لە چەندوچۆنیی ئەو ئازادییە دەدەن. لە بەرانبەردا هێزە زلەکەی تر، ڕووسیای سۆڤێتی، وەک دەستە تەرازووی لەنگەرڕاگر وەستا، کە لە بنەڕەتدا لە مەفهوومی «نقض»ی سەرلەبەری سیاسەت و ئابووری و بیروباوەڕێکی لە جیهاندا بەبرەو بوو، بەڵام ئەویش بە نۆرەی خۆی سەری شۆڕ کرد بۆ زەروورەت بە پێچەوانەی مەنتیقی پەیدابوونی لە ساڵی 1917 چونکە هەرگیز حاڵوباری مرۆ هەر لە عەقیدەوە هەتا گەپی منداڵ بە تەنها دوو ڕەنگی «ڕەش و سپی» ڕەنگ نەکراوە و ناکرێ، با مرۆی قیچکەتەنگ و سەرسەختیش جۆرێکی دیکە بیر بکاتەوە.

USA ئەلاسکا-ی هەیە دراوخریدەیە لە ڕووسیای دەمی قەیسەرەوە، هەوەهاش چەند زەویەکی دیکەی کڕیارییە، بەڵام بە سەروەتە بێسنوورەکەی باشترین بەهانەی داوە بۆ ساختەگەری لە هەڵنانی زاراوەی ئیستیعماری نوێ، خۆیشی لە سیاسەتدا هێندە گێلە فاکتەرێکی ڕەخساند بە پاڵپشت بۆ زاراوەکە تا بە گەرموگوڕی و بە تاموشامەوە لە دەست و زاراندا بەردەوام بێت تا ئەوەی کۆنە وەزیرێکی کاروباری دەرەوەی ئەمەریکا «دین ئەچیسن» Dean Acheson لە کتێبی Power and Diplomacy دەڵێ موشکیلەی ڕۆژئاواییەکان لەوەدایە کە ئەمەریکا هێزی هەیە و نەشارەزایە بریتانیاش شارەزایە و بێهێزە ئەم قسانەش سەرلەبەری پەراوێزن بە دەوری ڕاستییەکی گرنگی سەربە ئیستیعماری نوێ کە لە گۆشەی حەقیقەتی بێلایەن و گۆشەی بەرژەوەندی جیهانی سێیەمەوە سەیر بکرێت: نە نهێنییەک ئاشکرا دەکەم و نە گوناهیش بە ئەستۆوە

---

[74]- ڕەشاوێژ: نیشانە لە تاریکایی گرتن کە دەکاتە وەهمی شەو.

[75]- ئاکامگری: استنتاج.

دەگرم کە بڵێم ئەم ئیستیعمارە نوێیە بەلای زۆرینەی وڵاتانی ئەورووپای ڕۆژهەڵاتەوە خۆشەویسترە لە حوکمی ڕووسەکان چونکە کێشەیان لەگەڵ یەکیەتی سۆڤیتدا تێهەڵکێش بووە مێژووشیان لە سەرچاوەی دڕدۆنگی نەک دۆستایەتی لەگەڵ ڕووسانەوە سەرەژێر بۆتەوە.

لە جیهانی سێیەمیشدا بارەکە پێچەوانەیە چونکە کێشەیان لەگەڵ ڕووسدا نییە بەڵکوو لەوەدا کە ڕووس هێزی لەنگەرڕاگرە بەرانبەر هێزی ڕۆژاوا، دەرفەتی هەناسە و یاریدەی دۆستێک دەبینن بۆ بزووتنەوە و مناوەرە و مامەلە کردن لە ئاست کێشەی دێرینیان لەگەڵ ڕۆژاوادا، لزومیش نییە بەبەر وردیاتی ئەم خەریتەیەوە بنیشم لە ڕوودانی شتێک کە لە قاعیدەکە دەردەچێت و دڵشکستەییەکی چاوەڕوان نەکراوی لێ پەیدا بێت (بۆ دۆست) ئیتر بە کورتی دەڵێم ئەگەر فەرمانی سەرلەبەری واقیعی هەردوو مەیدانان نەبێت نەتدەدیت باتریس لۆمۆمبا وا بێباکانە مەتڵەبێکی زەحمەت بە زێدە ئاسان دابنێت ئەگەر تامەزرۆ نەبووایە بۆ دەرچوون لە هەموو بەندێک و بۆ کڕینەوەی کەرامەت بە وەشاندنی دوو زللە لە بری زللەیەک، نەشتدەیت میللەتی پۆڵۆنیا دوای ئیعلانی ئیلحاد و دەسەڵاتی کۆمیونیزمی دۆست بە ڕووس، سەجدە بۆ پاپا ببات. ئنجا ئەگەر ماجەرایساڵی 1956 لە «عدوان ثلاثي» لەلایەن ڕۆژاواوە بۆ سەر میسر و داگیر کردنی مەجەر لە لایەن ڕووسەوە بخەیتە سەر ئەم نموونانە دەشێ وێنەیەکی بێلایەن و دڕدۆنگی نەخشەکێش بکەین بۆ تێکەڵبوونی فاکتەری زاتی لەگەڵ فاکتەری بابەتەکی لە سازدانی بیروڕادا: هەرچی جیهانی سێیەم بوو، یەک دەنگ، پڕکێشە سێ قۆڵیەکەیان تاوانبار دەکرد کەچی زۆر دەنگی تێدا بەرز دەبۆوە بۆ ڕەهاندنی ماجەرای مەجەر، لە هەموو ئەورووپای ڕۆژهەڵاتیشدا دەرفەت نەبوو تاکە دەنگ دەرچێت مەگەر دەنگی ڕەسمی کە دەستی بەسەر هەموو وەسیلەی ڕاگەیاندندا گرتووە. مایەوە ئەو بێئۆقرەییە کە بە خەڵکەوە دیار بوو، ئەویش بە حوکمی یاسا و دەسەڵاتی جیهازی ئەمن خەفە کرابوو.

تاوانباری کردنی بێگانە، چ پێی بگوترێ ئیستیعماری نوێ یاخود تەماعکار و بەهەڵەبەر، لەو ڕووداوانەی دەکەونە پەراوێزی ئیرادەی جیهان سێیەمەوە، ئەو تاوانبار کردنە ڕاست و ڕەوایە ئەگەر بەکارهاتبێت لە ڕووداوی واقیعی هەڵنەبەستراو،

دەشبێتە خۆگومڕا کردن، بە زۆریش ڕوو دەدات، ئەگەر بۆ ڕەهاندنی هۆکاریی تێشکانی خۆی بێت.

لێرەدا زەرەر ناکەین ئەگەر بیبیلەی چاو بکەینەوە بایی دیتن لە تاریکاییدا چونکە تەمی خۆڕەهاندن و تاوانبار کردنی غەیر لەوانەیە ڕوونبینی بە چاوی عادەتی تێیدا بە زەحمەت بکەوێ، ئنجا بۆ ئەوەی لە مامڵەتی سیاسی و ئابووری وەیا هەر مەیدانێکی دیکە بێ، کە مرۆ تێیدا بە مرۆ دەگات، چاو دروست و ڕوون بێ، پێویستە بینەر کە خۆی تەرەفدار یاخود پێوەندار بوو لە هەر مامڵەیەکدا، خۆی بخاتە شوێنی لایەنەکەی دیکە تا بزانی لەو بارەدا چی دەکرد. دەشێ لەو پێوەرەدا[76] ڕەفتاری لایەنەکەی دیکە عادەتی و مەقبوولی بزانێ، بگرە لە مەقبوول بەولاوە بۆ سەخاوەت و زێدە ڕاستییەوەی ببات لەچاو ئەوەی خۆی لە هەمان زەرفدا بیکات، گومانیش لەوەدا نییە کە ڕەفتاری مرۆ بە پێی پلەی ژیاری مەقبووڵ دەبێت چونکە ماوەی سەد ساڵ لە تەمەنی خۆی و باوک و باپیری ئۆگرگرتووی ڕەفتارێک دەبێ پێوەری ژیار دەیسەلمێنێ، بێ هەناسەسواری، وەک کە شارنشین لەچاو گوندنشینی وڵاتی خۆمان پتر لە خەمی پاگژیی ماڵەکەی دەبێت یاخود شاردنەوەی داهات بە نیازی کەم کردنەوەیی داهاتانە[77] کارێکی زێدە دەگمەنە لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا کەچی لە جیهانی سێیەم بەرتیلیشی بۆ بەکاردێت.

ئەوانەی گلەیی دەکەن لە دەوڵەتەکانی باکوور کە سەخی نین لەگەڵ دەوڵەتەکانی باشوور با بیر بکەنەوە لە دەوڵەتە نەوتاویەکان کە زۆربەیان سەربە جیهانی سێیەمن هەرگیز هەژاریی برسییەکانیان تێنەخوێندۆتەوە کە هەلپەرستانە نرخی بەرمیلێک نەوتیان گەیاندە سی دۆلار و پتریش، بەڵام پێوانەیەکی لەوە وردتر هەیە بۆ نرخاندنی هەڵوەست لە چەند مەیدانێکی یەک وڵاتدا: بە پێی دواکەوتوویی، هەستی بەرپرسایەتی تێیدا سڕ دەبێ... لایەنگری و نەیاری دەبێتە دەستوورێکی گشتی تا ئەوەی سەرۆکی یەک لەوە دەوڵەتانە لە بارەی برەوستاندنی بەرتیل تێیدا قسەی لەگەڵدا کرا تا ئەوەی گوترا دیپلۆماسیشی گرتۆتەوە، لە وەرامدا گوتبووی: ئاگادارم

[76]- پێوەر: معیار، مقیاس . بڕوانە: گۆڤاری سروە، ژمارە 71 لاپەڕە 74 دێڕی شەشەم.

[77]- داهاتانە: ضریبة الدخل، وەک مانگانە، ڕەزانە، ئەملاکانە.

بەڵام لێی بە دەنگ نایەم چونکە ئەوتۆیی ئیش بێتەگەرەتر دەڕوات… سەیری مامەلە کردنی سیاسییەکانی ئەو وڵاتە دواکەوتووانە بکە لەگەڵ یەکتردا و لیستە بگرەوە بە ژمارەی ئینقلاب و یاغیبوونی تێشکاو و سەرکەوتوو کە وەک قەزای ناگەهان بەسەر ڕەعیەدا دەبارێت… چاوێک ببڕە یەکیەتیی ئەفەریقا، بە ڕوحکێشان بەرنامەی کۆبونەوەیان ئیمزا دەکرێ… سەیروسەمەرە دەبیەن لە دابەشینی شەیتانانەی ئەو خێر و سەدەقەی لە دەوڵەتە تێرەکانەوە بۆ وڵاتی قاتی تێکەوتوو دەچێت و دەبێتە تاڵان (بۆ زۆرداران) تا ئەوەی لە حاڵەتی مەیلەو چاکدا پاروو ناگاتە دەمی برسی بێ ئەوەی نرخێکی لە بیروڕا و پاشماوەیەکی مرۆڤایەتییەکەی ژمارد بێ.

ئادەمیزادی جیهانی سێیەم لەوەتەی پێنج هەزار ساڵەوە دەلەرزێ لە ترسی پۆلیس و هەر کەسێکی ئەستێرە و نیشان بەسەر سینگ و دوو شانیەوە بریقەی بێت. هەر لە بوونی هەتا مردنی، پێشەکی، لە لایەن حکوومەتەوە داغی خیانەتی لێ دراوە، بەو داغەوە دەچێتەوە پزدانی دایکی نیشتمان. بە هەموو عومرم تەجرەبەی هۆش کرایەوەم ئەوە بووە کە سەربە دایەرەیەکی حکومەتدا نەگرم ئەگەر دۆستێکم تێدا شک نەبردبێت بمپارێزێ لەو تەرزە هەڵکەوتانەی بە عادەت دێنە بەر «موراجیع» و ماف و ئەرک و حورمەتیان تێدا پاماڵ دەبێ چونکە دەزانم، وەک هاونیشتمانی، چەند بێدەسەڵاتم… چ دەسبەتاڵێکم لە هێزی قانوونێک پێوەی ڕووبەڕووی بچووکترین مەئموور و پۆلیسێکی پێپلیکەی هەرەژێر کە بیەوێ مەزاق وەیا خۆ نەناس بکات و ناز و فیز بفرۆشێت.

پێی ناوێ بڵێم، هەر پێکەوتنەوەیەک لە نێوان موراجیع و مەئمووردا ڕوو بدات سەد جار لەسەر موراجیع حیساب دەکرێ بە دەستدرێژی لە مەئمووری دەمی دەوامی ڕەسمی بەر لەوەی یەک جار لەسەر مەئموور حیساب بکرێت بە دەرچوون لە سنووری دەسەڵاتی قانوونی. قسەش لەم بووارەوە بە پانایی جیهانی سێیەم درێژخایێنی بێکۆتاییە، نووسەریش چەندێکی لە هێزی ڕەوانبێژی و قەشەنگی شێوازەکەی ڕاببینێت ڕێ بە قەڵەمەکەی نادات پێمەلە لە وێنە هەرە دزێوەکانی دەعیە، لە لایەکەوە و سەرکزەڵەییش لە لایەکی دیکەوە بکات لەو جیهانی پان و نەخۆشی «سێیەم» ـدا، عەرەب گوتەنی «اللبیب تکفیه الاشارة - ئەوەی کەسە ئەلفێکی بەسە»:

فکان ما کان مما لست اذکره
فظن خیرا ولا تسأل عن الخبر

«چی بوو بوو لەوەی نایەتە گوتن
گومانپاک بە و لێ مەپرسەوە»

جۆرەها لەوجەڕی و کەودەنی فشهەڵمانی کەرانە و شێتانەی کە لە هەموو ڕێکارێکی جیهانی سێیەمماندا دەقەومێت لەو بابەتە سووک و چرووکانەیە کە هەر لەو تەبیاتانە زەنە دەکەن پێی ڕاهاتوون و ئۆگریان پێوەی گرتووە، هیچ مومکین نییە ئیستیعمار لە بنی دنیاوە بار و بینگە هەڵبەستێت بۆ ساختەکاریی ئەوتۆ هێند ڕەجاڵ و چەپەڵە هەرچی پلانی ئەو خەڵقەی جیهازی زانستی نوێ بەکاردەهێنن لە «ناوتوێژبینی»[78] و ڕێنموونی ڕێکخستن، هەمووی پەکخستە دەکات و ناشێ لەگەڵ «عیدی ئەمین» ـێکدا تێک بگەن، ئنجا ئێمە کە دێین شڵەژانی پێوەندیی نێوان دوو حیزب و دوو لایەن و دوو دەوڵەت لەسەر کەمچیزەترین شتێک وەپاڵ فێڵی ئیستیعمار و خیتخیتەی بێگانە دەدەین لەوەدا خاتری خۆمان دەگرین وەک بڵێی ئێمە حۆجە بین یەکێک بێ خرتوپرت بهاوێتە دڵمانەوە هەستی زگماکان گومڕا بکات هەتا دەست بدەینە کاری هەرە گڵاو و هەرە دوور لە مرۆڤایەتی و هەرە بەتاڵ لە سوود و بەرژەوەند.

قسە ڕۆیشتووانی جیهانی سێیەم لەوەتەی هەن قاڵبیان بەستوو بە خەفە کردنی دەنگی بەرهەڵستی کردن لە کرداریان یاخود دەنگی داوا کردنی قانوونی دادگوزار ئیتر چ پێویست هەیە بێگانە بێت و جیهانەکەمان فێری فەندی خەفە کردن و ساختەکاری بکات بە نیازی هەڵنانی دنیایەک ورتەی ناڕەزامەندیی لێوە نەیەت؟ ئێمە تا ڕادەی خنکان وەتەنگ دێین کە دەبینین میللەتان هەن بەسەر ڕووی زەویەوە مافی خۆ ڕوونکردنەوەیان هەیە، خۆ ئەگەر دەستمان بیانگەییشتبایە هەناسەمان لێ دەبڕین.

---

[78]- ناوتوێژبینی: استکناه، وشەی «ناوەڕۆکبینی»ـش دەست دەدات بۆ ئەو واتایە.

ڕۆژنامە و کروتەونی[79] بڵاوکردنەوەکانمان لێ دادەخستن و دڵ هۆشیانمان پاک دەشووشتەوە لە مەیلی ئازادی و سووربوون لەسەری نەکا پرووشکێک پێیانەوە بۆمان بپەڕێتەوە هەندێک پووش و پەڵاشی ڕەق هەڵاتنمان بەسەر چپاندن و مەنع کردن و بێ بەش کردن بە دەورمانەوە بسووتێنێ.

سەیر نییە ئەگەر حیکایەتی ئازادی لە جیهانی سێیەم ببێتە مەینەتیی ژیانی لە سەردەمی کارەبا و ئاتۆم و ئاسمانگەردی، چونکە لەم ڕۆژگارە تازانەدا گوێبیست بوو دنیا شتێکی تێدایە پێ دەڵێن ئازادیی ڕەفتار و ئازادییخواز و ئازادیی ڕەفز کە پێشتر خەبەری لێی نەبوو، وێنەیەکی لە زەینیدا نەقشی نەبەستبوو، خەریکیش نەبوو لە نوێوە دایبهێنێ هەتا بەر لە دووسەد ساڵێک، بەتایبەتی لە شۆڕشی فڕەنسەوە، مەفهوومەکانیان بە دنیادا بڵاوبۆوە، جووڵەشیان بەرەو هەرێمی جیهانی سێیەم کز و تەنبەڵ بوو. زەمانەها وەخرا بەر لەوەی ترووسکەی بچێتە هۆشی کەمینەی «ڕۆشنبیر»ی زێدە دەگمەنی هەرە بژاردەکان. قەتیش نەلوا ببێتە زادێکی هۆشەکیی ئاپۆرەی خەڵک.

ئازادی، بە مەفهوومی نوێ، ڕەگی نییە لە جیهانی سێیەمدا: هەرگیز ڕێژیمێکی تێدا پەیدا نەبوو بە دەم ڕۆژگارەوە و لە چارچێوەی بەرنامە و قانووندا ویستبێتی پەی ببا بە ئارەزۆ و بیروڕای ڕەعیەت لە هیچ کاروبارێکدا، چ بچووکی چ زلی. کەسیش لەو خەڵکەی بیری نەکردۆتەوە لە دۆزینەوەی وەسیلەیەک بۆ بڵاوکردنەوەی بیروڕا خەڵکەکە خۆیشی لە بارێکی کۆمەڵایەتی وەهادا نەبوو بیخاتە سەر تێفکرین لە «ئازادی - لیبەڕالیزم» تا ئەگەر بڵیمەتێک پێشنیازی بەکارهێنانی ئازادیی تازەبابەتی بۆ کردبانایە پێوەی دەحەپەسان.

لێرەدا بواری قسە دەرفەت نادا بەبەر شیتەڵ کردنی واقیعی مێژوویی ئەورووپاوە بنیشین کە وێنە مرۆی وەک مۆنتسیکیۆ و ڤۆلتێر و ڕووسۆی کردە داواکاری فەلسەفەی سیاسی و کۆمەڵایەتی ئەوتۆ بوون بەسەرچاوەی ئەندێشە لە بەرپابوونی

---

[79]- کروتەون: ساختار، ساختارمان: گۆڤاری «سروە»ی هێما بۆ کراو دێڕی 13 ستوونی دووەم.

شۆڕشی فرەنسە[80] ئنجا لە ڕێی قیاسەوە تێبگەین بۆچی ڕۆژهەڵات کەسی وەک ئەوانی نەهێنا و پێیان ئاووس نەبوو، هەر ئەوەندەی تێدا بە کافی دەزانم کە بڵێم ئەوپەڕی تەما و ئومێدی جیهانی سێیەم بە داد و ئەمان هەر ئەوە بوو کە حاکم و دەسەڵاتدار پێڕەوی لە قانوونی ئاسمانی و مرۆساز بکەن، ببڕای ببڕای ڕێکخراوی حیزبی ئەوتۆی تێدا نەڕەخسا لەسەر بنەمای باوەڕی سیاسی دنیایی خەڵکێک کۆ بکاتەوە هاوبیر بن لەوەی پێی دەڵێن بەرژەوەند.

قسەش لەو بابەتەوە بێ کۆتاییە، پێویست نابینم بچمە ناو دەراوی سەرهەڵدانی بزووتنەوەی وەک باطنی و خوڕەمی کە بە ڕوواڵەت شێوەیەکی وەک ڕێکخراوی حیزبیی ئەورووپایان پێوەیە، هەر ئەوەندەیان تێدا دەڵێم کە ئەم بزووتنەوانە حاڵوباری تایبەت بە خۆیانەوەیان هەبوو چ پێوەندییان نەبوو بە باوەڕی سیاسی دەرگە لە ڕووی «تاک» بکاتەوە تا دەرباز بێ لەو کۆت و بەندەی دوور لە قەناعەتیەوە بە سەریدا دەسەپا.

لە هەموو مێژووی کۆندا جیهانی سێیەم ئاشنا نەبوو لەگەڵ بانگەوازێک سوور بێ لەسەر ئازادیی بیروباوەڕ، هەرگیزیش دەنگێکی نەبیست بۆ گۆڕینی حکوومەت لە ڕێی «استفتا»ەوە. لەمانە تێدەپەڕم سەبەب بە تەنگەبەری دەرفەت و دەڵێم: گەلانی جیهانی سێیەم لە سەردەمی کارەبا و ئاتۆمدا تووشی خەفەتی نەبوونی ئازادی هات بێ ئەوەی پاشخانێکی مێژوویی لە بەکارهێنانی ئازادی هەبێت بە جۆرێک لێی بوەشێتەوە بەرنامەیەکی پاراستنی بۆ نەخشەکێش بکات، چ بیروباوەڕێکی سەربە دیمۆکراسی و ئازادیی سیاسییەوە هەبێت لەگەڵ ئیستیعماری ئەورووپادا بۆی هات، فەرقێکی ئەوتۆش نابینین لە نێوان وەرگرتنی ئەو بیروباوەڕانە و لە بەخێرهێنانی گەڕۆک و

---

[80]- ئەورووپای 1789 لە بەتاڵییەوە فکری گۆڕانکاری و شۆڕشی بەسەردا نەباری: سێ سەد ساڵێک بەسەر کۆپەرنیکۆس و سووڕانەوەی ئەرزییەوە تێپەڕیبوو، کەچی خۆم لە سەرەتاکانی هۆشکرانەوەمدا بیروڕای ئەوتۆم خوێندەوە کەسێکی باوەڕ بە خڕیەتیی ئەرز نەک بزووتنی بهێنێت، کافرە. ئەورووپا لە هونەر و سنعەت و زانست و ئابووری و هەموو جۆرە مەعفیرەتێکدا بە قۆناغ پێش ڕۆژهەڵات کەوتبۆوە. ڕەوی ناپۆلیۆن بۆ سەر میسر فکر و زانستی لەگەڵ خۆیدا برد. هیرۆگلێفیشی بۆ میسر خوێندەوە... ئەورووپای بەر لە سەد دووسەد ساڵ دەستی کرد بە هەڵێنانی مەتەڵی پێنج هەزار ساڵەی مێژووی ڕۆژهەڵات... هتد.

فرۆک لەو ڕووەوە لە ڕەفتاری لەگەڵ هەردوویاندا تا بڵێی بە دریغ و نا بەدڵ بوو. لەوەشدا تێبینی دەکرێ کە سواربوونی شەمەندەفەر ئاسانترە لە دانیشتن بە دەوری مێزی خواردەمەنییەوە بە خۆی و بە ئاداب و بە نەریتیەوە، ئەمیشیان ئاسانترە تا گونجان لەگەڵ فکر و ڕاهاتن لە خووگرتن بە سیفەتی چاولێکەرانە هەتا بە لایەوە وەک سیفەت و غەریزەی زگماک ئاسان دەبێ.

دەبینین ڕۆژهەڵاتی کە تەقلیدی ڕۆژاوایی دەکات لە حیزبایەتی و بانگەوازی ئازادی و مافێکی لێیانەوە بۆی دەکەوێتەوە و بەرپرسایەتیەکی دەیخەنە ئەستۆیەوە تا بڵێی سەغڵەت دەبێ بە دەست گونجاندنی ئارەزووە دەروونیەکانی کە بە ئەسڵ ئەو جۆرە ئیلتیزامەیان تێدا نییە لەگەڵ پێداویستییەکانی حیزبایەتی و لیبەڕالیزم و ئازادی کە مرۆ بە پێی قاڵبی خۆی قاڵبیان دەدات. وەک کەسێکی تەنگ هەڵبێت بە جلکێکی تەسک و ترووسک.

بۆ زێدە ڕوون کردنەوە دەڵێم بە دەگمەنێکی دەگمەن دیتوومە فەرمانبەرێکی ڕۆژهەڵاتی خەیاڵی کردبێتەوە لەوەدا بە پێی داخوازیی قانوون و کۆمەڵایەتیی پەسەند فەرمانی سەرشانی جێبەجێ بکات. لە باشترین حاڵدا وەزیفە [بەلای ڕۆژهەڵاتییەوە] هۆی بژێوێکی حەڵاڵە، بە پێی عادەتیش دەرگایەکی فەڕاحی گردوکۆیە لەسەر حیسابی موراجیعان، ئەمما وەزیفە بە لای ڕۆژهەڵاتییەوە ئاوێتەیەک بێ لە داهاتی حەڵاڵ و خزمەتی کۆمەڵ، شتێکە ئەگەر یەکجارەکیش نامەوجوود نەبێ، بێگومان لە ئیکسیر دەگمەنترە.

ئەگەر ڕوونکردنەوەی تەسەلترت دەوێ واز لە وەزیفە و حیزبایەتی و جانفیدایی بۆ ئازادی دەهێنم و بەقاڵێکی عێراقی بە بەقاڵێکی دانمارکی دەگرم کە کەسبیان هەوڵێکی زاتییە بۆ بەرژەوەندێکی زاتی پەکی لەسەر تانووت لە خۆدان و نەفس کەپ کردن و حەز کوشتن نەکەوتووە هەتا تێیدا دەستخاوێن بێ. دەبینی فەرق لە نێوانیاندا دەگاتە پلەی شێوەن بۆ کردن، ناشچمە بن باری وردیاتی ئەو فەڕقەوە بەڵکوو شاڵڵا بە ڕێکەوت سەردانێکی ئەو وڵاتە دەکەیت و دەبینی فەرقی نێوان تاریکی و ڕووناکی، جوانی و دزێوی چەند و چۆنە. ئنجا ئەگەر جیهانی سێیەم لە پێوانەدا گوێ نەداتە کیلۆ و حوقە و دڵیشی نەکرابێتەوە بۆ وەزیفەی بێ خوارەکە و خێچکە، تۆ بڵێ ئەو ئازادییە و لیبەڕالیزمە و حیزبایەتییە بە لایەوە چەند پاک و پیرۆز بێ تا خۆی تێدا

شەهید بکات و ببێتە مۆم بۆ غەیر شۆق بداتەوە. ئایا دەشێ لە کێشی کاڵەک بدزم و لە لیبەڕالیزمدا هەڵبژێرێک و بژاردەیەک و ناوناوەش، وەزیرێکی ڕاست و درووست بم؟ یاخود لە خۆوە واز دەهێنم لە یەکەمینایەتی و سەرۆکایەتی حیزب و حکوومەت، منێکی ڕاهاتووبم لە دزینی دە گرام کاڵەک کە بۆ کڕیاری هەڵدەکێشم؟ «هيهات هيهات لما توعدون».[81]

هەرچۆنێک بێت و بێ قووڵبوونەوە لە هۆی دیاردەی سەلبی لەعادەتبەدەری خووە کۆمەڵایەتییەکانی جیهانی سێیەم دەشێ سادە و ساکار وەک سادەیی ئەو حەقیقەتەی لێی دەدوێم بڵێم گەلانی جیهانەکەمان لە کۆندا هەستی نەکردووە بە نەبوونی ئازادی هەتا ڕۆژگارانی نوێ چونکە فکرەی ئازادییەکە پەیدا نەبوو بوو[82] تا ئەگەر بەر لە دووسەد ساڵێک داوات لە خەڵکی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بکردایە ئازادیی سیاسی خۆیان بەکار بهێنن لە کاروباری عومیدا لێت وڕ دەبوون چونکە داواکەت چ مەعنای نەدەبەخشی لەبەر نەبوونی چ مەیدانێک ئازادیی ئیرادەی تێدا بەکار بهێنرێت، هیچ تاکیان خەیاڵی واتای ئازادییان بە بیردا نەدەهات مەگەر ئەو واتا عەکسییەی لە کۆیلەیی بەدەر دەداتەوە تا ئەوەی قسە گەشەکەی خەلیفەی دووەم (عمر بن الخطاب): چۆن خەڵکتان کردە کۆیلە کە دایکەکانیان بە ئازادی هێناویاننەتە دنیا؟ ئا ئەم گوتەیە بە ئازاد کردنی عەبد لە عەبدایەتی دەبڕایەوە.

لە سەرەتاکانی عومرمدا هەرێمی بەرینم لەم عێراقە دەدیت هەستی بە ڕۆژنامە نەدەکرد وەک بەو قەسەڵەی دەکرد کە بزنەکەی پێی دەلەوەڕا، شاریشم دەدیت نەیدەپرسی جەریدە هاتووە یا نەهاتووە باکیشی نەبوو بەوەی لە بەغدا ڕوو دەدات. بوون و نەبوونی پەرلەمانیشی بەلاوە وەک یەک بوو. زۆر قەزا لە مانگ و دوو مانگدا جەریدەیەکی نەدەخوێندەوە و زۆربەی خەڵک ناشناسی هەواری «صحافة» بوون تا ئەگەر ڕۆژنامەیەکت دابانی لێیان وەرنەدەگرتیت چونکە خوێندەوار نەبوون، ئەگەر بۆت خوێندبانەوە تێی نەدەگەیشتن، بۆت شەرح دابان گوێیان پێی نەدەبزووت، ڕۆژنامەگەری و ڕۆشنبیری لە ژیانی واندا، بە تێکڕایی، وەک دوان لە بارەی

---

[81]- ئایەتێکی پیرۆزی قورئانە لە مژدە و هەڕەشەی سەربە قیامەت.

[82]- زەمینەی پەیدابوونیشی پەیدا نەبوو.

شانۆگەرییەوە ئەنتیکە بوو کە هەرگیز لە هەرێمیاندا نەزابوو. دەیان هەزاری ئەو خەڵکە سبەینان خەبەریان دەبۆوە و بە ڕۆژ خەریکی گوزەران دەبوون و سەر لە ئێوارەی شەودا دەخزانە خەوگەکانیانەوە بێ ئەوەی ببڕای ببڕای تووشی شتێک بێن مەفهوومی ئازادییان لە لا بە خەبەر بهێنێ یا خەیاڵیش بێت.

بەڵێ ڕاستە تا بڵێی نەداربوون و ئەرکی قورسی کێشەی ژیانیان هەڵدەگرت بەڵام تا بڵێی دوور لە فکرەی لیبەڕالیزم و چی لەو بابەتە بێت، گومان نابەم تا ئێستاکەش بە ڕوونی زانیبێتی پێوەندایەتی خۆراکی و چارەنووسی ژیانی دوارۆژی منداڵانی بە هەڵبژاردن و ملانێی لایەنە جوداکان لەسەر حوکم چییە... ئەوسا هەرچەند نەیدەزانی سیاسەت مانای چییە ئەمما هەر کارێکی حکوومەتی گۆڕانێکی بەسەر دەقی ژیانیدا هێنابایە بە لایەوە لە حەرام حەرامتر بوو چونکە لێی سوور بوو هەرچی حکوومەت داوای بکات ناشێ بەرژەوەندێکی گشتی پێوە بێت.

ئەمە بوو وێنەی تابلۆی کۆمەڵایەتی سیاسی کە خەڵک لە سێبەریدا دەژیا ڕۆژێکی چاوی بینام لە دنیا هەڵێنا، بێگومان لە ڕابوردوودا تاریکتریش بووە کە لزوم ناهێڵێ قسە بکەین لە شیفتەیی باپیرە کۆنەکانمان بۆ ئازادی بەو مانایەی ئێمڕۆ تێی دەگەین. ئەوپەڕی ئومێدیان ئەوە بوو حاکمێکی دادپەروەریان هەبێ لە خۆوە بڕیاری عادلانە بدات بەو پێیە مەسەلەی ئازادی پاش بەربڵاوبوونی قسە لێوەکردنی، نەک پێشتر، بوو بە مەینەتی جیهانی سێیەم، کە بووش بە مەینەت ڕۆژگارەها تێپەڕی هەر مایەوە بە خەفەتی ئەو بژاردانەی لە قووڵایی و لە ئامانجەکانی دەگەییشتن.

لە زۆر سووچیشەوە بوو بە مەینەت نەک یەک سووچ: جارێ بە شێوەیەکی ڕووکەشە لێی حاڵی بووین وەک لە شەترەنج حاڵی دەبین بێ ئەوەی پێوەندایەتیی بە واقیعی ژیانەوە هەڵقوڵیبێت چ فەرقێکیش نییە لە نێوان مەیلت وەلای سیمفۆنی لە نێوان خەڵکێک کە تێی ناگەن، بگرە دەیکەرهێنن، و لە بەین باوەڕت بە هەڵبژاردن لە نێوان گەلێکدا تێی ناگات و پێوەندایەتیی بە بەرژەوەندییەوە نابینێ و قورسایی و ئەرکیشی هەڵدەگرێ وەک زێدە زەریبەیەک بێ بخرێتە سەر تەکلیف و شەکەتیەکی پێیان دەگات لە حکوومەتێکەوە کە گوێ ناداتە کاروباری ڕەعیەت، ئنجا کە پێوەندی بڕا لە نێوان لیبەڕالیزم و بەرژەوەندی خەڵک، بەتایبەتی لە پلەکانی سەرەتایدا، ئەوسا دەبێتە گەپێکی نەزۆک و بێسوود.

لێرەدا کە لەبەر ماوە تەسکی، بە شێوەیەکی قەناعەتبەخش دەرفەتی شەرحدان نابینم هەر ئەوەندە دەڵێم ئەو مەفهووم و شێوازانەی لە جیهانی ئێمەدا پەیڕەوی لێ کرا لە دوو وڵات، بە دەم فراژیبوونەوە بەردار بوو، یەکیان میسر ئەوەی دیکەیان هیند، ئەویش بە هۆی پەیدابوونی پێوەندایەتیی لە نێوان واقیعی ئابووری و ڕۆشنبیرییان (کە ڕەنگێکی بەرەوپێشچوونی بە خۆوە گرت، بەتایبەتی لە سەدەی نۆزدەیەمدا) و لە نێوان ڕێژیمی لیبەڕاڵدا بوو کە لە بنەڕەتدا تەعبیردەرەوەی ڕۆشنبیری و ئابووری و چالاکیەکی کۆمەڵایەتی ئەوتۆوەیە بە دوا زمانێکدا دەگەڕێ پێی بئاخێوێ چونکە ئازادیی سیاسی و ئازادیی ئابووری لە پلەی پێش کۆمیونیزمدا[83] دوو شتی تێک بەستراون، یەکیان بێ ئەوەی تر بەسەر پێیانەوە ناوەستێ[84] ئیتر لزوم نییە بۆ کەسێک (و لایەنێک)ی ئابووریی ئازاد و گەشەداری نەبێ خۆ ماندوو بکا بە ڕەفزی لیبەڕالیزم چونکە لیبەڕالیزم بە پێی سروشتی خۆی و بێ بەهانەکاری ئەو لایەنە ڕەفز دەکا وەک نەخوێندەوار و کتێب، کەڕ و گۆرانیبێژ [یەکتر ڕەفز دەکەن].

ئازادی لە گۆشەیەکی دیکەشەوە مایەوە بە مەینەت: کە [لەو وڵاتانەدا] بە شێوەیەکی ڕووکەش تێگەیشتنی ئازادی کەوتە پەرەسەندن و ژمارەی زیاتر لە ڕۆشنبیران بەرەو دروشم و ئامانج و ئاکامەکانی کشان، خەیاڵشکەستیی و هێوا پووچانەوەیەکی زۆر سەری هەڵدا لە ئومێدی کەسانێک باوەڕیان بە ئازادییەوە بوو. شکەستەکەش لە بێهێزیی بنەمای جەماوەری و تەسکەبەرایەتی ئەو جەماوەرەی بەشداریی لە گەپی «ئازادی» دەکرد. سەبەبی ئەو بێهێزی تەسکەبەرایەتییەش، وەک باسمان کرد نەبوونی پێوەندایەتی بوو لە نێوان گوزەران و ئەو دروشمانەی بە تازەیی لە جیهانی سێیەمدا هەڵکرابوون، خەیاڵشکستەیی بە بەریەوە هەیە کە هیمەت بشکێنێ و بێئومێدی ببەخشێ و دنەی لێ پاڵکەوتن بدات.

سەرەڕای ئەمەش شتێکی مەلعوونتر لە خەیاڵشکستەیی ڕووی دا بەوەدا کە هەڵپەرست ڕژانە ئەو تازە مەیدانەی سوود و زیانەوە و ڕێی هەرە کورتیان تێدا گرتە

---

[83]- کۆمیونیزمێک مەبەستە لە ئاکامی بەرەوپێشچوونەوە نەک بە کوشتن و بڕین ببێتە ئاکامێکی ئاسایی.

[84]- دیکتاتۆرایەتیی عەسکەری (و حیزبی چەکداریش) بەر ئەم قسەیە ناکەوێ.

بەر کە بوونە لایەنگیری حاکمە کەمتەرخەمەکانی ئاست «حق و واجب» و کۆڵەکە مەعنەوییەکانی دیکەی کۆمەڵایەتی، ئیتر لەوانە بوو چەندین حیزبی ساختە لە وڵاتێکدا پەیدا بن بە یارمەتی دانی حکوومەت لە پووچەڵیبان و تاکە حیزبێکی تێدا شکست بهێنێ کە هەر نەبێ باوەڕێک و بینینێکی سەربە پرسیارەکانی ئازادییەوەی هەبوو. گۆشەیەکی زێدە بەرین بۆ مەینەتی جیهانی سێیەم کرایەوە لە تەجرەبەی ئازادیدا کە بە خەیاڵی پێشەنگەکانی ئازادیدا نەدەهات، ئەویش بە هۆی شکستی لیبەڕالیزم کە واقعێک نەبوو شێوازێکی پێشکەوتووی حکوومەتی تێدا سەرکەوێ ئیتر قوماندانی لەشکر لە زۆر وڵاتدا کەوتنە سەر ڕێبازی کۆدیتای عەسکەری بۆ هێنانەدی گۆڕانێک کە بە لایانەوە هەوڵی مەدەنیەکان تێدا نەزۆک بوو. ئاشکرایە، کۆدیتای عەسکەری لە بەرەوپێشبردنی کۆمەڵ بە تەواوی پەککەوتەیە چونکە کۆمەڵگایەک لە کەرستەی شارستانیدا هێند بێهێز بێ نەتوانێ خۆی بباتە پێش بە ڕێنموونی ڕۆڵە مەدەنییەکانەوە کە ئامادەترن بۆ گرتنە ئەستۆی بەرپرسایەتیی چاوەدێری، یەکجاری پەککەوتە دەبێ لە ژێر دەسەڵاتی پیاوی عەسکەری کە پەروەردە بووە بۆ غەیری بنیاتنانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و بۆ غەیری بازرگانی کشتیوکێڵ و جۆماڵ و بۆ کارگەی شیرەمەنی... لە جیهانی سێیەمدا ئەو مەدەنیانەی بینینێکی مەیلەو ڕوونیان هەبێ لە گیروگرفتی سەردەم بە تێکڕایی و هی وڵاتانی خۆیان بە ئاشکرایی تا بڵێی کەمئەژمارن ئیتر حاڵی وڵات چۆن دەبێ دوای بەلاوەنانی ئەو کەمتاکورتە لە پایەی چاوەدێری و هێنانی کەسانێک (لە عەسکەرییان) کە هیچ سەرەدەرییان لە لێخۆڕینی کەشتی نییە. برەوستاندنی کودێتا، باشترین ئاکامی ئەوە بوو کە وڵاتی ئینقلابدیدە لە ڕووی شارستانییەوە داوەستێت و نەکشێتەوە پاش، بەڵام دەرکەوت ئەمە لە ئیمکاندا نییە چونکە داوەستان لە مەرکەزی سەرپەرشتی کردندا بێ پێشکەوتن و تەسەلی و ئەمان کارێکی وەها ئاسان نییە بە سەلامەتی پێک بێت وەک کە بە نووسین لە ڕووی کاغەز چەسپ دەکرێت بەڵکوو پێوستی بە چپاندن و تۆقاندن هەیە لە بری حوکمی مەدەنی، واتە دەبێ مێژوو شەختە بکات هەتا عیدی ئەمین یاخود شێتێکی دیکەی ئینقلاب لە خوایەتی بەردەوام دەبێت چونکە ئەو خوایەتییە شێتێکی تەماعکارتر لە ناوی دەبات یان خەڵک هەڵدەشاخێن یان شتێک لە ئەسبابی نەمان دەقەومێ کە بە بیرمدا نایەت.

بەهەمەحاڵ مەینەتەکە زۆر زلترە لەوەی بە نووسینی بە پەلە و هەناسەکورت شەرح بدرێ: وێنەی دزێوی و تاریکی و پەژارە و خەسارەتمەندی و کاولی ڕەجاڵترە لە هەر ڕەجاڵێکی بە بیردا بێت و ئەو هێندە نزمبوونەوەی ڕووی داوە و ئەو چوونەپێشی لەکیس چووە لەو ڕۆژگارە تاریکانەدا بێڕەزاترە لەوەی ویژدان هەڵیبگرێ ئەگەر ویژدان لە هەڵگرتنی ڕانەهاتبێت. ڕەنگە ڕاست بێ بڵێم گەورەترین خەسارەت لە بەردەوامبوونی ئەو تەرزە حاڵەتە ئەنجامێکی بەدئەسەرە لە ئەنجامەکانی بریتییە لەوەی کە گەنجێکی لە سێبەری ئینقلاب دەبێت و پەروەردە دەکرێت و هەڵدەکشێت بە بیریدا نایەت شتێک هەیە پێی دەڵێن ژیانی ئاسوودەی شەرافەتمەندی کەرامەتدار لە دەرەوەی ئەو قەفەسەی تێیدا کەوی دەکرێت و نازانێ مومکینە کەرامەت و نان و دڵخوازیشی هەبێت لە جۆرە ژیانێکدا غەیری ئەو جۆرەی نان و کەرامەت و دڵخوازی لە بیر بردۆتەوە. ئەم پەژارەیەیەی وەها بەد یووم و کوشندە لە تەجرەبەی جیهانی سێیەم لەگەڵ ئازادیدا مەتەڵێکە «لست ادري ولا المنجم يدري - من نازانم و ئەستێرەناسیش نازانێ» کلیلی هەڵهێنانی لە کوێیە چونکە بە قووڵایی و بە مەودا گەلێک نامومکینی تێهەڵکێش و لێک ترازاوی لێ نیشتووە: ئاپۆرەی پانوپۆڕی ئەو خەڵکەی خاوەن بەرژەوەندە لە ئازادی و داد و ئەماندا تا ئێمڕۆکەش تێنەگەیشتووە چۆناوچۆنی بەرژەوەندەکەی بە دەمارێکی زیندەڵ[85] دەگاتەوە ئەو هەڵبژاردن و ڕۆژنامە و حیزبەی کەسانێک لێی خاوەنن و هەڵیدەسوڕێنن چ پێوەندییان بە بازار و کێڵگە و کارگەوە نییە و بە زمانێکی نائاشنا لەبەر گوێی جەماوەر خۆیان و ئامانجەکانیان ڕوون دەکەنەوە و شێوازی ئەوتۆ [لە کردەوەدا] بە کار دەهێنن خزمایەتیی نییە لەگەڵ پارووی بژێودا چونکە سیاسەت تا ئێستاش تەڕەدەماغییەکە کەمینەی ڕۆشنبیران خەریکی دەبن و نەچۆتە تیرێژ و ڕشتەی هەناوی کۆمەڵ سەبەب بەو شتانەی باسی هێندێکیان کرا.

ئنجا هەر چونکە سیاسەت تەڕدەماغییە بۆیە لە جغزی مەسڵەحەتی ڕاستیینەی گەل دەردەچێت و دەکەوێتە بەر حوکمی میزاج و لێکدانەوە و پێوەرەوە تا ئەوەی دەشێ بە دەوری تاکە فکرێک و تاکە بەرژەوەندێکەوە چەندین حیزب و ڕێکخراو پەیدا بن و

---

[85] - زیندەڵ: عضوي.

بەردەوام بن لەسەر شەڕە چەپۆڵک و لێکخشان و شتی توندوتیژتریش، ئیتر دەشێ بەرەیەکی دینی لە دەزنوێژدا دوو گۆزینگ بە بەشێکی پێ حیساب بکات و بەردەوام بێ لەسەر دوژمنایەتیی جەماعەتێکی دیکە لەو باوەڕەدا نەبیت، یاخود کۆمەڵێکی سیاسی بۆرژوازی بچووک هەرچی تۆمەت هەیە بگرێتە کۆمەڵێکی سەربە بورژوازی مامناوەنجی کە لە ئامانج و دروشمندا دەگەنەوە یەکتر بەڵام «گۆیا» چینیان جودایە... ڕەنگە هەندێک باوەڕ بە ڕۆژهەڵات و هەندێک بە ناوەڕاست و هەندێک بە ڕۆژاوا و هەندێک بە هیچ، بە بۆشایی بهێنێت ئیتر چەک تیژ بکەنەوە و ڕیز ڕێک بیەخەن بۆ هەرا و پەت و تیغ لە بەرچاوی جەماوەری پان و بەرین کە حاڵی نییە لەو کارناڤالە خوێناوییەی وا لە حەوشەیدا دەسازێت.

بڵێم چی خۆ لەوانەیە کەسانێک لێکتر جودا ببنەوە و یەخەی یەکتر بگرن هەر هەتا نەگوترێ تەبا و ڕەبان. ئەو واقیعە ئیفلیجەی تێشیدا دەژین دەتوانێ بە جۆرەها جوداوازی ئاووس بێ کە بە بیری هیچ بڵیمەتێکدا نایەت، مەینەتیش هەموو قەڵغەنی جیهانی سێیەمی گرتۆتەوە بە دەر  و ناویەوە بۆ خۆشت تێفکرە لە ئاکامی بە یەکتر گەیشتنەوەی ژیاری کۆتایی سەدەی بیستەم لەگەڵ وڕێنەکانی چەسپاو و کەڵەکە کردووی ڕۆژگارانی جیهانی سێیەمدا بە دەم زیادیی نفووس و پەرەسەندنی فەقیری و تێک هەڵاتنی فەلسەفان و ملانێی سیاسەت و ڕکەباری بەرژەوەندە زلەکان و ناوەنجییەکانەوە وێڕای نەبوونی شتێک پێی دەگوتری «گەل» بە مانای کۆمەڵە بنیادەمی نیشتمانێک ڕێز لە واجیب دەنێت و پارێزگاری لە ماف دەکات، خۆ گەل بریتی نییە لە ئاپۆرەی بیست نەفەری یان ملیۆن و ملیاریی بێ پێناسە دەنا مەڕگەل و گاگەلیش ژمارەی هەیە و مەیلی برسییەتی و زایەند و ترسی مەرگ و ئارەزووی ژیانی هەیە و پێشی ناگوترێ «گەل» و هەر مێگەل و گاگەلە، ژیرانە چارەی هیچ دەردێکی خۆی پێناکرێت و لە خۆی و کەودەنیەکەی دەوەشێتەوە شتێک بە خۆی بکات کە لبنان بە تەنها وەیا لیبیا و چاد بە جووتە دەیکەن و چی هاوڕێیانی عەدەن کردیان... خوا لە کفندزی کۆن خۆش بێت و إنا لله ولا حول ولا...

مەینەت دەکوتێت و هەر دەکوتێت بە تەوژمێک کە بە دەم زمانەوە زیاد دەکات و چ ترووسکەیەکی ئومێد، چەندی کزیش بێت، موژدەی سەرەتای ڕزگارییەکی نزیکی پێوە نییە کە لەوانەیە سەرەتا هێند لە کۆتایی دوور بێت دڵخۆشی بەو موژدەیەوە

بکوژێت. بەر لە نۆ ساڵ بە دەم وتووێژێکی دۆستانە لەگەڵ بەرپرسێکی گەورەی دەوڵەتدا گوتم: دەمێکە ئامۆژگاریم بۆ کچان و کوڕان، لەوانەی دەنگم دەیانگاتێ لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا ئەوە بوو: مەکەن لێکتر مارەبڕبن لە وڵاتی خۆیاندا، دەنا وەچەیان دەبێتە چیلگەی ئاگری دیار و بزری جیهانەکەمان، با وەکوو چوێلەکە و لەکلەک مشەختانە[86] بۆ ئەو شوێنانە بڕۆن بژێو و ئاویان هەیە و ڕاوە مەلیش وەنەبێ لە هەموو دوازدە مانگی ساڵدا جایەز بێ، بەسەر هێلکەوە کورک بن و بە زەڕنەقووتەکانیانەوە بگەشێنەوە، بە لەشی ساغیانەوە نەک بە ئەندامی هەلاهەلایانەوە.

بەهەمەحاڵ دوور لە تاوگیری و ڕەشبینی و دوور لە گەشبینی گێلانە دەڵێم... زۆر لە دەوڵەتانی جیهانی سێیەم خۆیان لە خۆیاندا هێوێنی ڕسکانی دەوڵەتیان تێدا نییە بەڵام تانوپۆی ئەو دەوڵەتانەی بە دەوریانەوەن ناچاریان دەکا بەردەوام بن چونکە ئەم ڕۆژگارە بەتاڵایی سیاسی پان و بەرین ناسەلمێنێ سەبەب بە پێوەندایەتیی بەرژەوەندی زۆر و زەبەند پێیانەوە. ئیتر دەوڵەتەکان وەک دارێکن لە دارستاندا بە مشاریش ببڕێتەوە بە لادا نایەت چونکە دەوردراوە بە درەختی قیت ناچاری دەکەن بە سەر پێیانەوە ڕاوەستێ. ئنجا چ خوێڕییەکە ئەو حاکمەی هەڵسووڕ و داسووڕی عیفریتانە بەسەر میللەتیدا دەکات و وەک تاووس خۆ فش هەڵدەهێنێت هەموو شان و شەوکەتیشی وەک بابایەکی لاخۆرە[87] بە سەر سفرە و خوانی خەڵکەوە، لەو ڕووە کە بوونی بەندە بە بوونی غەیرەوە.

تۆ ئەگەر بتوانی یەکێک لەو دەوڵەتانە بە خاک و ئاو و ئینسان و حەیوان و ڕووەک و بە خەزنەی ژێر خاکیشەوە ڕاگوێزێت بۆ مەریخ و خودبەسەری بکەیت، ناتوانی یەک مانگ وەکوو دەوڵەت دەوام بکات چونکە حاکمەکەی دەبێتە جەللاد و سەربازەکانی دەبنە ڕێگر، ڕەعیەتیشی «حمر مستنفرة فرت من قسورة»[88] تا ئەگەر چەند مانگێک مایەوە شەوگاری بە تاریکی دەباتە سەر چونکە ناتوانێ چرا قودیلەیەکیش هەڵ بکات با دەوڵەتێکی نەوتاویش بێت، سەبەب بە نەزانینی دەرهێنانی نەوت و ساف کردنی.

---

[86]- مشەختانە: مهاجر.

[87]- لاخۆر: طفلیلی طعام وەک لاکێش، بابەیەکی جگەرەی خەڵک بکێشێ.

[88]- «حمر مستنفرة فرت من قسورة» ئایەتێکی قورئانە.

کلیلی چارەی پەژارەیی جیهانی سێیەم گوم بووە مەگەر دەوامەی لەسەر خۆڕماندن چۆڕ لە توانای کوشتن و خۆکوژی ببڕێت، ئەویش چارەیەکە نموونەیەکم لێی دیتووە لە فیلمێکی سینەما بەر لە 25 ساڵێک کە شەعبەدەبازێک دێت بۆ وەستاندنی خوێنی برینی سەری برینداریێک، بە شیشە ئاسنێکی سووربوویەوە برینەکەی داغ کرد و بریندارەکە هاواریێکی زراوڕژێنی لێ هەڵستا و جووڵەی بڕا و بە مردوو داندرا. بابای فێڵباز دڵی خۆی و خەڵکەکەی بەوە دایەوە گوتی: هەرچەند مرد ئەمما خوێنەکەم وەستاند.

چی لە جیهانی سێیەمدا ڕوو دەدات تکانەوەی دوایین دڵۆپی خوێنە. سێپاتبوونەوەی وشەی خوێن لەم دێڕانەدا ناشێ حەقیقەتی مەینەتەکەمان لە بیر بباتەوە کە مەینەتی ژیار و ڕۆشنبیری و ئابووری و ئەمان و فراژووتن و شتی ئەوتۆییە، خۆیشت دەبینی «ئازادی» و مافی دیکەی کۆمەڵایەتی ئەوتۆیی بوونەتە خولگەی سەربڕکێ و ئابڕوو بردن و نرخ دالەگاندن لە جیهانماندا، قەتیش بەر لەوەی پێوەندی بە سەرچاوەی ئەو مەفهوومانەوە بکەین کێشە و نیزاع و دەمەتەقەیان لەسەر هەڵنەوەستاوە چونکە ئازادی ببڕای ببڕای بابەتێک نەبووە لە جیهانماندا فەلسەفەی سیاسەت و حوکمی لەسەر بنیات نرابێ. ئەگەر پێویست بێ نموونەیەک بهێنینەوە بۆ نزیک خستنەوەی وێنەکە لە زەینی خوێنەر، لە ئیسلامدا «اخوان الصفا» و «معتزلة» هەبوون بە لای فکردا دەشکانەوە تا یاغیبوون لە دەسەڵاتی شەرعی، کە لێیان ورد ببینەوە دەبینین مەیلیان دەچێتەوە بۆ بەکارهێنانی هۆش و مەنتیق و ڕوونبینی لە سەقافەت و عەقیدەی ئەو سەردەمەدا ئەمما بگوترێ بانگەوازێکیان تێدا بوو بۆ خەڵک بەرەو بنەمای گشتی فەلسەفی کە ئازادیی دڵخوازیی تێدا بێ لە پێکهێنانی حکوومەتێک سەقامگیری دادێک بێت، دادی ڕووت، سەرچاوەی لە عەقیدەوە نەهاتبێ و ڕێ بە خەڵک بدات بناخەی یاسا و باوەڕی دین بگۆڕێت، ئا ئەم گوتەیە بریتییە لە وەهم و وڕێنە.

بێنە «قرمطي» بە نموونە بگرە: بەڵێ ڕەفزی دەسەڵاتی عەبباسیانی دەکرد بەڵام پتر ڕەفزی هەموو ڕاڕەو و باوەڕێکیان دەکرد لە باوەڕی ئەوان نەبوایە. «خوارج و

شراة»یش بە تێکڕایی وەک قەرمەتییان لە جغزی ڕەفزی[89] هەموو مەزهەبێکدا بوون کە لە ڕاڕەویان دوور بێ. هەڵکشێیت بۆ مەزدەکی دەیبینی چ دوژمنێکە لەگەڵ غەیری خۆیدا و چەند دوورە لە ڕێ دان بە هۆش و فکر دەنگ هەڵبرێت بۆ ئازادیی خواییشت و نەویستنی شتی نابەدڵ، چاویش دەپۆشین لە بانگەوازە کاڵ و کرچەکەی بۆ شیوعی مڵکایەتی، ئەوەندەی بەسە بۆ عەیبداری و زیانبەخشی کە ئافرەتی بە مڵکی بەرەڵڵا دانا بۆ پیاوان.[90]

لە نەزەر دینیشەوە ئازادی هەر ئەو دەرفەتە بوو و دەبێ کە لە بڕیارەکانی سەربە لەزەت بردن و ماف بە کار هێنانەوە بە ڕەوای زانیوە ئەویش لە چوارچێوەی دەقی ئەتۆیی کە جایەز نییە لە ڕێی شلبەستنەوە[91] و تەئویلی بەرینەوە کەس بۆ غەیری ئەو دەقانە بڕوات... چ سەیر نییە لەوەدا کە دڕدۆنگی لە نێوان پێشینەپەسەندان[92] و نێوان هەر کۆمەڵێکی دینی یان دنیای پەیدا بێ کە ڕێگەیەکی تازە بگرنە بەر شەریعەت سەرچاوەکانی نەسەلماند بێ چونکە ئازادی هەر ئەوەیە کە خالق سەپاندوویەتی یان حەڵاڵی کردووە و ناشێ چ مەعنای دیکەشی هەبێ.

بەهەمەحاڵ زۆر کار و بار و سەبەب تێکەڵ دەبن و بە دەوری ئازادیی جیهانی سێیەمدا حاڵەتێکی دەگمەن دەچنن لە فاکتەری مێژوویی و سەردەمی و ناوەکی و دەرەکی دەشێ دڵۆپڕێژ بکرێنەوە ناو ڕێژەیەکی دوو پۆرگییە: یەکەمیان ئەوەیە، ئازادی بە واتای تازەیەوە، ڕەگی نەبووە لە ڕابوردووی جیهانیی سێیەمدا، ئەویش وەکوو فڕۆک و کۆمپیووتەر لە نوێوە ڕسکاوە.

دووەمیان، ئازادی هەتا ئەم ڕۆژەش لەو وڵاتانەدا هۆکاری ئەوتۆی نییە پێی ببێتە پێکهێنەرێکی سەقافەتیان چونکە لە سەرەتادا وەک فکرێکی نامۆی بێرەگ لە واقیع،

---

[89]– ڕەفزی ئەوتۆیی بە مەعنای حەرام کردن دێت نەک نەویستنی عادەتی.

[90]– دەبیەمەوە، بیروڕای ئەوتۆ هەیە مزدەک بە جۆرێکی جودا لە قەڵەم دەدات. من سەرچاوەی ئەوتۆم نەخوێندۆتەوە.

[91]– شلبەستنەوە: ترخص، خۆڕوخسەتدان.

[92]– پێشینەپەسەند: سلفي.

خزایە مێشکی کەسانی بژاردەوە، ئنجا کە جوزئێکی لە ویژدانی چینی ڕۆشنبیر داگیر کرد تووشی پەژمووردەیی هات سەبەب بە فشەلۆکیی ئەو بناخەیەی کە بیری ئازاد خۆی لێ سەراو کردبوو. دواتر کە زەنەی ژیاری و ئابووری و ڕۆشنبیری لە ڕۆژاوای پاش دوو شەڕی جیهانییەوە بە سەریدا هەڵڕژا، بە خۆی و کادرە هەژارەکەیەوە لە ژێریدا داهێزا و مەیدانی بۆ ئینقیلاب چۆڵ کرد بەو شێوەیەی پێشتر تێیدا تێپەڕین، چی گوتیشم کورتەیەکی تەواو پەککەوتەی سەرگوزشتەکەمانە کە بایی قەناعەتی هیچ هەوەسبازێکی ڕۆژهەڵاتی ناکات قۆڵ و باسکی بە خوێنی خزمان سوور بووە. ئەوەی کردوویەتی و دەیکات ڕەجاڵترە لە هەر وەسفێکی ڕەجاڵی بن ڕەجالانی وەپاڵ بدرێ. کلاشی دز بە شەرەفترە لە کەللەی باوکی.

بیر و خەیاڵی خۆم دەدرکێنم و نەختێکی گەشبینی تێکەڵ دەکەم بە ئومێدی دۆزینەوەی وەسیلەیەکی زەمینی لە وزەیدا بێت جیهانی سێیەممیان بگۆڕێت لە دارستاننشینیەوە بۆ هاونیشتمانی سەر ڕووی خەریتەی ئەم ڕۆژگارە، لە ئاکامدا دەگەم بەم دوو وەهمە: یەکەمیان خۆی لە خۆیدا نامومکین نییە بەڵام دەبێتە گومانبەدەر چونکە بە شتی وەهاوە بەستراوەتەوە گومان بۆی ناچێت… دەڵێم بەڵکوو شارستانەتیمان وەها سەقامگیر بێ و ئەوەندە تەوژمەی هەبێ، پیاکوژ و دز و دوژمنانی ئازادی، لەوانەی هەڵگری چەکی توندوتیژی و دروشمی هەلاهەلا کردنن، زات نەکەن خۆ وەدەرخەن، ئەگەر سەبەب بە ڕێ بەدێیی کردن بەرەو جوانی بنیاتنان و ئەمانیشەوە نەبێ، با بڵێین لە ترسی حەیاچوون و ڕیسوایی و پووچەڵی بێت کە لە کاری دژ بە مرۆوە، بە مرۆوە دەنووسێت و لێی دەبێتە نیشانەی بێ تەربییەیی و دڕندەیی دەروون.

وەهمی دووەم ئەوەیە، بە جۆرێک لەو جۆرانەی شتی پێ دەڕوات، ئەو پێشەنگانەی خەبات، چی حاکمە و چی بە دیار نۆرە حاکمایەتییەوە دەستی لەسەر پەلاپیتکەیە، باوەڕ بهێنن بەوە کە بەلاوە نانی زەبر و زەنگ و خۆ دانە دەست هەوڵی هێمنانە و ژیارییانە بۆ چارەسەرکردنی چەڵەمە و گرێ تاکە ڕێگەیەکە کە سوودبەخش و ڕزگارکەر و بنیاتنەر بێت: تا ئەوەی منداڵێک دەبێت، پێویستە مارەبڕینێک بووبێت و نۆ مانگی بەسەر دا تێپەڕیبێت ئنجا بیست سیساڵێکیش گوزەری کردبێت تا منداڵ دەگاتە تەمەنی بەرهەم هێنان و بەشداری کردن لە فراژوتن (تنمية)، ئەویش بە

خوێندن و ڕاهێنان و تەجرەبەوە. خۆ ئەگەر لە هەر قۆناغێکی تەمەنی منداڵەکەدا پەلەت لێی کرد یا دەیکوژیت یان ڕەسین و هەڵچوونی دەکوژیت.

پەقلاوە لەگەڵ مارشی عەسکەری و ستڕانی ئاگرین دەبێتە ژەقن. دڵ لە ڕووی گوشادیی دنیا دادەخرێت کە دروشم و نووسین و نمایشتی ورووژێن تەنگی پێ هەڵچنیٚ، ژیان خۆیشی دەبێتە مەینەت لە سێبەری عورفی و توندگیریی عەسکەریدا. هەرگیز خەرمانت پۆزی نابێ ئەگەر جووت و درۆینە و گێڕەت بەجێ هێشت چەندێکی هەناوت گەرم ڕاهات و ویستت بە نرکە و چریکە و بوومەلەرزەی هوتاف ساردی کەیتەوە.

ژیانی کۆمەڵایەتی بە پێچەوانەی زۆر لە دیاردەکانی سروشت داوای ئارامی و خۆگیری و هەنگاو بە هەنگاوی کۆ کردنەوە و سازاندن دەکات کەچی لەگەڵ سروشتدا جووت دەڕوات و ڕێک دێن لە هەر کارێکی بنەماکەی فراژووتن[93] و ئیروویی بێت کە دەبینین هەردوویان دەوری ساڵێک خۆ دەگرن هەتا دەغل دەدووریێتەوە و مێوە دەچنرێت، جا کە هات و دیاردەکان بە زەبر و وێرانکەر بوون لایەنی کۆمەڵایەتی بە هەموو زانست و تەکنیک و ئامرازەکانییەوە خەریک دەبێ لغاوی بکات یان لە توندوتیژیەکەی دابشکێنێت یان خۆ لەبەر پەژارەکانی لادات.

ئەمە ڕاستییەکە ئاو لێڵ ناکات، ڕەنگە کەس نەبێ لەوانی زێدەڕۆیی توندوتیژین ئەوەندە گێل بێ نەیسەلمێنێ بەڵام دەشێ بە فێڵ و پێچەبەدەور و تەئویلان، ئەگەر بۆ بلوێ، خۆی بکاتە پارێزەری ئازادی و دیمۆکراسی و هەناردەی ئاشتی و دۆستایەتی نێوان گەلان. وەک ئاشکرایشە لە حاڵوباری کەسانێکی خەریکی دیمۆکراسی و ئاشتین، مرۆی ئاشتیخوازی دیمۆکراتی حەقیقی ڕەنگە یەک وشەی ڕەوانبێژانەی سەر بەو مانایانەی لە زارەوە دەرنەیەت کەچی دوژمنی مرۆڤایەتی لە بەرگی ئاشتیخوازیدا وڵاتەکەی و ئیعلامەکەی و دروشمەکانی دەمی مەسیرەی جەماوەرانە پڕ دەکاتەوە بە وشەی ئاشتی و برایەتی و وێنەی کۆترە و ساوای ژیکەڵ و وەسفی شۆڕشگێڕایەتی درۆزنیش بە دەورییەوە دەبێتە پەرژینێکی موقەددەس بە بارمتە دژی ڕەخنە و گومان. قسەش لەو بوارەوە بە ئێش و پەژارەیە و لەو خەفەتە زلانەیشە کە پەرۆشدار

---

[93]– فراژووتن: نمو وەک پشکووتن، پشکاوتن، ئەنگووتن، ئەنگاوتن.

بۆ ڕاستی شتان و چارەنووسی گەل و وڵات پێی دەتلێتەوە: ڕووپەڕەیەک نییە تۆژەر هەڵیداتەوە لە حاڵوباری خەباتگێڕی شۆڕشگێڕی توندوتیژی دڵبەجۆش بەڵگەی برندەی تێدا نەبێ لەسەر بێئۆمێدیی لەو ڕۆژەی هۆش بێتەوە بەر تیژڕۆیی بنەڕەتی و چەکەکەی دابنێت و نینۆکەکانی ببڕێت، سەڵەوات بۆ بەرەکەتی هێمنی لێ بدات و دابنیشێت بە دەوری مێزی وتوویژ و تێکگەیشتن و لێکتر ئەمینبوونەوە تا خۆی بحەسێنێتەوە و خەڵکیش لێی بحەسێتەوە. بەر لەوەش ئومێد نەمابوو، حاکمی خودبەسەری دنیای مسکێنان دەست هەڵبگرێ لە زەبر و زەنگ و چپاندن... بەر لە هەردوانیشی کیسەی ئومێدان بە تاڵ بووبوو لەوەی گەلانی دنیاکەمان بتوانن، بە دڵ، تێفکرن لە ڕزگاربوون. ئنجا چۆناوچۆنی ئەوانە لە زاڵمی گەورە ڕزگار دەبن، کە هەر یەکە لەوان بایی توانا، زوڵم لە غەیر دەکەن بگرە بە نەختێک ترساندن و دڵدانەوە دەشبنە یاریدەدەری زوڵم! ئیتر چیت گەرەکە؟ چیتر ماوەتەوە؟

کەشکۆڵی جادووگەر لە کاروباری جیهانی سێیەم جۆرە چاپوکدەستی و چاوفریویی تێدایە تا بڵێی زیبا و مەعلانانە، کە دەبینین گەپی کودێتای عەسکەری لە وێرانکاریدا کورتی هێناوە لەچاو گەپی کودێتای ئەهلی چەندین وڵات، قوربانیشی لە بێگوناح و گوناحباران چەندین جار پتر بووە لە هی عەسکەری، بازنەی مەینەتیش لە تێکهەڵقژانی مەدەنییە نیوە شارستانییەکان گەلێک فرەوانتر بووە چونکە لە لایەکەوە ژمارەیان لە عەسکەرییان پترە و لە لای دووەمەوە لەوان نارێکترن و لە لای سێیەمەوە چەندین فێرگەی فکری (جودا)یان هەیە... بیست هەزار کوژراو و چەند هێندە بریندار و هەڵاتووی بێئەژمار، تەنها لە گۆشەیەکی هەژاری دوورە دەستی «جزيرة العرب».

تەختە سویچی ڕووداوانیش کەوا بە دەگمەن هەڵە دەکات لە پێشبینی کردنی کارەساتان، پەنجە ڕادەکێشێ بۆ غەلەبەستاندنی حاڵوباری ئەوتۆ لە جیهانی سێیەمماندا هۆش تێیدا گێژ دەبێ: ئایا زادەی سیاسەتە یان کیژی نوکتەیە یان هی مەزاق یان هی هیچ شتێک حیسابی بۆ بکرێت.

ڕەنگە خەباتگێڕێکی لەوانەی تیغیان سوواوە بۆ گۆڕانی بەرەوپێش گاڵتەی بە قسەم بێت و بیداتەوە بە ڕەشبینیەکی زێدەڕۆ و خۆدانە دەست بێئومێدییەکی پێی دەڵێن «اليأس احدى الراحتين — بێئومێدی یەکێکە لە دوو حەسانەوە» و بە نانکوێریشم بزانێت

له ئاست هەوڵی دڵسۆزانەی بۆ ڕاست کردنەوە و گونجاندن، جا منیش بە ئەو و هەرچی وەک ئەو هەیە لە جیهانی سێیەمماندا دەڵێم: من چەندی ترسم هەبوو لەوەی کەسانی وەک عیدی ئەمین و بۆکاسا لە گەیشتنی ئەو خەباتگێڕانە بە دەسەڵات، ترسەکەشم لەسەر ئەو یەقینە هەڵناوە کە ترسی بۆکاسا و گرووپەکەیم لێ هەڵێنجا بوو چونکە تفەنگ و چەقۆ هەڵگران لە خەباتگێڕانی جیهانی سێیەم کە جارێ لە سوپێردان بەچکە عیفریتن بە نۆرەی خۆیان دەست دەکەن بە سواربوونی خەڵق و مل شکاندن و دەمار هەڵبڕینەوە و گوڵ و پەلک سووتاندن: ڕەنگە پارێزگاری بە شەرەفترین کێشەیەک بن بەڵام وەک گورگ تەما لە مێگەل بنێ... ئازاترین کەسانێک بن لە جانفیدایی بەڵام وەک کە ڕێگرێک لە کاروان دادەنووسێ... ئەوانە بە شێوەیەکی مەیلەو گشتی وێنەی نێگێتیڤی حاکمە خەفەکەرەکانن، هەر کە وەک ئەوان گەیشتنە دەسەڵات دەبنەوە بە وێنەی پۆزەتیڤی زێدە گرژ و تاریک بەسەر کورسی حوکمەوە چونکە کامیان هەرە ئاکار چاک و زێدە نەرمونیان و نزیکترینانن لە سۆز و بەزەیی، لە ڕێی خودپەسەندی و خۆپەرستی بێپایانەوە دەگەن بە تاوانبارکردنی بێ قەید و شەرتی غەیری خۆیان: قامووسی سیاسی ئەوان جێگەی ئازادی و دڵخوازی تێدا نابێتەوە مەگەر ئازادیی بەخوازانینیان و دڵخوازی تەقدیس کردنیان و سەلماندنی بیر و باوەڕیان.

دێمۆکراسی ڕووەکێکە نائاشنای خاکی جیهانی سێیەمە، ڕەگی دانەکوتاوە مەگەر وەک قەوزەی لێرە و لەوێ بێڕەگ نە دەپشکوێت و نە بەریش دەگرێت چونکە ئەو خاکەی دیمۆکراسی تێدا شین دەبێ بریتییە لە پۆرگی نەفس و بینینی هۆش و لەباریی تەبیات و ڕشتەی کۆمەڵایەتی و پاشخانی شارستانەتی. هەر نیشتمانێک ئەم بژیوانەی نەبێ بە مێوانیش، یەک دوو ڕۆژ، دێمۆکراسی داناکات.

تۆ چەندێکی لە پشت چاویلکەی پەلکە زێڕینەوە سەیری جیهان (ی سێیەمان) بکەیت هەر ئەو دیمەنەت دێتە بەر چاو کە هێندێکی بە سووتا و ڕەشداگەڕاوە و هێندێکی بە چکاو[94] سوورهەڵگەڕاوە. جا ئەگەر بۆ هێزی وەهمت لوا ترووسکەیەکی موژدە ببینێت دەسا من شتێکم نەدیتووە لە تەدبیری پەسەند و فەرمانی مەنتیق و داخوازیی

[94]- چکاو: مەبەست لە وشکە خوێنە.

بەرژەوەند و سۆزی عەدالەت. بەڵکوو دەبینم چارەنووس لە گلۆربوونەوەی بەرەو دوارۆژ تەسلیم بە خۆی کراوە بێ زەپت و بێ بەڵەد: ئێمە ئەو هێندە هێزی جازیبەشمان نییە کە ئەرز بە ڕێکی دەگێڕێ لە دەوری ڕۆژدا، ئیتر لە بۆشایی دەخولێینەوە یان وەک تیر دەردەپەڕین بێ ئامانج.

دنیاکەمان برینێکی شەباقەیە دەدەڵێنێت، نە پزیشک هەیە نە دەرمان، مەگەر توانای لەشی زیندەڵ بە پێی تەکوینی خۆی شیفابەخشی خۆی بێت، بەختی شیفا و فۆتانیش بە نیسبەتی پەنجا و پەنجا دابەش دەبێت.

بەغدا 20-2-1995

دەشی لە گرژیی ڕۆژگارەوە شەبەقی بزەیەک بگەشێتەوە، لێوەلەرزەی موژدەیەکیش لە بزرِکاویی ژیان بەدەر بداتەوە، دڵیش وەک سەوزەگیا چاوەچاوی شنەیەکی شیرن و کزەیەکی فێنکە سات نا سات پێی بسێتەوە.

ئەو میهرەگانە یەکێکە لەو هەلی پرِ گوڵ و مێوە کە ڕازاوەتەوە بەو چیهرە گەشانەی لە ژووانی حەق و چاکە و زیبایی بە یەکتر دەگەن، چ کاڵایەکیش نییە وەک «معرفة»[95] ناسک و پاک بووبێتەوە تا لە بەرزی و پیرۆزی و بەرائەتدا ساف و ڕوون جلوە ببەستێت. جا ئەگەر نەسەلمێن خەریک بێت شتێکی گەرانبەهاتر لە «معرفة – زانیار» بدۆزێتەوە، ئەوپەڕی هەوڵی بە ورشە[96] دەگەیەنێت کە مەبەستێکی ئەوانەیە خەریکی سروشتبەدەرن[97] لەوێدا نهێنی شتیان بۆ دەروونبینیی بێواسیتە خۆ دەنوێنێ. جا ئەگەر [بە اشراق] دیتیان و لێیان عەیان بوو، بەوەدا زێدە داراییەک دەچێتە پاڵ زانیارەوە بۆی حیساب دەکرێت نەک لێی دادەشکێت: تازە دەغڵێکیشە ڕەوسەی خەرمان بۆ خۆی دەپێوێت. خۆ ئەگەر بڵیمەتایەتیی مرۆ لێهاتووی گەیاندە پایەیەک بتوانێ لە زیندەوەردا ئامرازی هەستیاری ئەوتۆ بدۆزێتەوە کە یارمەتی فامە غەریزییەکان بدات بۆ زاڵبوون بەسەر تەنگوچەڵەمەی ژیاندا، سوپاسی ئەو کۆشەشەی دەکەین. دۆزینەوەکەش بە شەلەگەیەکی دەراوی زانست دادەنێین کە پێشتر نەزاندرابوو، لەوانەیشە مووشکافێکی سبەیرۆژ ئامرازێکی شرایەوە بەدی بکات کە هەستی بێزمانان وەرگێرِێتە سەر زمانێکی ئاشنا چونکە مەعریفەت کەمهەزمی و دەماروشکیی پێوە نییە دامێنێت بە دەست بەرهەست[98] وەیا بەرفام[99]

---

[95]– معرفة: «زانیار» نەک «زانیاری» کە نیسبەتە. زانیار وەک پرسیار، بریار، دزیار هەمووی (ناوی مەعنا وەیا abstract)ە. کرِیار وەکوو فرۆشیار پاشگری «یار»ی پێوەیە یەک لە دوو «ی»کانی سوواوە.

[96]– ورشە: لە لیستەی زاراوەکانی کۆڕی زانیاری کورددا لە بری (اشراق) هاتووە، کە دەکاتەوە دیتنی بێ واسیتە.

[97]– سروشتبەدەر: ماوراء الطبیعة.

[98]– بەرهەست: محسوس.

[99]– بەرفام: مفهوم.

وەیا پاڵاوتە[100] وەیا زەینشکێفە[101] وەیا سۆسەگر[102] وەیا پەنامپۆشێک[103] کە هەزار ساڵی فکر و ڕامان و تەجرەبەی پێویست بێت. خۆزی بێگیانیش چەردەیەکی ژیوەریی و هەستی هەبوایە کە ئەمڕۆ زەڕڕەقڵاش و ئاسمانگەڕ نابینن، بەڵکوو سبەیڕۆژ زەڕڕەگەڕێک و ئاسمانقڵاشێک زەفەری پێ دەبات، بەوەشدا مەودای نێوان مەعریفەت و «مطلق» وێک دەهاتەوە تا ڕادەی لێکخشان کە بە دوایدا تکەڵبوون دێت چونکە مەعریفەت گەشتگایەکی بێسنوورە، مرۆڤایەتیی مرۆڤ بە پێوانەی کاتبەدەرەکان[104] تێیدا بەربڵاو دەبێت، لە لایەن کاتەوە، و بە درێژایی هەتا هەتایێ دوور، لە لایەن مەکانەوە، ئەگەرنا مرۆڤ کرژ دەبێ بۆ چەند کیلۆیەک گۆشت و ئێسک، کرمی زەوی تەمای لێ دەنێ.

زانیار ئەگەر لە ڕوونترین واتایدا دژی نەزانین بێت، لە ڕوونترین سرووشتیدا لایەنی دژایەتیی لەگەڵ ڕێ نەدان و حەرام کردن و «ڕێک گوشین»ـە[105] چونکە زانیار پێکەڵپێکە لەگەڵ زانینی هەر شتێکی بشێ بزانرێت، بۆشمان هەیە بیر بکەینەوە لەو زانستەی بە دە هەزار ساڵی دیکە دەگاتە دی ئەگەر بێ هیچ لەمپەڕ بەرەوپێش بچێت، خۆ بێگومان زانست لە هەموو لەمپەڕان تێپەڕ دەکات بە دەم ڕۆژگارەوە کە هیچ نایوەستێنێ تا ئەگەر دەهەزار ساڵی بەس نەبوو بۆ بەرەوپێشچوونی ڕەها، مەودای سەدهەزار و ملیۆن ساڵی لە دەست دایە بگرە - مەعریفەت - دەگاتە مەودای ئەوتۆ لە قووڵی و بەرینایی و خێرایی لە مەفهوومی ئێستاکەی زەمان تێدەپەڕێت: لە خێرایی تیشک دەردەچێت و زەمان دەکاتە بەربارێک سەبرە سەبرە دەوەخرێت (بە پێی زێدە

---

[100]- پاڵاوتە: مستخلص.

[101]- زەینشکێفە: مستکنه.

[102]- سۆسەگر: مستشعر.

[103]- پەنامپۆش: مستتر. وشەکانی [بەرهەست... هەتا پەنامپۆش] تازەکردن لە نووسینی کوردی بۆ ئەو مەفهوومانە بەکار نەهاتوون.

[104]- کاتبەدەرەکان: ازل وابد.

[105]- ڕێک گوشین: تحجیم.

خێرایی) هەتا بە تەواوی دەفشێتەوە، تیژتر و تیژتر دەبێت تا خۆی بە جێ دەهێڵێتەوە. ئێستا بیری مرۆڤ تەواو عاجزە سەرەدەری لە توانای زانست بکات بەرەو یەکالا کردن و دۆزینەوە،[106] تێکدان و تێکخستنەوە،[107] بەوەلەدهێنان و نەزۆکاندن،[108] ورەپێدان و پەکخستن،[109] لێگرتنەوە و خستنەسەر[110] و هەرچی مانایەکی ئەوتۆیش بێ کە هەموو مەودای نێوان «هیچ» و «بێبڕانەوە» دەگرێتەوە، لەوەشدا مرۆ جارێ ناتوانترە لە مرۆی شانەدەری بەر لە 60 هەزار ساڵ بیری لە کەشتی ئاسمانی کردبێتەوە، جا ئەگەر خۆدانەپاڵ بەرنامەیەکی بگونجێت لەگەڵ موعجیزەکانی دوارۆژی مەعریفەت شەرەفی ترنجانە نێو ڕێڕەوی حەقی پێوە بێت با ئیمانێکی قووڵیش بهێنین بەوەدا کە گەورەترین لەمپەڕێکی بکەوێتە نێوان مرۆ و ڕۆژی زاڵبوونی مەعریفەت بەسەر جیهانی مرۆدا، لە ڕێنموونی و فەرماندەیی و ڕێکخەری، هەمان نیگاتەسکییە بە هەموو مانا و جۆرێکی وشەکە بگرێتەوە. ئەمما دژواریی مەتڵەب و سەرکەشیی ئامانج و دەستکورتی لەتەک وردەکاریی سروشت و بابەتە ڕەق و زەحمەتەکانی، ئەمانە هەمووی بەندن بە ناوەڕۆکی پێشکەوتن لە هەر مەیدانێکی مەعریفەت بێ وەک کە بڵێین کپ کردنی هێزی ڕاکێش بێگانە نەبوو لە فکرەی چوونە ناو مانگ بەڵام فەرمانێکی کەهەنووتی یاخود دنیایی بە مەنع کردنی تەمای چوونە ئاسمان دەبووە لەمپەڕێک لەوانە بوو ئامانجەکە مردەزاد بکات وەیا بیوەخرێنێ بۆ ماوەیەک، کورت بێ یان درێژ.

نیگاتەسکی، لێی پاراستە بێت بە نەبزی مرۆڤایەتی ناو خوێنت و ڕوونیی دروستبینی لە هەستەدەمارت، لە گۆشەی تەسکبینییەوە دەرگای بەدترین بەڵا بەسەر حەق و حەقدار و حەقپارێزدا دەیەخێتە سەر گازەرای پشت، بایی تەسکیی نیگاش بابای

---

[106]- یەکالا کردن و دۆزینەوە: الفتوح والشکوف.

[107]- تێکدان و تێکخستنەوە: النقض والترکیب.

[108]- بەوەلەدهێنان و نەزۆکاندن: الاستیلاء والتعقیم.

[109]- ورەپێدان و پەکخستن: التمکین و التعجیر.

[110]- لێگرتنەوە و خستنەسەر: الحذف و الاضافة.

تەسکبین شانازی بە شەوەزەنگی دەوری خۆیەوە دەکات چونکە ماوەی کورتی خولگەی هۆشی لە چەند سەرەتاییەکی تەنکدا مەعقوولاتەکەی سیخناخ دەکات و داڵدەی دەدات بە ڕاستبوونی قەناعەتە پووچەڵەکانی. ژمارەی جۆری ئەم بەڵایە بە پێی ژمارەی سەرچاوەکانیەتی، تێیاندایە بەچکەی نەفامییە لێ قوتاربوونی زێدە دژوارە، یان هی کەمزانییە زاست چارەی دەکات. لەوانەیشە تەماعکارێک شەڕ بەو جۆرە زانستانە بفرۆشێت کە دژی تەماعن، برەویش بە جۆری وەها بدات یارمەتیدەری سەروەتەکەی بێت هیچ یەکێکیش لەو تاقمانە مەبەستی قسەکانم نین چونکە هەوڵدان بۆ دەرهێنانیان لە قەپێلکی قەڵاتیان لە ڕێی مەنتیقەوە کاری فیرۆیە. ڕاستییەکەی بە ناچاری دەبێ ڕووی وتوویژم بەرەو توانای ڕۆشنبیر بێت لە بەزاندنی ئافەتی لایەنگیری کە بە هۆشی خەبەردار و چاوی کراوەیە مەعریفەتی تێدا زیندەبەچاڵ دەکرێت چونکە شتێک نییە، لە پلەکانی ڕەسین و پێگەیشتندا، هێندەی لایەنگیری بۆ شتێک و دژ بە شتێک، زانست و ئینساف و داد بکوژێت. لێرەشدا مەودا نییە بۆ ڕوونکردنەوەی چنرانی ڕشتەی کاولی لە تێک ئاڵقانی «تانی لایەنگیری بۆ خۆ» لەگەڵ پۆی «تەبریری ئایدیۆلۆژی دژ بە خەڵق» کە ئەمیش یەکێکە لەو بابەتە گرنگانەی بە گومڕاکاری و دووکەڵی تەقەمەنی خراوەتە پشت پەردەی ئەستووری پەنهانییەوە کە چاوی بە پەلە تێی بڕ ناکات بەڵام من لێرەدا بە «مفارقە»ی پرسیارێکی دوو لکی وازی لێ دەهێنم: کورد و فەلەستینی چییان درووەیەوە لە دروستاندنی دڕدونگیی نێوان خۆیاندا بە جوداوازیی گۆشەنیگای ئایدیۆلۆژی، سویدی و نەرویجیش چییان نەدووریەوە لە بەرەکەتی یەکتر ئازار نەدان و ڕێز گرتن لە «بیروڕای دووەم» بە پشگوێ خستنی ئەو فەلسەفانەی لە جەمسەری پێکگەیشتنەوەی بەرژەوەندا‌ندا دوژمنایەتی دەدۆزنەوە؟

خوێنەر بۆی هەیە بپرسێتەوە: کوا پێوەندیی نیگاتەسکی لە پلەکانی ڕەسیندا بە لایەنگیری خۆدا، لەوەدا کە هەردووکیان پێکەوە بەستراون دەڵێم ئەگەر ئۆگرگرتن بە شێوازی ڕەفتار و دەوامەیدا لەوانە نەبێ تاڵاییەکەی بکاتە تریاق، لە ئاشکرا ئاشکراترە کە گۆشەنیگای هەر گرووپە لە نرخاندنی بەرژەوەندیی گشتی تا ئەو ڕادەیەی ڕێک کەوتن لەسەر هەرە چاکیان ببێتە نامومکین خۆی سەبەبە کە کۆمەڵ بنیات بنرێ

لەسەر بێئۆقرەیی و وشتی و بێمتمانەیی سەربە فڕوفێڵ کە هەمووی دەچێتەوە بۆ عەکس وەستانی گۆشەنیگا و دژکاری لە لایەن گرووپە جووداکانەوە.

لە کۆمەڵایەتیدا کردارێک نییە دەلالەتبەخشتر بۆ نیگاتەنگی و هەستهێڕی لە چوونە ناو خانوویەکی دیوارەکانی لەسەر ملی شل هەڵستابێت... چەند لایەق بوو بەسەر ئاوەوە بانایە!! چەندێکی ویستوومە و دەمەویت ئەو «تاکباوەڕپەرستی»یەی نێوان گەلانی جیهانی سێیەم لە بنەمایەکی ڕووندا ببینم بەو جۆرەی کە هەر لایەنێک لە بەرەی نیشتمانی یەکگرتوودا بە دەسەڵات گەیشت هەموو لایەنەکانی دیکە بنەبڕ دەکات، هەر بەوە گەیشتووم کە سەراویبوونی تەجرەبەی ئەو گەلانە لە دیمۆکراسی و ئازادیی بیروباوەڕ، کە شەقڵی ژیاری سەردەمە، تەسلیمی پەندێک لە پەندەکانی شکەفت و دارستانی کردن، کە دەڵێ: دەتکەم بە فراقێن بەر لەوەی بمخۆی بە شام. لەوەشدا موجامەلەیەکی خاوەندانی دروشمی «چارەی بنەڕەتی» دەکەم کە فەلسەفەی خەباتیانە چونکە ئەمیشیان بەرەو تاکچارەیی و تاکچارەکارەوە دەڕوات، ئەمما دەست پێشخەری بە فراقێن لە شام خۆ ئەویش پەندێکی میراتییە پیرەوی لێ دەکرێت، و زۆر بە داخەوە بە ڕاست دەگەڕێت لە مامڵەتی ڕۆژانەی گەلە دواکەوتووەکاندا. بەڵام پێشەنگەکانی فکر و خەبات دەبوو لەو پەندە تێپەڕن بۆ شێوازێکی لەبارتر لەگەڵ گیانی سەردەم کە دەردەداتەوە لە تەجرەبە سپیەکانی بێ پنۆکی خوێن لە نێوان ئەو گەلانەی گەیشتوونەتە لووتکەی ژیاری بە زانست و بە ڕەفتارەوە، ئەو پێشەنگانەش ئەوەندە هۆشەیان هەبوو کە ئەو چارەسەرە بنەڕەتیانە داڕێژنەوە قاڵبی ئەوتۆ قبوڵی کێبەرکێی هێمنانە بکات... خواش ئیمانداران چەپارە بدات لە بەڵای خۆکوژی... بەڵام وا پێ دەچێ وشاری ژیاری لە جیهانی سێیەمماندا و هی نێوان سێیەم و چوارەممان و بەولاتریشەوە، گەلێک کزترە لەوەی بتوانێ کونەدەرزی فکری ئاشتیخوازانە و دیمۆکڕاتانە هێندە فەڕاح بکات. فەلسەفەی هەزاران ساڵەی پێشخستنی فراقین لە شام، تێیرا دەرچێت بۆ ئاوهەوایەکی سازگار و شێوازێکی ساغڵەم نە فراقینی بەشەری و نە ئەو شامەی تێدا بێت...

بەڵام، بڵێم چی، ژیاری فکری دیمۆکرات لە جیهانی ئێمەدا لە سەرەتاوە تاوانبار دەکرێت بەوەدا کە دیمۆکراسی زەنەی تەماعی ئەوانەیە باوەڕیان بە سەروەتی حەرام و مشتنی خوێنی هەژاران هەیە. لێرەشدا پێشەنگەکان زەکای خۆیانیان بەکار هێنا کە

به یەک زەبر ئازادیی تەعبیر و ئازادیی ڕەفتاریان پێکەوە مراند کە هاتن هەردوویان تێک بەست بە بەنێکی مەلعوونی هۆنرایەوە لە تۆمەتی زەدەکردنی بەرژەوەندی گەل وەک بڵێی ئازادی عیفریتێکی سەردەمی سڵێمان پێغەمبەرە دەبێ لە گومگومەی سەر بەمۆر بپەسترێ... کەچی واقیعیش ئەوەیە کە ئازادیی ڕاستە و ڕاست، دژی ئەو بۆچوونەیە چونکە ئازادی لە یەکەم پلەوە تا دەیەم پلە چەپارەدەری بێدەسەڵاتانە لە دەستدرێژیی دەسەڵاتدار کە دەبینین دوژمنترین کەسانی نەیار لەگەڵ ئازادیی بیر و باوەڕ و سەربەخۆیی دادگە ئەو زۆردارانەن کە دەتوانن ستەم بکەن و خەفەکەریش بن.

لەگەڵ ئەمەشدا من لە حاڵێکدا نیم خەفەتی دنیا بە ملەوە بگرم، گەشبینی سافیلکانەش تەمام وەبەر نانێ کەنەفت کردن بشێ بە وشەی بێژەرێک و هەڵبەستی شاعیرێک و پەندی واعیزێک یان فروسمی پارچە نازدارەکانی هونەری زیبا، نابوود بێت. من هاتم لە شەقامی پانی خەیاڵی ئەوتۆوە کە بە بیراندا نایەت قسەم وەدەرنا و پێچێکم دا بە دەورەی ناجۆربوونی بەرینایی مەعریفەت و تەسکەبەرایی نیگای خۆپەسەند بەڵکوو بێ گرفت بخزێمە لاکۆڵانێک کە دەمویست لەم دوانەمدا پەی بکەم تا بگەم بەو شوێنەی پەرۆشێکی بچووکی کوردی تێدا خڕبۆتەوە دەلالەتەکەی گەڵێک زلترە لە قەڵغەنی وەک کە هەندێ کاری بچووک بە گرنگی دەچنە ڕیزی ئەو هەنگاوەی سەرەتای گەشتێکی هەزار میلییە، بە دەم قسانەوەش ئەم ڕاستییە دەردەکەوێت.

ئەو پەرۆشە کوردییە کە مەڵاس بووە لە پێچێکی نا بەرچاوی چاردەڕێیانی[111] فکر و مێژوو و ڕامیاری بە بەریەوە هەیە ئەم میهرەگانە ئاوڕی لێ بداتەوە و بە هەندێ هەڵبگرێت، ڕێک خستنیشی [لە هەولێر] بە نیازی بیستنی ناڵەیەک و دڵەکوتەیەک لە ناخی شعوری کوردەوە دەدوێت و تەعبیری لێ دەداتەوە.

ئەوەی بە فکر و بە هەست لەو پەرۆشە بچووکەمەوە چێشتووە بچووک نەبوو، پتریش گران هات و قورستریش لە سەرم وەستا بە هێما و ڕاگەیاندنەکانی کە سەرامەد و

---

[111]- چاردەڕێیان: ئەو شوێنەیە کە دوو کۆڵان پێکدا تێدەپەڕن و چوار کۆڵان پێک دەهێنن. لەبەر قورسی دەربڕین نەگوتراوە چوارڕێیان.

دەریایەکی زانست لە پلەی «اجتهاد» بە پەلە و بێباکانە تۆمەتی بۆ هەڵنرێت بێ گوناحێکی لێی بەدەر دابێت یاخود هەڵەیەکی کردبێت، مەگەر ئەوەی فێڵ کردن لە کارەساتی تەفروتووناکەر و پێچ دانەوە لە بەڵای وردوخاشکەر بەو جۆرەی گیان و نامووس بپارێزێت و وڵات و عیباد ڕزگار بکات، گوناح و هەڵە بێت، بە ڕاستی شتێکە دەبێ ویژدان بخاتە سەر کێشانەی پرسیارەکە بە وردترین پێوانەی نیشانەپێکی مەعریفەت و ناسکترین هەستی پێزانی ئینساف، ئنجا تۆ بڵێ باری موشکیلەکە چ سەنگێک بخاتە سەر حەقخواز ئەگەر زۆربەی هەرە زۆری نووسەران و دەم تێوەردەران لەوانەی بە سەقافەتی نوێبابەتەوە ڕوون بۆنەتەوە داوەرێن بۆ سەلماندنی تۆمەتەکە بێ دەمەتەقە و بێ پشوو بۆ تاوانبار کردنی مرۆیەکی بەریی لە گوناح، وەک بڵێی زوڵم کردن لە سەرامەدێکی وەها زل فەرمانێکە مێژوو خستۆتیە گەردنی ئەو کەسانەی گۆیا چارەسەر کردنی بنەڕەتییان هەڵبژاردووە و خەتی جوداکەرەوەی نێوان ڕاست و چەپیان کێشاوە بە نیازی دابڕینی هەموو بەدایەتی بەسەر لایەکدا و پاڵاوتە کردنی هەموو چاکە بۆ لایەکەی تر. لە واقعیشدا لە ڕۆژگاری فرەزان[112] محمدی خەتێ کە لەم قسانەدا مەبەستە، جارێ مەفهوومی ڕاست و چەپ و چارەی بنەڕەتی و لەسەرەخۆ سەری هەڵنەدابوو. سەقافەتێکی ئەورووپایش لە ئاسۆی کورد بە دیار نەکەوتبوو خەڵقەکە کەرتکەرت و برِبرِ بکات لە ئاست نرخاندنی ئەو ڕووداوە گرنگانەی ئەوسا قرغی کەسانێک بوو خەریکی کارەکە دەبوون تا بڵێین بیروڕا لە بارەی تەبرییە کردن و تاوانبار کردن جۆراوجۆر بوون، بە خەیاڵێ هیچ کوردێکیشدا نەهاتبوو مەلای خەتێ بەرگومان بکات، نە لە دەمی ژیانی خۆیدا نە لە پاش ئەو دەمەش هەتا سەرەتاکانی ئەم سەدەیە کە سەنگاندنی کۆنە ڕووداو بە تازە عەیارەی نرخاندی بەرژەوەندان دەستی پێکرد، ئیتر بڕیاری بە دوا کاتەوە لە ناوەڕۆکی کۆمەڵایەتی و ڕووداوی مێژوویی لەبەر تیشکی فکری تازە بابەت پەرەی ستاند و لە گەلێک حاڵوباردا تەرازوو سەرەوبن بوو تا لە هەڵە و هەڵەشەییدا خنکا، بە دەگمەنیش نەبێ ڕۆشنبیر خۆی لەوە نەگەیاندووە کە پێوانی ڕابوردوو بە تەرازووی سەردەم وەک بە یەکگرتنی ساوایی کاڵ و جحێڵی مەیلەو ڕەسیو دەردەچێت.

---

[112]- فرەزان: علامة.

نسیبی کورد لەوەدا بوو کە باوەڕی قەومایەتی زووتر گونجاوتر بوو لەگەڵ بیر و فامی لەچاو ئەو فکرانەی دیکە کە زادەی ئەورووپا بوون. بیری چینایەتیش وەخرا هەتا پاش شەڕی دووهەم. بەو پێیە چاوگێڕانەوەیەکی ناحەزانە بە گەلێک سەلمێنەی مێژوویی و کەلەپووریدا کرا کە بە لای تاوانبار کردندا دەچۆوە و کێشەی لەسەر پەیدا بوو لە نێوان کۆنەخواز و نوێخوازیدا کە لزوم بە کوتانەوەی نییە. کە سەقافەتی سەربە چینایەتی بڵاوبۆوە بیروڕا لێکتر جودابوونەوە بایی جوداوازیی نێوان پێوانەی قەومی و پێوانەی چینایەتی بەوەشدا تاوانبارکردنی ئەو هەڵوەستە قەومییانەی لەگەڵ «اممیة»دا ناگونجێن کارێکی ئاسان بوو لەبەر چاوی هەڵگرەکانی دروشمی «اممیة».

عەیبوعاری بۆرژوازی و دەرەبەگ وەپاڵ بیر و باوەڕی قەومایەتی درا گۆیا زادەی ئەو قۆناغەیە کە مەحکوومە بە مردن. ئنجا بابایەکی کوردی قەومی کە وێڕای قەومایەتی باوەڕی بە چینایەتیش هەبوو تووشی سەغڵەتی دەبوو لە هەوڵی ڕاسترۆیینێکی کە لایەنی هەڵگری دروشمە قەومییەکەی خوار نەبێتەوە بێ ئەوەی ئاگاشی لە خۆ بێت پەسترایە گۆشەیەکی لاچەپی «انفصالیة» و لاتەریکییەوە کە بە لای کەسێکی ئومەممیەوە چینی زەحمەتکێشی کورد دادەبڕێت لە تێکڕای زەحمەتکێشانی ئەو گەلەی لەگەڵ کورد پێکەوە دەژین لە یەک وڵاتدا. هەر بەو بەهانەیش کۆماری مەهاباد خرایە ژێر تۆمەتی «انفصالیة»ەوە نەک لەبەر دابڕان لە حکوومەتی سەرلەبەری ئێران، خۆ هەرگیز بە بیری قەومیەکی کورددا، کە ئیمانی بە ئومەممیەت هەبوو، نەهات تۆمەتی «انفصالیة» و لا تەریکی لە ئەڵمانیای دیمۆکرات بگرێت بەوەدا کە ناسەلمێنێت تێکەڵ بە تێکڕای ئەڵمانیا بێت هەر چونکە خۆ هەڵدانەوە بە ئومەممیەت بنچینەی نرخاندن بوو.

ئەو فکرە نوێیانەی ڕەویان هێنا بۆ مێشکی کورد فراژی بوو و پەرەی ستاند تا ئەوەی زۆرینەی گەنجی کوردی ئەورووپا و بەشێکی بەرچاویشی لە کوردی وڵاتنشینی خاوەری ناوەڕاستدا گەیاندە پەلەیەک کە هەموو شۆڕشە بەسەر چووەکانی کورد تاوانبار بکات بە تۆمەتی بێبەشبوونیان لە مەزموونی چینایەتی و لەبەر سەرۆکایەتیی دەرەبەگ و پیاوانی سەربە ئایین لەو شۆڕشانەدا، بگرە سەیرمان بیست لە عاجباتی قسەی کەسانێک دەڵێن بۆرجوازیەتی کورد خەڵق دەکەین و دەیرمێنین هەر هەتا

بگەین بە ئیشتراکیەت و بەوەدا بیردۆزیی قۆناغە مێژوویەکانی مارکسیزم بە ڕاست بگەڕێت.

ئەم جۆرە نموونانەی زێدە ساکار و سەراو لەبەرەو کۆتایی سەدەی بیستەمدا لێ ناگەڕێ مرۆ سەیری بێتەوە لەو فکرە سادانەی سەرەتاکانی ئەم سەدەیەدا هۆشی کوردی بزاوتبێت و لێی خۆش هێنابێت پەلە بکات لە تاوانبارکردنی مەلای خەتێ، من پەرۆشم بۆ غەرقبوونی پشت لە دوا پشتی کورد لە تاریکستانی فکری سەراوە کە ڕەگی بە هیچ خاکێکی بە پیزەوە بەند نەبووە، ئەم پەرۆشەم گەلێک گەلێک پترە لەو پەرۆشەی بۆ دووچاربوونی مرۆیەکی کەمهاوتای کورد هەڵدەگرم بە دەست تۆمەتی هەڵەشەوە، خۆ مێژووی کۆن و نوێ خاڵی نەبووە لە نموونەی وەها بە سفتوسۆ کە هەندێکیان بە کارەسات دەژمێردرێن بەڵام نایەم درێژە بدەم بە دەربڕینی دەرد و سازدانی دەرمان.

ئەو هێندە چاوبڕینە خێرایەش لە جۆری نوێبوونەوەی عەقڵی ڕامیاری و فەلسەفی کورد بە شێوەیەکی گشتی لە بابەتی «شر لا بد منە - خراپەی بەملەوەبوو» بە نیازی گەیاندنی دەنگێکی نزمی مەنتیق بۆ بەر گوێی ئەوانەی گەیشتوونەتە بڕیاری گردەبڕ لە بارەی کاروباری سەردەم و دواڕۆژ و لە ڕابوردووی نزیک و دوور، لە ناوتوێژیاندا مەسەلەی گوناحبارکردنی مەلای خەتێیە کە خۆشامەدیی لێ دەکرێت لەلایەن هەموو چەپی کوردی پڕ لە دووبەرەکی و سێبەرەکی چونکە حەقمە تەمام هەبێ بە نەختێک ئاگاداربوونەوەیان کە ئەم مەسەلەیە دادەنێم لە تەک کۆمیدیای بەرپاکردنی سەرمایەداری بە نیازی تێکدانی چونکە هێزی یەقین لە هەردوویاندا بە لای ئەوانەی باوەڕیان بە بنەماکانیان هەیە لە سەرچاوەی تەنکاوێکی ئەوتۆوە دێت بنی لە ڕووی ئاشکراترە.

محەمەدی خەتێ کە زادەی دێی «خەتێ»یە لە ناوچەی «باڵەک»ی سەربە ڕەواندز یەکێکە لە هەرە زاناکانی زانستەکانی ئیسلام لە سەردەمی خۆیدا، خۆیشی قوتابی عەللامەی بێمانەندی ئەو دەمە کە زانا گەردەنکێلەکانی ڕۆژگاری خۆی دانیان بە پێشەوایەتیەکەیدا هێنابوو «محمدی کوڕی ئادەم»ی باڵەکی بووە، ئەوەندە بەسە لە ناساندنی «ئیبنوئادەم» کە عەللامە «فەصیح حەیدەری» لە کتێبەکەی «عنوان المجد» ـدا دەڵێ: ئەگەر زانستی ناو کتێبان ڕەش بووبانایەوە ئیبنوئادەم شیاوی ئەوە بوو لە

بیرکردنەوەی خۆی هەموویان بهێنێتەوە. عیلمی ئیبنوئادەم سنووری خەیاڵی تێپەڕاندبوو وەک کە تەئلیفەکانی سنووری ژمارەیان بەزاندبوو.

مەلای خەتێ بەرچاوترین سوختەکانی بوو، لە پلەی علمیشەوە هەرە نزیک بوو لێی. ئیبنوئادەم لە سەرەتاکانی میرایەتیی «محمد پاشای ڕەواندزی»ی ئەمیری هەرێمی سۆران و بە پاشای کۆرە ناسراو مەرجەعی بەرزی ئایینی بوو، مەرجیش لە نێوانیاندا هەبوو کە هیچ کامیان خۆ لە کاری ئەوی دیکە هەڵنەقوتێنێ. بەڵام زۆری نەبرد جوداوازیی کەوتە بەینیانەوە.

بە پێی لێکدانەوە دەبێ هۆی خیلاف لەوەوە بێت کە ئیبنوئادەم نەیتوانیوە خامۆش بێت لە بێشەرعییەکی حکوومەت دەیکات چونکە خۆی لە شوێنی قازی بووە کە لێی داوا دەکرێت حوکمی شەریعەت بخاتە ڕوو لە ئاست هەر شتێکی بقەومێت، ئیتر کشایەوە لە قازیەتی بۆ گوندی وڵزە، بە پێی فەرمانی پاشا خۆی لە کتێبی «سلسلة الذهب»ی ئیبنوئادەم خوێندمەوە دەڵێ چەند ساڵێکە نیشتەجێی وڵزەم. باسێکی خیلافەکەشی تێدایە. نووسینەکەش هی ساڵی 1236ی کۆچییە و ئنجا ئەگەر بە پێی لەبارترین ڕیوایەت ئەمیرایەتیی پاشا لە 1228 دەستی پێ کردبێت گۆشەگیریی ئیبنوئادەمیش چەند ساڵێک بەر لە 1234 بووبێت تەنها دوو ساڵێک دەمێنێتەوە لەو شەش ساڵەدا کە ئیبنوئادەم پشووی تێدا درێژ کردبێتەوە بە ئومێدی ڕاستبوونەوەی چی بە خواری زانیوە، ئیتر مووی نێوانیان پساوە.

مەلای خەتێ دوای ئیبنوئادەم بۆتە مەرجەعی دینی، دەسبژاردەی ئیبنوئادەمیش بووە جگە لە عیلمەکەی خۆی لەوە بەولاوە پێوەندی نێوان سەرۆکی حوکم و سەرۆکی دین بێ تەگەرە بە گەشی دەوامی کردووە. من وای بۆ دەچم کە هونەری ئەو بەردەوامییە بۆ مەلای خەتی دەچێتەوە کە «اجتهاد»ی خۆی بەلای دەرگا هەموارەکانی شەریعەتدا بردۆتەوە بەوەدا کە قبووڵکردنی زەرەری کەم لە زۆر حاڵدا بە لادان لە زێدە تەقەیە بۆ لای «مصالح مرسلة»دا دەبێتەوە چونکە دەربارەی ڕەفتاری پاشا لە دەورانی مەلای خەتیدا هەر ئەوە دەزانین کە پێشتر لێی شارەزا بووین چەند بە زەبر و زەنگ بووە لە گێڕانی سیاسەت و خۆ بەستنەوە بە بەرژەوەندی حکوومەت و بە کار هێنانی دڕی و دڵڕەقی لەگەڵ نافەرمانان و ڕێ بە خۆدان بۆ سزای قورسی لووتشکێن. دەشێ بڵێین خودی پاشا بە شیددەت و دڵڕەقیەوە بە پێی داخوازی حاڵ لە ڕۆژگاری

مەرجەعییەتی مەلای خەتێدا سفتتر بوو تا ئەوەی سەرەتاکانی حوکمی و بەرتەسکیی ئیمارەتەکەی و کەمگرفتیی ڕووداوەکانی داخوازی کردبێت. ئەم تێبینییەش لێی دەفامرێتەوە بگرە تێدا دەخوێنیەوە، کە مەلای خەتێ تا چ ڕادەیەک عیلمی خۆی و بەرژەوەندبینی خۆی لەگەڵ پێداویستی هەڵکەوت و باری شتان سازاندبێ بۆ ئەوەی بشێ هەر مامەلە و ڕەفتارێک هەبێ بخرێتە چوارچێوەی شەریعەتەوە هەرچەند لەوەدا ناچاریش بووبێت تەئویل و فرەواندن[113] بەکار بێت.

لەو باوەڕە دام مەلای خەتێ وێنەیەکی «ابو یوسف»ی قوتابیی «ابو حنیفة» بووە، زانست و ئیجتیهاد و شارەزایی خۆی بە لاڕێیەکانی تەئویلدا نەرمونیان کردووە بۆ جۆرە شلکییەک لە «قیاس» کە بە دەنگ پێداویستەکانی واقیعێکەوە دێت بە گرێوگاڵ لە دەست هەڕەشەی هێزی بەرهەڵستەوە کە خەریکی گەڕ پێکردنی دائیمییە کە سەروبنی وەک بازنە دەگەنەوە یەکتر و حاڵەتی چارە ناپەزیر دروست دەکات کە چارەسەریی وەکوو هی «المؤلفة قلوبهم» تێیدا کورت دەهێنێت. لەوانەیە ئیجتیهادەکانی خەلیفە عومەر لە دەقی یاساوە بۆ ڕۆحەکەی باشترین پاڵپشت بووبێت بۆ مرۆیەکی لە پایەی مەلای خەتێدا کە دەبێ بەرژەوەندی ئاپۆرەی خەڵک بپارێزێت لە تەک هێزی گەورەتر لە خۆی و لە حاڵوبارێکدا کە دەستی بە سەریدا ڕاناشکێت.

خۆزی ڕۆژگار فەتوای نووسراو و دەماودەمی لە کێشەی نێوان خەڵقدا و ئەوەی پێوەندیی بە سوودی حکوومەت و ئەمیرەوە هەبووە یان تێیدا ڕووبەڕووی حاڵی ئەوتۆوە بووە دەمارێکی مەنفەعەتی قاجاری و عوسمانی پێوە بووە یان سەرۆکە دراوسێ دوور و نزیکەکان و ئەو ئەمیرانەی، دۆست و ناحەز، کە خاکیان دەوری سۆرانی داوە... خۆزی فەتواکانیان بمانایە لەوانەبوو خەرمانێک بڕیاری شەرعمان لە هەموو بارێکەوە دەست بکەوتایە کە کتێبی «الخراج»ی «ئەبوو یووسف»ی بە بیراندا هێنابایەوە.

بەڵێ ئێمە دەست بەتاڵین لەو خەرمانە بەڵام مانەوەی مەلای خەتێ لە سەرۆکایەتیی فەتوا و پێشەوایی عیلمدا بۆ ماوەی بیست ساڵ، بێ خیلاف لەگەڵ ئەمیردا، تێمان دەگەیەنێ، فەتواکانی گونجاندووە لەگەڵ پێداویستی سیاسەتی سەرلەبەری ئیمارەتەکە،

---

[113]- فرەواندن: توسیع. لێرەدا توسع دەگەیەنێ.

دڵنیاشین لەوەدا کە ئەمیر هەموو هەوڵێکی داوە بۆ سەلامەتیی حکوومەتەکەی و بەهێزکردنی و بەرفرەواندنی ڕووپێوە[114] کە لەمەشدا وا بووە ئەمیر دژ بە وەلای بۆ خەلیفەی عوسمانی وەستاوە وەک کە سرکە و کورکەی لەگەڵ قاجەرییاندا بووە و پێوەندی خۆی بە ئیبراهیم پاشای میسرییەوە پتەوتر کردووە کە دەزانین ئیبراهیم پاشا ئەگەر ئەورووپا دەستی وەبەر دەستی هەڵنەدابایەوە لەوانەبوو خیلافەت لە ناو ببات.

ئەم حەقیقەتە گەشە لە ڕەفتاری مەلای خەتێ بەڵگەیەکی بەهێزە لە پووچاندنەوەی تۆمەتێکی وەپاڵی دەدرێت وەک کە دوای کەمێک ڕوون دەبێتەوە. ڕۆژان گوزەریان کرد و ساڵان بە دوا یەکتردا لە تازەتەمەنی ئیمارەت تێپەڕین، لە ناوتویێژدا، بەردەوام تۆیەکی دژایەتیی لە نێوان تەمای ئەمیری سۆرانی لە چەسپاندنی دەوڵەتەکەی و نێوان بەرژەوەندی دەوڵەتە زلەکاندا، وەک ئێسکی ماسی لە ئەوکیاندا، تەحەممول نەدەکرا.

تەفسیلی ئەمەش لە کتێبی سەربە تەئخیردا هەیە لێرەشدا بە هیچ جۆرێک جێی نابێتەوە. دوایین شتێکی لەم تەرزە بابەتەم خوێندبێتەوە ئەو گوتارە بووە کە لە ژمارەی 43ی گۆڤاری کاروانی نیسانی 1986 دا لە ژێر سەرناوی «مەلا یەحیای مزووری و ڕمانی ئیمارەتی بادینان» لە لایەن مامۆستا عەلی یەحیاوە بڵاوکرایەوە کە تێیدا بە دەم ڕچەی ڕووداوانەوە دەوری ئەو خیانەتەشی داوە کە وەپاڵ مەلای خەتێ دراوە و بە توندی پێگیر دەبێ لە سەری کە دەڵێ «پاش ئەوەی ئەمیری سۆران بە فرِوفێڵ لەلایەن هەندێ پیاوانی سەربە سوڵتانی عوسمانی و خیانەتی هەندێ دەستوپاوەندانی ئەمیر کە یەکێکیان مەلا محەمەدی خەتێ بوو، بە لایەوە شەڕ کردن دژی خەلیفەی عوسمانی گوناحێکی زل بوو، خۆی بە دەستەوە دا. عەلی ڕیزا پاشا جمووجۆڵی خۆی ڕووە و عیمادییە برد...» لێرەدا بە خائین دانانی مەلای خەتێ لە ڕچەی قساندا بوو بە گوتە مەشوورەکەی «دوو چوێلکە بە بەردێک...» کە مەلای مزووری و خەتێی وێکڕای خەفەکردن هەر دەتگوت «قصر وجمع»ی نوێژە.

---

[114] – ڕووپێو: مساحة سطحية.

بەڵام گوتارەکە چوونە ناو جەرگەی بابەتەکەی هەموار کرد بۆم کە من تا ئەم دەمە هێمام بۆ جۆری خیانەتەکە نەکردووە بە ئومێد هەلێکی لە شریتەی قساندا لە خۆوە بگاتە بابەتەکە، وا لەو چەند ڕستەی گۆڤاری کاروانەوە پێی گەیشت، تێبینییەکیشی لێ پەیدا دەبێت بەوەدا دانهێنان بە خیانەتی مەلا و ئەوەی کە دەڵێ «شەڕ کردن دژی خەلیفەی عوسمانی گوناحێکی زل بوو» یەکدی ناگرنەوە، ئنجا بۆ ئەوەی بشێ جلکی خیانەتی بکرێ بە بەردا پێویستە لە پێشەوە پۆشاکی عەقیدەی لێ بکرێتەوە.
نەختێکیش تەم لەوەدا هەیە کە چۆناوچۆنی خیانەتی مەلا لەگەڵ ئەمیری سۆران هاتە دی وەک بڵێی شۆرەتی ئەو چۆنایەتییە لە نێوان تێکڕای خوێندەواران و زۆر لە بیسەران لە نەزەر نووسەری گوتارەکەدا حۆجەی شەرح نییە، منیش لە بواری سوودی کەسانێکی ئاگادار نین لەو میحنەتە قەومییەی مەلای تێدا بەر تۆمەت کەوت دەڵێم: پاش ئەوەی سپای عوسمانی گەییشتە ڕووانگەی لانی شێر و ئەو ڕووبەڕووبوونەوەی ئەمیر خۆی لێ دەدزیەوە مەودای لێ هەڵاتنی پێوە نەما، یان دەبوو موعجیزەیەک ڕوو بدات کەمان بەسەر زۆراندا سەر بیەخێت یان ئەوەی چاوەڕوان دەکرا لە پلیشانەوەی حەقی خوراو خەفەتبار لە ژێر سمی ستەمی بێڕەزادا، ئەوسا لە مەلاوە فەتوایەکی شەرعی دەرچوو بە کافرکردنی کەسێکی بەرهەڵستی لە سپای خەلیفەی مسوڵمانان بکات، ئیتر ئاگر کوژایەوە و شمشێر چوونەوە کەلانان و لەشکری عوسمانی چووە ناو شاری ڕەواندز بێ شەڕ و وێرانکاری و کوشتن.

ئەمەیە کورتەی ئەو ڕووداوە کە مەلای خەتێشی تێدا بە خاین لە قەڵەم دەدرێت و گوێش نادرێتە تێکبەستەکێ[115] و داخوازیی حاڵ و حوکمی ناچاری. پێوەندی بیست ساڵەیی چڕوپڕی نێوان ئەمیر و مەلاشدا یەکجارەکی لە بیر دەکرێ. ئەو ڕیوایەتەش نابیسترێ کە تا سەرەتاکانی ئەم سەدەیە و هێشتانیش لە هۆش و بیری ئەوانەی دەماودەم بیستوویانە زیندووە، ڕێکیش دێت لەگەڵ پایەی عیلمی و ڕووەتی دنیایی مەلا دوای فەتواکە بێ ئەوەی گەرد لە شۆرەتی بنیشێت لەو جۆرە تۆمەتەی لە سەردەمی ڕۆشنبیری و ڕوونیدا وەپاڵ مەلا دەدرێت.

---

[115]- تێکبەستەکێ: ملابسات.

ڕیوایەتەکە دەڵێ: پاش ئەوەی شەڕ لەگەڵ لەشکری عوسمانیدا بوو بە تاکە دڵخواز و ئاکامەکەشی هێند ئاشکرا بوو چاوکولیش دەیدیت چار نەما لە هەڵگرتنەوەی ئەو پێشنیازانەی ئاشتی تێکەڵ بە تاعەت بۆ خەلیفە کە لەلایەن عەلی ڕیزا پاشاوە بۆ ئەمیر دەهات وێڕای ئەو هەموو سوێند و بەڵێنانەی کە چی لە توانایدا بێت بیکات لە چەپارەدانی ڕەواندز و ئەمیر و ئەوەی پێی دەگوترێ دالەنگان و سووکایەتی ئیتر پاشا مەیلی وەلای حوکمی زەرووڕەت و کەمتر شکستیدا هاتەوە. بە نیازی ئابڕووپارێزی و دابین کردنی لەشکری ئەمیریش و هەتا کێشە بخرێتە چوارچێوەیەکی حوکمی شەرعەوە کە لەگەڵ بەڵێنەکانیشدا ڕێک بێت لایەنی کورد بەسەر ئەوەدا وەستا کە فەتوا لەلایەن مەرجەعی بەرزی دینەوە دەرچێت بە مەنعی چەک هەڵگرتن لە ڕووی سپای خەلیفە، فەتواکەش بە ڕەزامەندیی ئەمیر و چاکەی ئەو و سەرلەبەری هەرێمەکە مانیعی موسیبەتە هەرە زلەکە بوو کە ڕووی دەدا، ڕێ خۆشکەرەوەش بوو بۆ مانەوەی ئەمیر بە ئەمیری لە چارچێوەی دەسەڵاتی مەرکەزیدا، بەڵگەش لەوەدا هێندە زۆرە ژمێریار ماندوو دەکات:

یەکەم شتی لەوەدا بگوترێ ئەوەیە کە تۆمەتەکەی سەری هەڵنەدا تا دوای بڵاوبوونەوەی گیانی قەومایەتی و گەڕانەوە بۆ سەر ڕابوردوو بە پێوانەی ڕۆژگارێکی پاشتردا، کێشە و بەرەی ئەم مەسەلەیەش هێند بە کاڵوکرچی و سەراوی ڕووی دا چەندێکی پەراوێزی پێداچوونەوەی مێژوو لێکیش بکێشرێتەوە مەسەلەکەی تێوە ناچێت. ئنجا پێداچوونەوەی مێژوو چەندێکی خلیسکی تێدا بێت، کە زۆرە نەک کەم، مومکین نییە دوورکەوتنەوە لە حەق و ڕوودا و داخوازیی حاڵ وەیا لەبیرکردنی حوکمی مێژوو و زەبری زەرووڕەت ڕوو بدات وەک کە ڕووی دا لە دارنینی جلکی فەزل و چاکەی مەلای خەتێ بێ دوودڵی و وەستان: هەر دەڵێی هەلی عومر و بەختی بەختانە.

دووەم ئەوەیە، هیچ فەتوایەک دەرنەچوو بە درێژایی مانگەکانی بەر لە گەییشتنی سپاسی عوسمانلی بە دەوروبەری ڕەواندز و داهاتنی ئەو ڕۆژەی ماڵکاولی بە دوا دێت، ئەگەر عەقڵێکی وریا، بە جۆرێک لە جۆران، پێی ڕانەگات. جا ئەگەر مەبەستی مەلا کافرکردنی بەرهەڵستانی خەلیفە بایە بە پێی باوەڕێکی دینی کە مەرجی کافربوونیانی بەلاوە هاتبێتە دی خۆ ئەو بەرهەڵستییە لە دەمێکەوە ئاشکرا بوو بۆ گردوکۆییش بۆ تێک

بەربوون لەگەڵ لەشکری خەلیفە دیارتر بوو لەوەی «نصاب»ی سەرکێشی و دەرچوون لە ڕیزی کۆمەڵگای مسڵمانان (بە پێی حوکمی شەرع) داوای دەکرد بۆ بە عاصی دانانی ئەمیر. پێشتریش چی باسمان کرد لە پێوەندی ئەمیرەوە بە دوژمنانی خەلیفە ڕووی دابوو ئیتر چۆن وەها ڕێک کەوت کە چەقۆ گەیشتە گەردەن مەلا فەتوای دا و سەربڕینەکەی مەنع کرد؟ تۆبڵێی پاراستنی گەردەن خیانەت لێ کردنی بێ؟

سێیەم ئەوەیە ئەگەر مەلا لە فەتواکەیدا باوەڕی هەبوایە بە کافربوونی کەسێکی لە خەلیفە هەڵگەڕێتەوە، بە چاوپۆشی کردن لە وەخرانی فەتواکە بۆ پاش کاتی شەرعیی خۆی، خۆ دەبوو مەلا پەنا بۆ نووایەک ببات دەسەڵاتی پاشای نەگاتێ، بێ ئەوەی خۆ بهاوێتە تەهلوکە بە ئارامی فەتواکە دەربچوێنێت چونکە مەلا زێدە شارەزای ئەمیر بوو بەرانبەر کەسێکی ئازار بە حکوومەتەکەی بگەیەنێت. ئەگەر مزەی فەتواکە، وەک هەندێ نەفس سەفیهی مێشک پووچ گوتویانە، شرۆشیتاڵێکی دنیایی بێت بەوەدا هەرچی تەعلیلێکی هەیە بۆ مانەوەی مەلا لەگەڵ پاشادا هەتا کۆتایی کاران لە خۆوە هەڵدەوەرێت چونکە نرخێکی فەتواکەی پێ کڕدرابێت هەرگیز ناسەلمێنێ مەلا بە دەستی خۆی لە ڕێی عەقیدەوە خۆی شەهید بکات، چونکە دوای بەرتیل هەر ونبوون و کەوڵ سەلامەتی دەمێنێتەوە، عەقیدە و مەقیدەی چی.

چوارەم ئەوەی گوتم و گوتمەوە لە زێدە ڕژدیی ئەمیر لەسەر سەلامەتیی حکوومەتەکەی و بەرینایی تەماکانی بۆ پتر فەراحبوونی خاکەکەی: یەکەم مەرجی لەگەڵ باوکی لە سەرەتای ڕازیبوونی بە ئەمیرایەتی ئەوە بوو کە هیچ کەس خۆی لە شێوازی هەڵسووڕاندنی کاروباران و ئیدارەی خەڵکەکە هەڵنەقوتێنێ. یەکەم ئاکامی ئەم مەرجەش ئەوە بوو مامەڵەی سەخت و کوشندەی لەگەڵ مامە جینگەنەکانیدا کرد، ئەم خووەش لەگەڵیدا ژیا هەتا دەسەڵاتداران تێی ورووکان و جیهان لە ڕوویدا ڕاوەستا بە جۆرێک چ دڵخوازی پێ نەهێشت.

دیتمان لە سەرەتاکانی میرایەتیەکەیدا ئیبنوئادەمی لە فەتوا یەخست و نشیمەنی بەستەوە بە گوندێک کە، ئیبنووئادەم عومدەی مەلایان و پێشەوای پیاوچاکان و مامۆستای مەلای خەتێ و هاوشانەکانی بوو لە مەلایەتیدا. ئنجا ئەگەر یەکێک هەڵەشەیی پەلەی نەکردبێت چۆن دێتە باوەڕیەوە کە ئەمیرێکی وەها دەستوەشین

بێدەنگ دەبێ لە موفتییەکی خۆی داینابێت و پایەی شێوە «شيخ الاسلام»ی لێ نابێت نزیکی چواریەکە سەدەیەک بە ڕەزامەندی پێکەوەیان بەسەر بردبێ هەروا بە نووکی قەڵەمی ئیمارەتێکی لێ هەڵوەشێنێت کە تێکەڵ بە هەموو تەما و ئومێدێکی بووە و لە هەستیدا ئەو شوێنەی گرتبێتەوە کە ڕوح لە لەشدا دەیگرێتەوە و لە پێناو بەردەوامیدا گیانی خۆی و هەزاران لە شەڕکەرانی خۆت توونا کردبێت، ئەگەر یەک ترووسکەی ئومێدی دیتبایە لە بەلاوە نانی ئەو هەژەندە؟

دڵم لێم داوا دەکات سوێند بخۆم کە پاشا مەلای وەها دەئەنجنێ قیمەی لە کونی بێژنگەوە بەرببنەوە ئەگەر بیزانیبایە نیازێکی هەیە لە دڵدا ئازار بە ئیمارەتەکەی بگەیەنێت، بگرە من و ئەوانەی وەک من ئەمیر دەناسن دڵنیاین لەوەدا کە یەک دەقیقە خۆی نەدەوەخراند و لە هەوەڵ جاردا لەشکری خەلیفەی تێک دەپێچایەوە لە دووەم جاردا دەوڵەتەکەی خەلیفە هەپروون بە هەپروون دەکرد. لە سێیەم پلە و پێنجەم و دەیەمدا ئەگەر پێی کرابایە پایتەختەکەی دەگرت و قەسر و حەرەمسەراکەی داگیر دەکرد و گەوهەر و بەردە بە قیمەتەکانی دەست بە سەردا دەگرت لە پێناوی ئەوەشدا سەد مەلای خەتێی دەخنکاند کە بە پێویستی زانیبایە. گۆیا مەلای خەتێ دوورەدەستتر بوو لە حسێنی جگەرگۆشەی پێغەمبەر؟ یان ئەمیر کەمتر لە یەزید خۆی خۆش دەویست؟ یاخود یەزید لە کوشتنی حوسێن خاوەن حەقتر بوو تا ئەمیر لە کوشتنی مەلا؟ وێنەیەک و هەزار وێنەی مێژوویی و مەنتیقی شتان (بەرژەوەندان) بە دوا یەکتردا دێن و دەڵێن: سوودی گەورە لە سیاسەتی دەوڵەتان بەتایبەتی کە سوودەکە مەحکوومی یەک توانای خودبەسەری بێ شەریک بوو، بەرەو ئامانجی خۆیەوە دەڕوا مەگەر یەک لە دوو فاکتەر بیوەستێنێ: ترسی لەدەستچوونی بەرژەوەند و تێمان لە ئەرکی ڕووبەڕووبوون، لەوە بەولاوە بەو دەسەڵات و داراییەی هەیەتی بەهانە بۆ هەموو شتێک دەدۆزێتەوە.

پێنجەم ئەوەیە کە هەڵوەشانی ئیمارەتی پاشا زەرەربەخش بوو بۆ مەلای خەتێ خۆی. هیچ یەکێک لە مەلاکانی کورد نەبوو بەو شکۆیەی دنیایی و ئەو پایە مەعنەوییە گەیشتبێت کە مەلای خەتی بە درێژایی بیست ساڵ لە حوکمی پاشادا بە پێشەوایی دینەوە پێی گەیشتبوو. ئەوەی زانراویشە لە حاڵوباری مەلا دوای بەسەرچوونی حاکمایەتی ئەمیر (بە چەند ساڵێک) گەڕاوەتەوە بۆ دێی خۆی و دەرسی فەقێیان،

بەمەشدا یەک لە پاڵپشتە زلە وەهمییەکان دەرمێت کە تەعلیلی فەتواکەی پێ دەکەن نەک بە پەرۆشی بۆ چاکەی خەڵقوخوا چونکە وا چاوەڕوان دەکرێت خاوەن فەتوا پاداشێک وەربگرێت ئەگەر چ ئومێدێکی دنیایی لە دڵدا بووبێت ئەرکی سەرشانی سووک بکات. ئنجا ئەگەر ئیحتمالی پاداشەکە بسڕینەوە لەبەر دەرکەوتنی تەماعەکەی تێیدا بێت، دەکرا بۆی تێبهێنینەوە بە شتێکی لە پایەی عیلمی مەلا بوەشێتەوە وەک کە بکرێتە «شیخ الاسلام» چونکە مەلای خەتێ لەو سەردەمەدا، ئیبنوئادەمی لێ دەرچێت، لە هەموو عالمان بەو ڕووتبەیە شایەنتر بوو ئەگەر فەتواکە پتر بۆ سوودی ئەمیر و خەڵکی هەرێمەکە حیساب نەکرابایە لەچاو سوودی خەلیفە و دەوڵەتەکەی. فەتواکە خۆی لە خۆیدا گەورەترین سەبەب بوو مەلای پێ نزیک بخرێتەوە لە خەلیفە بە نامەی شەیخولئیسلامەتی بەڵام فەتواکە هەروەک لە یەکەم ڕۆژەوە ڕاستهاوێژ بوو بۆ پاراستنی وڵات و ناموس لە دەستدرێژی، هەروەها ڕاستگۆش دەرچوو لە سەرەنجامی مەلا بە گەڕانەوەی بۆ گوندی خۆی.

لەو شتانەی کە دڵپەزیرە لە نرخاندنی هەڵوەستی مەلای خەتێ کە دەشێ هەڵێنجرێ بە تێڕامان لە ڕووپەڕەیەکی ژیانی یەک لە ستوونانی حەقپەرستی پاش نیوەی یەکەمی ڕۆژگاری مەلا کە مەبەست لێی پێشەنگیی بیری قەومایەتیی کوردی و فەلسەفەی ڕوونی لە سەدەی نۆزدەیەم، شاعیری مەرگبەزێن «حاجی قادری کۆیی»ـیە کە لە کاتی دەرچوونی فەتواکە تەمەنی بە لای کەمەوە دوازدە ساڵی بووە. بۆشی ڕێککەوت لە مەدرەسەی مەلای خەتێ بخوێنێ کە دەوری بیست ساڵێک بەسەر فتواکەدا تێپەڕ بوو. بەو پێیە حاجی قادر لە دەمی ئەو پەژارەیەدا ژیاوە و لە هەوای هەڵمشتووە بە نشینگاکانیدا گەڕاوە و لای خاوەنی خوێندووە،[116] دواتر بە غەریبی لە ئەستەنبوڵ بوو بە شاعیری قەومایەتی، باسی هەرێمی باڵەک لە شێعردا بە سۆزەوە دەکات بە پاشای کۆرە و براکەیدا هەڵدەڵێ بەوەدا کە مەسرەفیان لە عالمان کردووە:

[116]- مەلای خەتێ دوو مەدرەسەی هەبووە، یەکیان زستانە لە دێی خەتێ، ئەوی دیکە هاوینە لە دێی شەقڵاوە، حاجی مەلا ئەسعەد و حاجی مەلا عەبدوڵڵای باپیرم لایان خوێندووە. حاجی مەلا عەبدوڵڵا بە ڕەفاقەتی حاجی قادر. حاجی مەلا ئەسعەد لە شەقڵاوە لای خوێندووە.

تا تەعيناتی کۆر و لاڵ مابوو
له گەلێ دێیەکان مەلای چا بوو

ئێمه دەزانین گەورەترین پشکی ناوی پیتاکی بڕیەی لێ بێت ئەوە بوو بۆ دیوان و مەدرەسەی مەلای خەتێ تەرخان کرابوو. له کتێبۆلکەی «إعاده التوازن إلى ميزان مختل» (لاپەڕە 80 چاپی 1977 – مسعود محمد) له زەمینەی دیفاع له مەلای خەتێ و سڕینەوەی تۆزی تۆمەت له پێڵاوەکانی ئەمەم گوتووە:

*«ئەگەر مەلای خەتێ کەتنێکی وەهای کردبێت دواتریش نسیب حاجی قادری بردبێتیە لای بۆ خوێندن و له نزیکەوە بەڵەدی ئەحواڵی بووبێت دەبوو، بێگومان، له شێعری نیوەی دووەمی ژیانیدا کە زەینی کرایەوە بۆ مانای قەومییەت و تێگەیشتنی شوێنی کاری بەد و پەسەند تێیدا، شتێک لەو بارەوە بڵێ چونکە شتێکی سوودبەخش و زیانبەخشی له مەیدانی قەومایەتی نەهێشتەوە باسی به چاکه یان به خراپه نەکردبێت. بەو پێیە نەبوونی هیچ هێمایەک له دیوانەکەیدا به وەهمیش بێنی خیانەتی عەللامەی خەتێی لێ بێت یان گەزی لێ بگرێت بەڵگەیەکی دڵپەسەندە بۆ سەلماندنی ڕیوایەتێکی دیکەی دەماودەم که مەلای لەو کارە بەدە هەڵاوارد و هەڵوەستی مەلای دەداوە بە ڕەزامەندی پاشای کۆرە خۆیەوە، بگرە له دیوانەکەیدا شت هەیە بۆ نەزاهەتی مەلای خەتێ بچێتەوە که حاجی دێت چاکەی پاشای کۆرە (و براکەی) له ئاوەدان کردنەوەی مزگەوتان و خزمەتی مەلایان باس دەکات که یەکەم کەس، پاشی خیلافی لەگەڵ ئیبنوئادەم، له مەلایان خزمەت کردبێت عەللامەی خەتێ بووە. ئاشکرایە که مەلای خەتێ له شوێنێک بێت پاشای کۆرەی پێوە مەدح بکرێت، ڕوونترین دەلالەتی ئەوەیە ببێتە هۆی مەدحی مەلای خەتێ خۆی».*

دەمێنێ، به نیازی بێ مەفەر کردنی مەلای خەتێ له گۆشەیەکی تەنگدا بگوترێ، بۆ سپای ئەمیر شەرافەتمەندتر و ئابڕوو پارێزتر دەبوو ئەگەر ملانێی لەگەڵ سپای

عوسمانیدا کردبایە هەر نەبێ بۆ بە جێ هێنانی واجیبی قەومایەتی کە ژووروەوی هەموو شتێکەوەیە، ئاکام چ دەبێ با ببێ، منیش دەڵێم:

لەوەدا کە ئاکام هەر شکستی لەشکری پاشا دەبوو، حەقیقەتێکە لە ڕازیبوونی پاشا بە مەسلەتی دەفامرێتەوە چونکە تەما و مەیلی بۆ سەڵتەنەت و خۆ چەسپاندن و پتر خۆ چەکدار کردن تا ئەوەی دارشتنی تۆپ و دروست کردنی سیلاحیشی لەگەڵدا بێت، وێڕای خەڵقی هەل بۆ پەرەستاندن و تا هەرچی کردی و نەیکرد و گوتی و نەیگوت، هەمووی بەڵگەی بێ دەمەتەقەن لەسەر هێندی کە ئەگەر تروسکێکی ئومێدی لە شەڕ بردنەوە یان دیفاعدا دیتبایە، چەکی دانەدەنا چونکە تەبیاتی لەوەدا بوو سواری چواریەکە ئومێدێکی سەرکەوتن بێت لە ڕووی سێ چواریەکی تێشکاندا. بەڵام هەر لەبەر ئەم خەمخۆرییەی لە چارەنووس، خۆی نەدەدایە دەست تەفروتوونبوونی خۆڕایی. ئیتر بە دەم ئومێدێکی کە لە بەڵێنەکان دیاری دەدا خۆی پاراست بە مەسلەتی.

ڕەنگە زەین بۆ ئەوە بڕوات کە ئیحتیمالێکی دیکە هەبوو لایەنی ئومێدی تێدا ئاشکراتر بوو لە تەسلیمبوون بۆ عوسمانیان ئەویش هەڵاتن بوو بە خۆی و سپایەوە بۆ لای قاجارییان. ئێمە هەرچەند نازانین قاجاریەکان چ ڕەفتارێکیان لێ بەدی دەکرا، ناشڵێین بە قیاس لە ڕەت کردنەوەی دۆستایەتیی پاشا کە پێشتر ڕووی دابوو ئەمجارە ڕەفزی پەنادانی دەکەن، بەڵام دەتوانین باوەڕی پاشا لە دوو ئیحتیمالی ڕەفز و قبووڵی قاجاری بخوێنینەوە: ئەگەر دڵنیا بووبێ لە ڕەفزیان ڕێی پەنا بردن کوێر بۆتەوە. ئەگەر دڵنیاش بووبێ لە قبوڵیان خۆی قبوڵی نەکردووە ببێتە ئامێرێکی قەپوقیرِ بە دەستیانەوە چونکە دەیزانی لە ئیمکاندا نییە کێشە لە نێوان دوو وەجاغاندا بکات: جارێکیان بە لای قاجارییاندا و جارێکیش بە لای عوسمانیان، وەک کە بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ بۆ بابانەکان لوا. خۆ ئەگەر ئەم کێشەیەی پێ کرابایە پەسەنی دەکرد بەسەر تەسلیمبووندا چونکە هەر نەبی بۆرە ئومێدێکی تێدایە بەڵام حاڵی بوو لەوە کە دەورانی چاوشارکێ لە سیاسەتی خاوەری میانەدا بە سەر چووە لە پێش هەنگاوی دەسەڵاتە بچووکەکاندا لە ئاکامی فشاری بەرژەوەندە فراژییەکانی ڕۆژئاوایەک کە بە هێزەوە دەستی داوەتە پەیدا کردنی بازارِ بۆ بەرهەمەکانی و مسۆگەر کردنی دەوامەی ئاوەڕۆی ئەو بەرهەمانە بە ئارامی و هێوربوونەوەی دەسەڵاتان (لە خۆرهەڵات) تا

شریتەیەک لەم ئاڵقەبەندەی کە هەمووی دەکێشێتەوە بۆ بێچارەیی لایەنی کەمهێز لە هەنگامەی نوێدا.

چی عوسمانییەکانیش دەیانکرد لە تەتەڵەکردنی ئیمارەتەکانی کورد وێنەیەکی ئاشکرا بوو لە دەروونبینی پاشادا، مەسڵەتیەکەشی بە چاکە گەڕا لە بری خۆکوژی هەرچەند بەوەشدا پشتاوپشتی کوردی دوای چواریەکی سەرەتای سەدەی بیستەم ئەو هەلەی لە دەست چوو کە خۆی هەڵبداتەوە و شانازی بکا بە وێرانبوونی هێندە هەزار خانەیە و شەهیدبوونی دەیان هەزار کەس و سووتانی وشک و تەڕ و فۆتانی کێڵگە و ئاژەڵ لە ڕووپێویکی بەرینی خاکی کوردی بە خوێن سوور هەڵگەڕاودا ئنجا چەند شیرن دەبوو ئەو وێنە بۆرەی لە تێکەڵبوونی چوڕگەی ئاڵ لەگەڵ سووتەنی سەوزایی دەڕەخسا کە دەزانین بەر لە دووسەد ساڵێک شەهیدەکانی ڕەزمی «دمدم» پاش مردنیان و ماڵ کاولیان و هەڵاتنی هێندێکیان هەلی هەلانیان بە میرات هێشتەوە بۆ نازوفیزی ئەوانەی شەیدای کۆڕی شیوەن و قوڕپێوی بەسەر قەبرانەوە و سینگ کوتانی ناو وێرانگانن...

دەماودەم هاتووە، یەکەم مزگەوتی لە هەموو هەرێمەکە دروست کرابێ پاش کارەساتەکە بە 80 ساڵ بووە خۆ ئەگەر 800 ساڵ بوایە دەچەندان شانازی پێوە دەکرا، ئەمە دەڵێم و خۆیشم ڕێزگرێکی هەرە قەدرزانی قارەمانەتی و شەرەفمەندایەتیی «دمدم»ـم چونکە دوای هەرەسی قەزاکرد و داهاتی نەمان و وێرانی، خۆدزینەوە لە شانازی کردن بەو قارەمانەتیە بێمانەندە دەبێتە ئیفلاس بە خۆ کردنێکی خۆڕایی لە دوو ڕووی ماددی و مەعنەوییەوە، بەڵام تا بڵێی هەستیارم لە ئاست زیانێکی قەومی وەکوو کارەساتی دمدم و هی تر کە لە یەک ئاکامی حەتمی بەولاوە هیچی لێ چاوەڕوان نەدەکرا: هەرگیز حەپەسانم بەرانبەر فیداکاری لە «دمدم»دا ناکەمە پەیژە بۆ کارەساتی ئەوتۆیی دیکەی کە لە حەپەسان بەولاوە بەرهەمی تێدا نەبێ چونکە خەڵکم بە زیندوویی خۆشتر دەوێ تا مردوویی، نیشتمانیشم بە سەوزی بە دڵترە تا سیایی و ئاڵی، داهاتی کوردیش لە کەللەی سەری کورد و داروپەردووی ئاوایی کورد لەو شەڕانەی چەند ساڵ بەر لە پەژارەی فەتوای ساڵی 1252 ئەوەندە بە پۆز و هەیبەت بوو جێی نەهێشتبۆوە بۆ زێدە مجێزی تامەزرۆی خوێن و ئاگر هەتا ڕەواندزیش ببێتە قاپە هەڵوای دوای داوەتی ڕۆڵە مردوویی و هەتیوی و فۆتان.

مەسەلەکە تەنها دڵخوازێکی تێدا بوو، ئەوە بوو کە پاشا پەسەندی کرد و پەسەندیدەی هەموو هۆشێکی دروستبینیش بوو. پاشا لەو هەڵوەستە دەورەدراوەی بە ئیرادە مرێنان ناچارتر بوو لە لینین کە پەیمانی بریست لیتۆڤیسک Brest-Litovsk ی ئیمزا کرد و زۆریشی قسە و قسەلۆک بەدوادا هێنا. لینین دوارۆژێکی مسۆگەری نرخ بژاردەی بە پەیمانێکی ناچاری هەڵاوارد بەسەر خەتەربازییەکی کە ئاکامەکەی لە سەرکەوتندا خزمی ئاکامی پەیمانێک بێت کە یەقینی ژیانی پێوەیە و دۆڕاندنیشی تێچوونی ئەو ئومێدانە بێت کە بۆیان کەوتە شۆڕش و گەلێکی سەرلەبەریشی پێ خستە شۆڕشەوە.

ئەم خەفەتە بچووکەی دەمخەریکێنێ بەو ستەمەی لە عەللامەی خەتێ دەکرێت، دوو لکی لێ دەبێتەوە، بچووکەکەیان چەندین جار لە ئەسڵەکە زلترە، گەورەکەشیان «تنوء به العصبة اولو القوة».[117]

بچووکەکەیان ئەوەیە سەقافەتی تازەبابەتی کورد هەلی هێرش بردنە سەر کەسانی وەکوو مەلای خەتێیان لێ خۆش هات و دێت بێ ئەوەی گوێ بدەنە ئاکامی دژلایەنەکی حەق تێیدا تێکەڵ بە ناحەق دەبێت. لایەنگیری بەڵغێکە بە سەر چاوی کۆمەڵدا دێتەوە چونکە ڕۆشنبیری ڕووناکایی دیتن و تروسکەی هیدایەتە، ئنجا – لایەنگیری – ورەیەکە تێکەڵی هەست بە هەڵە و دروستی و ڕاستی و خواری و ستەم و داد و هەموو نرخێکی دیکەش دەبێتەوە.

ڕۆشنبیر لە جیهانێکی وەک کوردەواریدا خۆی قسەکەرە لە جیاتی خەڵک، لە وەکالەتی ئەوانیشەوە ناو لە شتان دەنێت و مانایان وەبەر دەنێت و ئەمە ڕەفز و ئەویان دەقەبڵێنێ، دنیاش بە دوا خۆیدا بۆ هەلاکەتی و نیوە هەلاکەتی پەلکێش دەکات. زۆر جاران عالەموڵلای سادەفام دەحەپەسێن لەوەی ڕۆشنبیران بە خۆیانی دەکەن لە تەفرەقە و شڕی و دڕی لە کاری وەهادا کە سافیلکە بێ وەستان لە سەری دێتە ڕەدایێ هەر چونکە سافیلکەکان بنگەی ئایدیۆلۆجیای وەهایان نییە لە نرخاندنی

---

[117]- «تنوء به العصبة اولو القوة»: کۆمەڵەی هێزداران پێوەی شەکەت دەبن: ئەمە بەشێکە لە ئایەتێکی قورئان لە باری قورسایی کلیلی خەزێنەکانی قارووونەوە کە بە چەندین کەس هەڵنەگیراون.

بەرژەوەندی دنیایی کە عەمر بە «جەزبەی قادری» بپێوێت و بەکریش بە «خلوەی نەقشبەندی». باوەڕ ناکەم سیاسەت هیچ مەسەلەیەکی هێنابێتە مەیدان ئاشکرا و ڕوون بێت هێندەی فەرمانی پێشخزمەتانی کوردایەتی کەوا ڕەنگە لە ماوەی 68 ساڵی دوای شەڕی یەکەمەوە پاراستنی کورد لە نەمان بێت بە دەم تەقالاّی ژین دژی مەرگەوە.

هەرچی ئایدیۆلۆجیا هەیە دەبێ ورتەی لێوە نەیەت لە نێوان خەڵکی ناو کەشتییەکی خەریکە ژێراو بێت. لە هەموو سەیرێکیش سەیرتر، کە هۆشی ڕۆشنبیری کوردی پێوە بەند نابێت، ئەوەیە کە دێت لۆمەی ئەمیرەکانی کورد و دەسەڵاتدارەکانی دەکات کە لە کۆندا خەریکی دڕدۆنگی ناتفاقی بوون لە ئاست خەتەرێکی لە دەرەوەی کوردستانەوە هەڕەشەی مردنی لێ دەکردن، کەچێ ڕۆشنبیرەکە خۆی لە بیر دەچێت کە پتر لە ئەمیرەکانی کورد ڕۆچووە لە ناتفاقی و زڕ بردن و یەکتر سەربڕین بە بێ هیچ هۆیەکی سەربە بەرژەوەندی دنیایی و چارەنووسی گەلەوە بێت، ئنجا ئەگەر عوزری ئەمیری کورد لە نەگونجان ئەوە بێ ترساوە دراوسێ بەهێزەکەی دەست بەسەر ئەنجامی ڕێککەوتنەکەدا بگرێت و بشکشێتەوە بۆ خەتەری تێچوونی ئیمارەتەکەی خۆ ڕۆشنبیری کورد چ عوزرێکی لە دەستدا نییە مەگەر لایەنگیریی ئایدیۆلۆژیەکەی بێت کە بۆتە دینێک نرخدارتر و شیاوتری خۆ بەقوربان کردنی بێت لە هەموو ئەو بەرژەوەندی نیشتمانی و قەومی کە گۆیا لە ئایدیۆلۆژیەکەوە سەرچاوەی گرتووە.

ڕۆشنبیر لە لایەن بەهانەی ناتفاقییەوە چەند جاران دەستبەتاڵترە لە کۆنە ئەمیری کورد: ئەو سەقافەتەی ئەمیر نەیبوو لە ڕۆشنبیر دەبێتە گلەیی، وا لە سەردەمێکیش دەژێت پڕە لە کەرستەی هۆشکرانەوە کە چ عوزر بە دەست کەس نایەڵێت خۆی لە ئاست حەقیقەت کوێر بکات. ئنجا خۆی دەکاتە وەکیلی میللەت و بە گژ خۆیدا دێتەوە و دەبێتە گەورەترین هەلاکەتی بەرژەوەندی خەڵک، خەتەریش لەم ڕۆژگارەیدا پتر هەڕەشەی لێ دەکات لەچاو سەدان ساڵی پێش ئەمرۆکەی، ئنجا ڕۆشنبیر چواریەکە ئیمارەتێکی ڕەجاڵیشی بۆ میللەتەکەی پێک نەهێناوە وەک کە ئەو ئەمیرە ڕەجالاّنە دڵی نیوە نووستوەکانی هاوڕەگەزی خۆیانیان پێ دەدایەوە.

ماوەتەوە ڕۆشنبیری پێشڕۆ داوای ئیمارەتێکی وەکوو سۆران و بابانم لێ بکات هەتا لە سەر سەکۆیەوە پیت و بەرەکەتی قوتاربوون بەسەر خەڵکدا ببەشێتەوە، سا منیش پێی دەڵێم: تۆ کە لە ڕێکاری ئیفلاس و زگی برسییەوە سواری شەبەنگی ئایدیۆلۆژیا دەبیت بۆ ملانێ کردن لەگەڵ ئەوانەی وەک خۆت سواری چەرخوفەلەکی بیروباوەڕ دەبن ئنجا کە تێروتەسەل و لەخۆڕازی بوویت چەندت لی خۆش دێت مجێزت بچێتە سەربڕکێ هەتا دەگەیتە ڕۆخی پووانەوە، ئەمەش شتێک نییە داوای بەڵگەم لێ بکات چونکە ئومێد لە پێشڕۆ ناکرێت بەر لەوەی زاڵ بێ بەسەر نیگاتەسکیی لایەنگیریدا و خۆی ڕابهێنێت بە فرەوان کردنی پشتێنەی بینینی تا بتوانێ بنەما دروستەکانی سوودی قەومی بەدی بکات وەک کە لە واقیعدا هەن نەک لە پێچولۆچی بیردۆزییاندا.

قسەش لەوەدا درێژ ناکەمەوە چونکە درێژ و کورتی وەک یەکن لە تەک مەسەلەیەکی زێدە ئاشکرای وەک ئەو میحنەتەی کوردی تێدا دەژیت. ئەمەش خەفەتە زلەکەی کە هێمام بۆی کرد و لە بارەیەوە دەڵێم: ئەو گیروگرفتانەی تایبەتمەندی کورد لە ژێری دەرزێتەوە و هۆشی تێدا گێژ دەبێت و حیسابی دەبزرکێت و کیتابی دەفۆتێت و «نصاب»ی دەلەنگێت ڕیشەیان دەچێتەوە بۆ دوایین سێیەکی سەدەی شەشەمی بەر لە زایین کە تەرازووی چارەنووسی وەرگەڕا بە لە دەستدانی دەوڵەتەکەی «ماد» و ڕاگوێستنی دەسەڵات بۆ هەخامەنشییەکان لە فەرمانفەرمایی کۆرشی گەورەدا. لەو ڕۆژەوە، بێسوود خەریکە پژاو کۆ بکاتەوە و ڕماو هەڵسێنێتەوە و شکست هەڵبەستێتەوە و هەڵوەشاو بچنێتەوە و کەلێن بگرێتەوە، کە برینیشی لێ بە قووڵدا چوو لە هەموو دەرمانان شیفا بەخشتر ئەوەیە وازی لێ بهێنیت لە خۆوە سارێژ بێت چونکە نە دەرمان هەیە نە پزیشک.

لە هاوینی ساڵی 1960 ڕاستم کرد کە نووسیم:

*«وا ئەمڕۆ لە گۆڕی مێژوو دەردێت، شرِی تۆزاوی، خوێن لە لەشی زامداری دەتکێت و لە بەرایی بیست سەدەوە و پتریش زنجیرەهای ڕۆژگار دەترنجێتە ناو ئێسکییەوە...* لو اطلعت علیه لولیت منه فرارا وملئت منه رعبا». [118]

ئەمانە دەڵێم بە دەم مەنتیقی تەفرەقە و بانگەوازی سەربڕکێ بە بەهانەی جوداوازیی ئەوتۆوە کە لە تەک پێداویستیی ڕێکی بۆ ڕەتاندنی هەڕەشەی مەرگ هێندەی گژنیژەیەک دەرناچێت لە تەک قەڵاکەی هەولێر. ئەمما لە لایەن نەمریی گەلەکەمانەوە، قسە لێوە کردنی دەبێتە کوتانەوەی بەڵگەنەویستێک ژوورووی دەمەتەقێیە قسەشم تێدا دووپات کردۆتەوە یەک لەوان ئەوە بوو کە لە گوتارێکی هاوینی 1960دا هات. گوتوومە:

*«کورد ئەو دەورانانەی تێپەڕاندووە کە تێچوونی میللەتانی لێ خۆش دەهات و تۆماری دەسرِینەوە، وا ئەمڕۆکە حەقیقەتێکە بەرزترە لەوەی بەر فۆتان بکەویت و لە سەرەخۆ بەرەژووری دەوامەدار دەچێت تا تۆقەڵەی ئەو لووتکەیەی کە هەموو جیهان بە سەریەوە دەبینێت وەک بە بڕیاری سروشت هەڵاتنی ئەستێرە دەبینێت».* [119]

بەڵام تەفرەقە هەر دەبێتەوە بە ڕێگەی بەرەو مەرگی گەلی پەرتوبڵاو، بەدترین پرژان و چرژانیش ئەوەیە بە قودسییەتی ئایدیۆلۆژیانەوە بێت کە من لە بابەتی ئەوتۆوە گوتوومە: چاکترە مرۆ بێ تەفسیر بژیت نەک بە تەفسیرەوە بمرێت.

---

[118] – «لو اطلعت علیه لولیت منه فرارا وملئت منه رعبا»: ئەمە دەقی ئایەتێکی سەربە «اصحاب الکهف». تەنها «منهم» لێرەدا بۆتە «منه». ئەم چەند ڕستەیە هەر لە «وا ئەمڕۆکە گۆڕی...» هەتا ڕستەی «لملئت منه رعبا» لە ناوتوێژی چی پێی گوترا «حملة توطید الأخاء العربي الکردي» هاتوون، دوای ئەوانیش نۆ دێڕی دیکەی سەر بەو حەملەیە کە لە کتێبی «من هموم الحیاة» ـدا دووبارە بۆتەوە لزوم نەدیترا وەرگێڕدرێتە سەر کوردی.

[119] – ئەم سێ دێڕەش وەک ئەوانی دیکەی سەرووتر لە هەمان گوتاردا هاتوون.

بەسمە بۆ دزاندنی تەفرەقەی مرێنەر لە پرسیارەکانی سەربە چارەنووسیدا کە ئێمەی
کورد تا ئێستاکەش لە بەدیهیەکی وەک ئەلفبا و جۆری نووسینی ڕستەی کوردی و
ناوی ڕۆژانی حەفتە بیربڵاوین و لە سەرەتاکانی دامەزراندنی نووسینی ئەدەبیمان
خشکەی خلیسکبەران دەکەین، هەموویشی وردە حیسابی میحنەتە قەومییە
کۆنەکەمانە دابەش بووە بەسەر لایەنە جوداکانی وجودی شەپڕەلێداومان ئنجا تۆبڵێی
جێی لۆمە بم، لە نێوان داروپەردووی کەڵەکەکردووی بیستوپێنج سەدەییماندا
چرایەک هەڵگرمەوە کە هۆشکولی بلەوزەکەی شکاندووە و فتیلەی کوژاندۆتەوە بەڵام
لە قەپێلکی هونەر و حیشمەتدا، ئنجا ئەگەر ژەنگی لێ بسڕێتەوە «یكاد زيتها يضئ ولو لم
تمسسه نار — نزیکە بێ ئاگر زەیتەکەی هەڵایسێ» یادگاریشی تا ئێستاکە لە دارە
پیرۆزەکەی دیار خەتێ دەگەشێتەوە کە هەر خۆی خاس سەرۆک و خاس بڵیمەت و
خاس مەردێکە.

الأستاذ الفاضل مسعود محمد المحترم

تحية ود صادق ..

قرأت مقالتكم "حوار غير متكافئ مع الحرب" فتمتعت بأسلوبها المسعودي الجميل وأفكارها التي أعرف أنها صادرة عن فكر صادق وأصيل ..

ولا أختلف معكم في كثير مما ورد في المقالة، ولكن لجريدة مثل الثورة خطها وظروفها والتزاماتها .. وهذا ما يحول دون ظهورها ..

وعدم ظهورها في الثورة لا يقلل من أهميتها وصدق توجهها ..

أتمنى لك السعادة والصحة الدائمة .. وللعراق الحبيب العز والتقدم ..

حميد سعيد

١٩٨٦/٤/١٩

ئەم نامەیە سەرۆکی نووسەرانی جەریدەی
سەورە (الثورة) یە کە [illegible] دەهێنێتەوە
لە بەغداد ئەگەرچی وەک گوتاری (حوار غير
متكافئ ..) لەم پەرتووکەدا [illegible]
داوای لێکردم [illegible] [illegible] سوودم،
دەشێت دەقی ئەم نامەیە «حميد سعيد» لە
بەرامبەر گوتارەکەی «حوار..» (واتە
نگار..) بەشێوەیەکی بڵاو بکرێتەوە

*مامۆستای پایەدار، مەسعوود محەمەد-ی ڕێزدار!*

*سڵاوێکی دۆستانەی ڕاستگۆ...*

*گوتارەکەتان «وتوویژی دالەنگاوم لەگەڵ شەڕ» -م خوێندەوە و جێژم وەرگرت لەو شێوازە «مەسعوودی»یە جوانە و لە بۆچوونانەی دەزانم سەرچاوە لە بیرێکی ڕەسەن و ڕاستگۆوە دەگرن...*

*لاریم لە بەشێکی زۆری گوتارەکە نییە، بەڵام ڕۆژنامەیەکی وەک «الثورة» ڕێباز، هەلومەرج و پێبەندیی خۆی هەیە... و ئەمەش دەبێتە ڕێبەست لە بڵاو کردنەوە [ی گوتارەکە]...*

*بەڵام بڵاو نەکردنەوەی لە «الثورة»دا لە گرینگی [ی گوتارەکە] و ڕاستگۆیی ئاراستەکەی کەم ناکاتەوە...*

*هیوام شادمانی و تەنسازیی هەمیشەییە بۆ ئێوە... و سەروەری و پێشکەوتن بۆ عێراقی خۆشەویست...*

*حەمید سەعید 9/4/1986*

تەرجەمەی سایتی مامۆستا.

ئەی شەڕ![120] ئەی کیژی ئەهریمەنی پەنام لە دەروووندا! ئەی زەنەی زووخاو لە کانی کوێرایی و گومڕاکاری و سەرسەریەتی! ئەی دروشمی تاربوون لە نرخ و ئاکار و ویژدان! ئەی نەفرینی خوات لێ بێ! چ دزێوییەکی بێفەڕیت تێکەڵ بە دڕندەیی و دڵڕەقی بوویت، بەزەیی و سۆز لە پشت هەزار پەردەوە خۆی لێ شاردوویتەوە.

هەرگیز لە نووسینمدا قێزوبێزم سەری نەکردووە وەک ئەوەی هەناوم دەهەژێنێ کە قەڵەم لە کردارە چەپەڵەکانت دەگێرم. چەندی لە چیهرەی بزرکاوت ڕوو وەردەگێرم و چاو بە لایەکدا دەسووڕێنمەوە بەدایەتی تۆی تێنەخزابێت، بەڵکوو لێرە وێژەیەک هەڵگرمەوە و لەوێ تەعبیرێک هەڵبەستم سێبەری دەردی تۆی بە بەردا نەکرابێت تا لە زەمینەی ئینساف و دەستخاوێنییەوە کوڵی دڵی خۆمت لێ دامرکێنم، سێڵاوی هار و نافڕەجا و پڕ شوورەییت هەڵدەرژێتە سەر هەستم هەر لەم ڕۆژەمەوە کە وەیشوومە بە تۆوە تا ڕۆژگارانی بەسەرچووی کە بە دڕەندەییت سوور هەڵگەڕاون و بە بڵێسەت سەوز[121] و بۆری[122] زەردباون... بگرە، وێنەی ئەو کەتنانەی لێرە بە دواوە بە مەردمی دەکەیت لە فەلاکەتدا ئەنباربووەکانی ناخمدا بۆ بەر نیگام هەڵدەچێت: نە خۆشاردنەوە لێت مومکینە نە ژوور کەوتنەوە لێت، کە تۆی چەسپی هۆشم و پڕی خەونم و خەفەکەری سینەم و زرینگێنەوەی بیسەرم... هەست دەکەم، ئاسنی توایەوەت دەرژێتە خوێنم کە زەبری بەڵای هەمەگیری بە قەدەر شەو و ڕۆژت دەمکوتێت بە بیستنی شێوەن بەسەر شەهیدێکەوە یان خەبەری ڕەوێکی تازە یان ڕماندن و سووتاندن و زەدەکردنێک لە تۆوە دەمووروژێنێ بۆ دزاندنت. هەر لەو ڕۆژەڕا باسی کوشتنی هابیل لە لایەن قابیلەوە دەماودەم هاتووە: چ کوشتن و سووتاندن و داپەڵۆسین لە لایەنێکەوە بۆ لایەنێک لە ڕابوردوودا بووبێت و ئەوەی ئێستا و دوارۆژیش دەبێت دڵۆپێکی وەیشوومە لە دەریای وەیشوومەکانت. پێبەپێی گەشەی

---

[120]- وشەی شەڕ کوردییەکی ڕەسەنە لەگەڵ war ی ئینگلیزی و querre ی فڕەنسەییدا یەک ڕیشەن. کە دەگوترێ «گەرم پێ دەکا» مەبەست لێی شەڕ پێ فرۆشتنە. گەڕ querre ەکەیە بە واتای شەڕ.

[121]- سەوز: ڕووەک.

[122]- بۆر: زەوی.

چەکی ئاتۆمی و نەووی و کیمیایی و فرەپەنجەکانی وەک چڕنووکی شەیتانت، تەختە ڕەملی ملەچەرخێمان[123] وەلای مەینەتە پەنامەکانت بەرینتر دەبێ. حەزی سەرشێتم لە دزاندنت دەیەوێ بە هەر پێوەرێک بێت دەروونم فەڕاحتر و فەڕاحتر بکەم تا تەواوی ئەو ڕقە لە خۆیدا بگرێت، ئنجا ئەگەر پێزی لێک کێشرانەوە کورتی هێنا توانای پتر خۆشویستنی ئاشتی و ئارامی و خەڵکوخوا دەمەزەن بکەمەوە بۆ پارسەرنگ دانەوەی فرەیی کارەساتت هەر نەبێ لە گۆشەنیگای «اضعف الایمان - زرِەئیمان»ـەوە.

لە فەراقەییمەوە، بە پێی تەبیاتی تەمەنی شلکم کە دژی کوشتن و لەناوبردن و وێرانکاری بوو، ئەی شەڕ تۆم دزاندووە، قێزیشم لە پووچاندنەوەی گیانی مرۆ، کە لە تابلۆی خوولیامدا بەر لە هەموو تاوانە زلەکانەوە دەهات، بژێوی دەدا بە پتر دزاندنت، کوشتنیش هەمیشە دروشمی شکۆی تۆ بووە بە سەر کەللەسەر و وێرانگانەوە. قەوارەی نافرِەجات لە پێوانەی ڕەفزمدا بە سەر جووتە خەتێکی ڕێکەوە فراژی دەبوو: یەکیان ساڵ بە ساڵ ئامسانی پۆزایی کارەساتەکانت، دووهەمیان کرانەوەی کژ لە دوا کژی فامم بۆ چاکە و دروشمەکانی چاکە. وام دەزانی بە دەم ڕق هەڵگرتنەوە لێت گەیشتوومە ئەوپەڕی توانا و پەرژانم کەچی ڕەحم و بەزەییم بە یەکەم کۆرپەم لە ڕۆژی پێنجی سەرەساڵی 1963 چەشنێک هەڵبەزینەوە داوەکانی میهرەبانی و سۆزیی پەیوەست بە ئادەمیزادەوە فرەتر کرد، ڕیشەم مەحکەمتر بوو بە مەرزا پیتمەند و پەخشندەکانی خاک و ئاو و ئاسمانی نیشتمانمەوە، بگرە بە هەموو خاک و ئاو و ئاسمانێکەوە پیتبەخشی چاکەی خاوێن بێ.

بەمەشدا لە نوێوە سەرچاوەی بیری دژەشەڕ لە هۆش و گۆشمدا پژا، پێشتریش تەجرەبە تاڵەکەی تێک بەربوونی ناوخۆیی (عێراق) دوای شۆڕشی تەمووزی 1958 کە بەولای ئەوپەڕی چاوەڕوان کردنی ڕەشبینانەوە درێژەی کێشا، بژێوێکی ئەسڵی

---

[123]- ملەچەرخێ: لە عەرەبیدا زاراوەی «انتحاء» یان بە نوێیی بۆ داناوە بە پێی لیستەکەی زاراوەی نوێ لەلایەن «المجمع العلمي العراقي»ـیەوە. «ملەچەرخێ» مل بادانەوەی بەردەوامە وەلای شتێکەوە یان بە ئومێدی دیتنی شتێکەوە.

سووتەمەنی دەروونیم بوو لە ڕەفزی «ڕێ، سین، کاف»[124] ڕەمزی ڕاکێشان و سووتاندن و کوشتن. چەندێکیش ئاسۆی نیشتمانم بە هەڕەشەکانت گرژ بووبێت ترووسکەکانی هۆشم گۆشەی پەرستنی ئاشتی و تەقدیسی هێمنایی و چەسپاندنی برایەتی گەشاندۆتەوە، ئیمانیشم لە دوو سەری دژ بە یەکەوە پتەوتر بووە: سەری خۆ دانە پاڵ نەرمی و تێک گەیشتن و دۆستایەتی لە ڕووبەڕووبوونی هەر جۆرە گرفتێک بێت و سەری تاوانبار و حەرامکردنی دڕی و ستەم و پەڕگیری بە کەم و زۆریەوە، دێرزەمانێکیشە گەیشتوومەتە دڵنیایی لە هەبوونی چارەی بێ هەڵپە بۆ هەموو ناکۆکییەکانی نێوان لایەنە پەڕگیرەکان کە بە ڕواڵەت بێدەرمانن چونکە هۆی چارەناپەزیری، وەک زەهری مار، لە کەڵبەی نەفسی دڕندەی سەرسەختی گوناحپەسندەوە زەنە دەکات بەر لەوەی جوداوازیی بەرژەوەند شوێنی لایەق بە خۆی و دەرمانی پێویست بۆی لە نێوان ڕاوێژکەراندا بدۆزێتەوە. هەموو ئەو هەنجەتە خۆڕاییانەی لە ڕاڤە و هۆکاری شەڕیش ڕەپێش دەخرێن لە ترنجۆکێکی سەرپۆش تەنکی قسەی ڕازایەوە پتر نییە کە تەنها پێزێکی پێیەوە بێت هەر لەوە دایە کە شەڕ هەڵدایسێت و بەس. ڕاستییەکەشی بەو هۆیانەی لە تەبیاتی مرۆدا پەنهانن شەڕ هەڵدایسێت دواتر ڕاڤەی غەڵەتوپەڵەت هۆیەکە دەباتەوە بۆ بەرژەوەندی ئیرادەکوژی مرۆ، ڕاڤەکەرانیش بین بە هووشەکارییەوە[125] دەنێن تا ڕاڤە کردن و دروستاندن[126] تێک دەکەنەوە کەچی ڕاڤە و ڕەوایی لە لای هێرشبەرەوە بە دەگمەن نەبێ یەکدی ناگرنەوە.

ڕاڤەکەران سنووری نێوان مومکین و حەتمی لە ناو دەبەن کە لەوانەن هێند لێکتر دوور بن بگەنە دژوەستان[127] چونکە شەڕی ڕاڤەدار شەڕی ڕەوا نییە و مومکینیش

---

[124]- زاراوەی «س، ح، ق» لە 1959 بە عەرەبی پەرەی ستاند لە ڕەمزی «سحل، حرق، قتل» کە بە هەر سێیان دەبنە «سحق» بە واتای ورد کردن. لە کوردیدا دەبنە ڕاکێشان و سووتاندن و کوشتن: «ڕ، س، ک».

[125]- هووشەکاری: مبالغة.

[126]- دروستاندن: تبریر.

[127]- دژوەستان: تعارض.

حەتمی نییە وەک کە کەتنی عادەتی ڕاڤەکراو جودایە لە هی ڕەوا مومکینیش جودایە لە ناچاری. کەسانێکی لە ناو توێکڵی ڕووداوان با خەبەرن دەزانن چەند شەڕی مومکین لەمپەرێکی عاقڵانە وەیا سەنگرانەوەیەک بەربەستی کردوون هەرچەند هۆی هەڵایسانیان بە پێوانەی بەرژەوەند بەهێزتر بووە لە بەشێکی ئەو شەڕانەی ڕوویان داوە. وەها بووە بەریوانییەکی ژیرانە کارەساتی گێڕاوەتەوە، یەکێکی گێلوویڵیش خیلافی گەیاندۆتە تەقینەوە.

قەناعەتی ئەوتۆیی کە شیرمژی بێنەوبەرەی ڕووداوان و سروشتی دەروونانە لە مندا خەستتر بۆوە بە دەم ڕۆژگارەوە کە شریتەی کاروباری جیهان بە ڕاستی دەگێڕا، پتریش پێمەوە چەسپا تا بوو بە بەشێک لە مەعنەوییاتم بە هاتنی کۆرپەکوڕی دووهەمم لە پازدەی ئابی 1964 و هی کیژی تاقانەم لە یەکی ئابی 1971:
خەپەتۆڵەکان، بە دوا یەکتردا، لە ئەفسوونی ساواییان و بێخەوشیی نیگایان و شیرینی گاڵوبوغیان و دەستپاچەییان و پێوەندایەتیی وجودیان بە باوک و دایکیانەوە تۆڕێکیان بە دەورمەوە تەنی لە کڵاڤەی بەزەیی و سۆز، دڵمی بەستەوە بە دڵی هەموو ئادەمیزادەوە، لە هەر ڕەگەزێک دەبن با ببن، بە هەزاران دەماردا پەسندترین هەستمیان دەگەیاندنێ، با بڵێین بە تەمای پاداشتی دڵدەرەوە لەوانەوە بۆ سەلامەتیی جگەرپارەکانم کە دەڵێن پاداشتی چاکە هەر چاکەیە...

دەرگەم خستە سەر گازەرای پشت بە ڕووی هەموو خەڵکدا چ خزم چ بێگانە... دەسەڵاتدار و بێدەسەڵات... ورد و درشت، هەتا هەر کەسێکی ویستبێتی بمگاتێ لەمپەڕ نەبینێ لەو تەرزەی وەزیفەی بەرز دەیخاتە بەر هەنگاوی نیازمەندانەوە: نە ئیستیعلامات، نە پۆلیسی بەر دەرگا، نە سکرتێری ژووان ڕێکخەر، هیچم لەوانە بەسەر ئیرادەی کەسەوە نەسەپاند کە دەیەوێ لێم بە ژوور کەوێت، بە خوازی خۆی و بێ دەرگە لێدان دەهاتە ژوورەکەم وەک دەهاتە ناو دڵمەوە...

ڕاستییەکەی، ئەم ڕێگایەش لە دەمێکەوە هەموار بوو، پتریش و پتریش هەموار بوو بە هاتنی منداڵەکانم کە موژدە بوون بە نوێبوونەوەی ژیانم لە ژیانی ئەواندا و بەردەوامیی وجوودم لە وجوودیانەوە پاشماڵاواییم لەم جیهانە... موژدەکەش دەیهێنا سپاسگوزارم بکات بە دووچەندان تێکەڵبوونی مرۆیەتیم بە مرۆیەتی موتلەقەوە کە لە جەستەی تاکەکانی و کۆمەڵەکانی و گەلەکانی خەست دەبێتەوە... واش بووە لە دەمی هەڵچوونی

ویژدانمدا نەفسەکەم ڕوون و تەنک بۆتەوە و هەستم کردووە بوونم، وجوودم جمیوە لەگەڵ پەلکی دار لەراوەتەوە و بە باڵی پەپوولەوە گەشاوەتەوە، وای کە شەرەفدارن ئەو ترووکە دەمانەی هەستی تێر بە زاتی خۆ تێکەڵ بە هەستێکی سۆفیانەی شاعیرانە بە هەموو بوونەوەرەوە دەبێت و مرۆ خۆی جێ دەهێڵێت کە قەپێلکی تاکایەتیی خۆهەڵاوێر دەترازێت و هاوئاهەنگ دەبێ لەگەڵ جیهانی هەرە بەرینی هەرە دوور. لەوپەڕی ئەوسەرییەوە تا مێرووڵەی بە دەوری پەنجەی پێدا دەخوولێتەوە.

لەو دەمە دەگمەنانەدا پەستایەتیی خۆویستی و ساختەکاری و کین و مەیلی ئازاربەخشی دەکەوێتە چاڵی نەبوونیەوە و لە هەست ون دەبێت وەک کە هەرگیز نەڕسکابیت… ئنجا هەناو مشت دەبێ لە ئارامی و ڕەزامەندی و مەلەکووتی ڕاستی و جوانی بەربڵاو، تا ڕادەیەک توانای فەڕاحبوونی زات لە تەکیدا کورت دەهێنێت.

ئنجا کە حاڵەتەکە تێپەڕی و نەفس کەوتەوە باری عادەتیی ژینەوە وێنە گومبووەکانی تاریکایی و ستەم و خوێڕیەتی وردە وردە دەخزێنەوە نێویەوە… من هەرگیز بێ ئاگا نەبووم، لەو تەقڵەی نێوان ڕوونایی و لێڵاییدا، تا بە سەهوو بچم لە سەرچاوەی ئەو هێزەی دنەی زاتم دەدات بۆ ناو جیهانی «وێنە - نموونە - مثال - Ideal». سەرچاوە زۆرن، بە ئەسڵ لە بنەماکەیەوە هاتوون کە «سروشت - تەبیات»ـە دواتر بەسەر جۆرەهای خووکرددا دارەبەش بووە. لەوەی «سروشتی - تەبیاتی»ـیە پشکی ڕۆڵەکانم زێدە بەرچاوە کە بە پێی ژمارەیان سێ سروشتیان خستە پاڵ ئەسڵی سروشتم. ناشێ ئەو هەستەی لە هاتنی ئەوانەوە لێم پشکووت بە گیرەوە[128] لە قەڵەم بدرێت چونکە هەستی ئەوتۆیی هی فێر کردن و ڕاهێنان نییە، باوکیش لە بەهانە بێنیازە تا خۆی لە منداڵەکانیدا خۆش بوێت، ئەگەر نا چوێلەکە چۆن فێر بوو فەرخەکانی خۆش بووێت؟ دەمەتەقەش لەوەدا هەڵناستێ کە شەرەفی یەکەم و هەرە زلی باوکەتی ئەوەیە داخوازییە پێویستەکەی خۆی بهێنێتە دی بەوەدا کە ئیمان بە موتڵەقی میهرەبانی زیاد بکات و دوو چەندان موتڵەقی ستەم بدزێنێت. نە شانازی لەوە دایە باوک سۆزی هەر بە منداڵەکەی خۆی ببەخشێت نە جێی بایبوونیشە ئازار هەر لە منداڵی خۆی دوور بکاتەوە چونکە بەوەدا دەبێتە سەرباز و پاسەوانی گیانی خۆی کە من هەرگیز ئەوە

---

[128] - گیرەوە: مُکتَسَب.

نەبووم. باوکەتی لێی خۆش هێنام خۆشویستن و دزاندنم بە چوار دڵ بێت، ئیتر وەهام شەڕ دزاند بە کەس نەکرێ مەگەر چوار دڵی لێ بدات.

وام لێ هات دڕی و دڵڕەقی هەستم بڕووشێنێ وەک گرمەیەکی لە چوار لاوە بە میکرۆفۆن چوار هێندەی لێ هاتبێت... مامەوە بە دەروونێکی ڕێک لەگەڵ ئەم موعادەلە چوار خشتەکییەدا، لە هەردوو بەری یار و نەیارییەوە، داوێکی ڕوونیشم تێدا بەدی دەکرد دەگەشایەوە لە نێوان چەندین داوی نەخشەی ژیان کە بە لای ڕەنگی ڕەشدا دەچوونەوە، خۆ دەشێ مژگەی تاڵیش لەبەر چەژی باوکەتییەکی بە منداڵەکانییەوە شیرن بووبێت ئەویش شیرن بێت، هەر ئەمەیش بوو مامەلەم لەگەڵ دیاریی ڕۆژانی ئاووس بە تاڵایی.

بەڵێ ساڵان بە دوا یەکتردا هاتن بە دوو دەستە تەرازووی لەنگەربەزیوی پەسند و شوومیەوە هەتا ساڵی 1985 سەری دەرهێنا لە کەلێنی نێوان لۆچەکانی چیهرەی گرژیرا شێوە بزەیەک ڕۆژ لە دوا ڕۆژ تریفەی ئاشکراتر دەبوو، مانگ لە دوا مانگ شەبەنگی دەشلایەوە تا ئەو سفیدە دەمەی بەیانی لە کۆتایی شەوی بیست و حەفتی ئەیلوول خەریک بوو هەناسە هەڵێنێت کە جەژنی هەرە پیرۆز لە دڵم و ماڵەکەم گەشایەوە بە هاتنی نەوەم لە یەکەم کۆرپەمەوە: ئامەد دەوەن مەسعوود، پێی بووم بە سێ ڕەحمەتە (مثلث الرحمة)[129] و پێنج دڵە و ویژدانپژاو بەسەر ڕووپێوی زێدەبەرین لە مۆڵگەی ڕەحمەت و ئەڤیندا...

ڕۆشنەی بێژمار بۆ بینایی دەروونم کرایەوە واتای «ڕاستی و جوانی» تێرا بخوێنێتەوە، چەند شاگەشکەی گیان بوو کە لە ڕێی «ئامەد»ەوە ماوەی تەمەنی باقیم بەسەر ببەم لەگەڵ نۆبەرەی جیلێکی ئادەمیزاددا کە تێهەڵدەچێتەوە لە دۆزینەوەی تازە بە تازەی هۆی ڕەسین و پێگەییشتنی مرۆڤایەتی بە هەموو ڕووکارێکدا. ئامەد خۆیشی وەکیلم دەبێ لە هەڵنانی پردی پێک گەییشتن لە نێوان مەردم لە پووچانەوەی ئەو وڕێنە لەوجرەی دەیەوێ تەڵەکەبازی لە سروشتی مرۆڤ گرێ بدات، ئنجا کەسێکی لەسەر دەستدرێژی سوور بێ ڕیسوا بکرێ بە تاوانی ڕیزپەڕی و گومڕایی و بێئەمەکی...

---

[129]– «مثلث الرحمة» دەچێتەوە بۆ «ثالوث»ی مەسیحیان. لێرەشدا باپیر و کوڕ و نەوە دەبن بە سێ پشت.

هاتنی ئامەد ناوکێل کردنەوەی گوڵستانی ناو خوێن و دەمارانم بوو، ڕەنگەکانی پێ گەشانەوە، پەلک و لکی تێر ڕەنگ بوون، ڕەگ و پۆپەکانی پاراو... لە شەش مانگ دوو ڕۆژ کەمەوە تا دەمی داچۆڕانی ئەم دێڕانە لە خامەمەوە پەلکەزێڕینە لە برژۆڵەکانم وێنەکێش دەکات، ئاهەنگی ئاسمانم لە بیسەر دەچرپێنێ، بە مەزاق دەمگێڕێتەوە بۆ تەمەنی خۆی و سەرلەنوێ، بە بزە و نیگای، دەمکاتەوە شیرمژی مرۆپەرستی. . وای کە فامکولم لە مەتەڵی بوونەوەر: ئەم بچکۆلەیە چ زلە!!

کە ئامەد هات دەستم دایە دزاندنی شەڕ و دڕی بە هەزار هەزار دڵ، نەفرینم لە شەڕ و شەڕفرۆش و سوور لە سەر شەڕ کردووە بە هەزار هەزار زمان، هەموو ساوام بە نزا خستە ڕەحمەتی کردگارەوە پەنایان بدات لە حەرامە هەرە بەدەکەی سێ دەنگی «ش - ه - ڕ» کە هەرچی بەدایەتی لە مێشک و ورێنەدا تێپەڕبێت لە خۆیدا کۆی کردۆتەوە تا ئەوەی بڵیمەت پەیدا نابێ بەدایەتییەک هەڵبەستێ لە ناوەڕۆکی شەڕدا نەڕسکابێت.

من شەڕ نەویستم لەبەر بەدایەتیی دیاری و پەنامی، هی هۆش دەرککردووی و وەهمزادی کە بە هیچ زەینێکدا تێپەڕ نابێت، بگرە شەڕ وەها بە ڕقمەوە نووساوە هەندێ دەرفەتی شادیی پەیوەست بە شەڕ لە دڵمدا دەمرێت کە خەڵق پێی دەگەشێنەوە: زەنەی تاریکی و کین لە شەڕەوە بۆ هەرچی پێوەندایەتیی پێوە هەبێت هەموو گەشاییەکی دەبات و جوانی و چاکەی دادەلەنگێت بەوەدا وێنەی سەرکەوتن لە شەڕی دیفاعیش لەبەر نیگا و بیروڕامدا پەتیارە ڕەنگ خۆ دەنوێنێت چونکە نیوەی هەرە نازدار و مەردانەی «شەڕی سەرکەوتوو» نوقوم بووە لە خوێن و ئاگر و وێرانی، نیوەی لە جەهەننەم بە سێیەکە زار و چواریەکە چاو و هەناسەبڕکێی خەفەکەر بزەی دێنێ، هەرگیز بیرناکەم کە دروێنەی مەرگ حەتمی نییە وەک کژ لە دوا کژی ساڵ هەتا فەرامۆشی و خەندە و سەما بە دوایدا وەک گەشانەوەی بزە بێ لە شایی بووکێنی و میهرەگانی بەهار. سەماکەری ناو ماتەم سەمای نەدەکرد ئەگەر ماتەمەکە لە بیرەوەریی مەرگی خۆی بووایە، بە تەڕەدەماغیشەوە هەڵنەدەپەڕی ئەگەر گەشەی سەرکەوتنی فاتیحەی بۆ گیانی کوڕە شەهیدەکەی خوێندبایە... ژنانی جگەر سووتاو لە ئاڵقەی سەماکەراندا ڕوویان دەڕننەوە، لەخۆڕازییەکیش هەڵپەڕکێ لە نێو ئاه و نزاداراندا دەکات. سەرلەبەری مرۆڤایەتی بە هەڵەدا دەچێت ئەگەر بە دوا شەڕدا مل

لە ناز و فیز بنێت لە جیاتی خەفەت و پەرۆش، چەندێکیش خەڵق خۆگیری بکات لە کەفەڵ و کەمەربادان پشکێک لە دزاندنی شەڕ گل دەداتەوە مەنعی شەڕێکی دیکە یان دواخستنی مسۆگەر دەکات.[130]

یەک لە دیمەنە سەیرەکانی زۆری و کەمیی خۆشبوون بە شکانی دوژمن لە دوو حاڵی جودادا ئەوە بوو کە گەلی فرەنسە بایەخی ئەوتۆی بە سەرکەوتنی سوێندخۆرەکان لە شەڕی جیهانی دووهەم نەدا لەچاو ئەو شادییە شاگەشکەدارەی پێیەوە بەرەوپیری کۆتایی شەڕی یەکەمەوە چوو، تومەز هاندەری نەفسی لەوەدا کە سەرکەوتنی شەڕی دووهەمی بە هی فەرەنسە دانەنا، لە بیری بردەوە چ فەرقێکی بێرەزا هەبوو لە نێوان ژمارەی کوژراوەکانی شەڕی یەکەمی و شەڕی دووهەمی.

من ئەگەر فرەنسەیی بوومایە لە دووهەمدا پتر شاد دەبووم تا یەکەم، سەبەب بە کەمیی خوێنێکی تێیدا ڕژا بوو. ڕۆژگاریش سەلماندی کە مرۆی فرەنسەیی پاش شەڕی دووهەم بە خۆدا ڕاپەڕمووتر و نازۆتر دەرچوو، پاڵپشتیشی ئابوورییەکی بە پێزتر و مەرکەزێکی نێودەوڵەتانی چەسپاوتر بوو. ڕەنگە هی وەها هەبێ بڵێ بەدیهە بڕیاردەرە لە ڕەوابوونی شادمانیی گەشکەدار لە کۆتایی شەڕێکی سەرکەوتووی دادپەسنددا. تەنانەت لە سروشتی شتاندایە کە گەشەی مرۆ لە سەرکەوتنێکی خۆکرد تێرتر و زلتر بێ لە سەرکەوتنێکی هەڤاڵکرد. منیش دەڵێم هەر چونکە ئەو بەدیهەو سروشتانە زۆر ئاشکران پتر سوور دەبم لەسەر لغاو گرتنە زاری شادیی سەرشێت لەو تەرزە بارانەدا چونکە هەر ئەو نەفسانەی بەدیهە و سروشت خستنیە سەر باییبوون بە سەرکەوتنە دادپەسندەکەیان هەر خۆیان بە بڕیاری بەدیهە و سروشت گوڕیان بەست بۆ باییبوون بە سەرکەوتنی ستەمکار، نە گەلی فرەنسە دوای شەڕی یەکەم دەستی شل کرد لە خەفەکردنی سووریە و هیندی چینی، نە گەلانی سۆڤێت، دوای شەڕی دووهەم، لە خۆیانیان بە عەیب زانی جزیرەی سەخالین لە ژاپۆن داگیر بکەن وەیا خۆ بسەپێنن بە سەر هەموو ئەورووپای ڕۆژهەڵاتدا.

---

[130]- ئەو ئێوارەیەی کۆتایی شەڕی عێراق و ئێران بڵاو کرایەوە خەڵکی بەغدا ڕژانە کووچە و شەقام و کۆڵانان بە سەما و ئاوپڕژێن و هەلهەلە. من گوتم ئەگەر تۆسکاڵێک هەستیان هەبایە دەبوو لەم دەمەرا تازیە دابنێن. . زۆری نەبرد شەڕی «ام المعارک» هەڵایساوە.

یەک لە فەلاکەتە زلە نابەرچاوەکان ئەوەیە کە زۆرینەی خەڵق دەروونکوێرن لە ئاست تێکەڵبوونی پیرۆزیی دادپەسەند و ستەمکار کە حەق و ناحەق تێیاندا تێک دەلکێن، ئەو خەڵقە فەرمانبەر و خۆشجڵەوە بۆ قووت دانی تەبریری هەر بابەتێک بێت کە لێی خۆش دێت و هەرگیز هەستی بۆ قووڵایی ئەو قمە شیرینە نارِوات تا «زەهری ناو ڕۆن»[131] ـەکەی تێدا بدۆزێتەوە لەورا هیچ شەڕێک نەقەوماوە و ناقەومێت بێ ئەوەی دوو مۆری شەیتانی پێوە بووبێت، یەکێکیان ئەوەیە کە دەقەومێت تیزێکی زێدە کوشندەی لەگەڵدایە بە کارەساتی شەڕەکانی پێشووتر. دووهەمیان ئەوەیە کە هەر لایەنێکی شەڕخوازبێت بەتەمایە سەربکەوێت و زەرەرەکانی تێبهێنێتەوە. [دەبێ بڵێم شەڕی بە سەردا سەپاو و ناچاری بەر ئەم حیسابە ناکەوێت].

ئاپۆرەی وڵاتە یەکگرتووەکان خۆی نەخوراند کە حکوومەتەکەی دەستی دایە تێکەڵبوون لە کاروباری ڤیێتنام، تا شەڕ درێژەی کێشا و خەتەری ئامسا بێ ئەوەی ئەسەری کۆتایی پێوە دیار بێت ئەوسا، ماڵی ئاوا بێ، کەوتە خۆی بە نماییشت و تورِەیی و نارِەزامەندی و دواییش مجێزی کەوتە کار و پڕ بە دڵ چەپڵەڕێزانی گێرِا بۆ کەوتنی نیکسن، چارەسازی شەڕی ڤیێتنام. ڤیێتنامی ئازادکراویش کە دەرفەتی بوو کەمبۆجیەی داگیر کرد بە بەهانەی ئەوتۆوە هەمووی لە ماوەی کورتدا پووچایەوە و مایەوە داگیرکارییەکی زۆردار لە بێدەسەڵاتی دەکات و کردوویەتی.[132]

زۆر دەگمەنن کەسانێکی خەتی هەڵاواردنی شەڕی دادپەسندیان لە ستەمکار دەرک[133] کردبێت مەگەر ئەو شەڕەی لە نێوان دوو لایەنی بێگانەدا ڕووی دابێت و ستەمکارەکەیان تێدا تاوانبار کردبێت. لەوانەیشە هەستیارێکی زێدە هۆشیار ستەم و دادێکی دیتبێت لەو شەڕەی خۆی تێدا بەشدارە بەڵام ئەو هۆش و هەستەی خۆی لە

---

[131]- «زەهری ناو ڕۆن» زاراوەیەکی عەڕەبییە لەو تەرزە شوێنانەدا بەکار دێت.

[132]- دواتر ڤیێتنام ڕووی خۆی سپی کردەوە کە بە پیاوەتی لە کەمبۆجیە دەرچوو.

[133]- دەرک وشەیەکی کوردی ڕەسەنە، لە کۆندا «دەرش» بووە وەک لە ئاڤێستادا بە کەڵەباب گوتراوە «پروو دەرش» بە واتای «زووبین» کە بەر لە مەلی دیکە ڕووناکایی بەیان دەبینێت.

بیر خۆی بردبێتەوە سەبەب بە دژواری هەڵوەست لە تەرزە حاڵێکدا کە دەست شل کردن لە داوێکی ناو پەنجەکانی خەتەر بهاوێتە سەر ئەنجامی شەڕەکە با ئەو دەست شل کردنەش هەمووی ڕەحمەت و داد بێت چونکە دوژمنی خەندەقی بەرانبەر لەوانەیە هەلی دەست شل کردنەکە بقۆزێتەوە بۆ پتر باهەڵدانی داوەکانی خۆی.

زۆر بە سەیری ڕێکەوت وەها بوو ئامۆژگاریی بینەقاقە گوشین لە ئاشتیخوازێکەوە بێت کە کەڵەشاعیرێکی عێراقی بەم بەیتەی ڕووی داوای لە عەبدولکەریم قاسم کرد:

فضیق الحبل واشدد من خناقهم
فربما کان فی ارخائه ضرر

واتە:

پەت تەسک بکەوە و توندتر بینیان بگرە
لەوانەیە شل کردنی زەرەربەخش بێت

بڕیاری قەزا و قەدەریش سەیرتر بوو لە بەیتەکە بەوەدا پەتەکە بە دەوری ملی کەسانێکەوە تەنگ بۆوە کە شاعیر دەیەویست بیانپارێزێت بە لەناوبردنی ناحەزەکانیان. ڕەنگە عەقڵ بسەلمێنێت لەوانەبوو سەرەنجام سەلامەتتر بێت ئەگەر ئەو بەیتە و هی ئەوتۆیی لە دروشم و بەیت، بانگەوازی بەرەو ڕەحمیان کردبایە.

هەرچۆنێک بێت و چاویش دەپۆشین لەوەی گوترا لە بارەی شەڕی ڕەوا و ناڕەواوە، قەزا لە قەڵەمی لە چارەنووس کێشا و شەڕ هەڵایسا و دەوری هەشتا مانگێکە دەهاڕێت و شەلاڵ دەکات و تێکدەشکێنێت، شەڕ بەرپابوو و درێژەی کێشا و لە ئاسۆکانمان بوو بە هەور کە تیشکێک نادات ئەرز و ئاسمانێکی بێ گەردی تێرا ببینین تا لە ئاسۆی هەرە دووریشەوە کۆتاییەکی بەدەر بداتەوە چونکە ئێران مەرجێکی بۆ عێراق داناوە قورستر و ئەستەمتر بێ لە شەڕەکە، مەرجەکەشی لە زەرفێکدایە پتر بە لای موستەحیلدا دەچێتەوە نەک مومکین، ئەو پیاوەی هەڵکێشانی بە مەرج گیراوە وەک نووسینێکە لە مەڕمەڕ هەڵکەندرابێت یان وەک نەخشێکە دابێتیەوە بەر و پشتی قوماش، ناسڕێنەوە مەگەر بە نەهێڵانی مەڕمەڕ و قوماشەکە. گریمان ئەو بابایە لە خۆوە مەرجەکەی سەلماند یان ویستی بێ مەرج و دەردیسەری لاتەریک بێت، لە

کوێوە ئەو ئیمکانە دەدۆزینەوە بۆ خۆ دزینەوە و سڕینەوەی دەوری لە قیادە و لە کیانی عێراق کەوا دەڵێی پێکەوە تێک چڕژاون، لەمەشدا درێژە پێدان بێ لزوومە چونکە لە خۆوە دەرگای داخراوە، بگرە دەرگە نییە بکرێتەوە یان داخرێت.

شەڕەکە وەک دیارە شتێک نییە بێژەر لەسەر بنەمای بڕانەوەی بدوێت، کۆتاییشی لە تەشبیهدا وەک مردن و ژینە کە هەر دەبێ ڕوو بدات، بەڵام «إعمل لدنياك كأنك تعيش ابدا – بۆ دنیات بکۆشە وەک کە هەرگیز نامریت»، ئیتر چار ناچارە دەبێ مامەلە لەگەڵ شەڕدا لەسەر بەردەوامبوونی بکرێت «حتى يقضي الله امرا كان مفعولا – تا خوا حوکمێک دەدا کە دەبێ بێتە جێ» هەرچی گەشبینییەکی بەرەو فەرەحناییشەوە بکرێت کە لە سەر ڕاستییە بەرهەستەکان هەڵنەستابێت دەبێتە پسۆک کردنێکی ترسناک لە عەزمی خەبات بە چ دۆعایان تێنایەتەوە.

کە شەڕ وەها بە وجود و چارەنووسمانەوە بەند بێت نەک بە پەراوێزی ڕەنگین و فش هەڵاتووی باییبوونی بەتاڵ و حەتاڵ و بابەتی تەڕدەماغییەوە، دەبێ پێوەندیم بە ڕاستییەکی دەمەتەقە هەڵنەگرتوو مێشکۆڵەی پەیکەری قسانم بێت تا ئەگەر لەبەر هۆی گرنگی بەرژەوەندی نیشتمانی دەربڕینی ڕاستی وەزەحمەت کەوت لێی ڕەت دەبم بۆ مومکینی دیکە و هەرگیز وەستایی بە خەرج نادەم ئەوەندە باتڵە تێکەڵ بە قسەم بکەم کە دەربڕینی ڕاستییەکەی پێوە ئاسان بێت، شکۆی هەڵکەوت و قودسییەتی ئەمانەت ژوورووی هەموو چاودێرییەکەوە دێت پەکی مومکینبوونی قسانی لەسەر کەوتبێت.

لێرەدا ڕووی وتووێژم وەلای گەلێک سەروبەری شەڕ و تێدا هەڵسووڕانی پسپۆڕانەیەوە دەچێت کە هەست دەکەم پێویستە کام بیروڕای بە پێوانەیە بیخەمە ڕوو، چەندێکی پێشم بکرێت کنە لە کاکڵی شتی پەردەپۆش بکەم «ولا تحسب الشورى عليك غضاضة – ڕاوێژ وەرگرتن لە خۆت بە عەیب مەگرە». من لە سەروبەری پلانسازیی هەڵسووڕاندن و نەخشەکێش کردنی تەکتیک و ستراتیجدا نیم تا ناڕازییەک یەخەم بگرێت بەوەدا من خەریکی شتێکم لێی بەڵەد نیم چونکە ئەو لایەنانەی پێوەندییان بە سەرلەبەری شەڕ و هەموارکردنی کۆسپەکانی و لە گەڵیدا ڕاهاتن و شریتەی پێکەوە بەسترانی حاڵوباری نێوماڵ بە خەتی ئاگرینی زۆرەملێیەکەوە هەیە گەلێک سەرەباسی تێدان، بۆ یەکێکی وەکوو من کە لە چل ساڵ پترەوە بەشداری ڕەوتی تێکڕایەکی وڵات

بووم بە نائاشنا داناندرێن. ئنجا ئەوەی دەیڵێم تۆبزی لە کەس ناکات تا ئەگەر بیروڕایەکی دروستم دەربڕی لە دەرخستنی شکستێک یان گردوکۆییەکی پەسند یان وەلا خستنی خەتەرێکی لەبیرکراو ڕەت کردنەوەی لە دەست بڕیاردەراندا دەبێت بەوەشدا خەتەر و زەرەرێک لە قسەکانمدا نامێنێت. بۆیەیە دەڵێم:

یەکەم ڕاستی بنەڕەتی لەوەی پێویستە بگوترێت و جێی باوەڕ بێت ئەوەیە کە ئێمە ناتوانین شەڕ بدۆڕێنین و پێشمان ناکرێ بچینە ژێر باری دۆڕاندییەوە چونکە شیمانەی[134] لەگوین ئەوەیە عێراق هەڵدەوەشێت[135] و بڕبڕ دەبێت و بە تالان دەچێت:

- فرەنسا شەڕی 1870 و 1939ی دۆڕاند و هەڵنەوەشا.
- ڕووسیا شەڕی 1904 و 1914ی دۆڕاند و هەڵنەوەشا.
- ئەڵمانیا دوو شەڕی جیهانی دۆڕاند و شان بە شانی دەوڵەتە زلەکان ڕاوەستا.
- ژاپۆن شەڕی 1945ی دۆڕاند و لە هێزە ئابوورییە تۆقەڵانەکان دەژمێردرێت.

چانس لە تەرازووی شەڕدا بە پێی حاڵوباری دەوڵەتان دەگۆڕێت و دەشێ لە ڕۆژگارێکەوە بۆ ڕۆژگارێک جودا بێت. هەرچی چانسی عیراقە لەسەر پشکبوونی سەرکەوتن و دۆڕاندن چانسێکی سنوورکورتی بەرتەسکی هەناسەسوارە و تەنها خوازی سەلامەتی لە دەستدایە یان بە ئاشتی یان سەرکەوتن یان شەڕ تا ساڵی دوو هەزار و بەولاتریشەوە. من ناڵێم و ڕەفز دەکەم بڵێم «لنا الصدر دون العالمين أو القبر - یان لە بەرایی هەموو جیهان یان گۆڕستان» بەسمانە عێراقمان هەبێت، بێ ئەو هەر قەبرە بەختمان.

ئامانجی «سەلامەتی عێراق» پێویستە، لە پێداویست و ناوەڕۆکدا، هەموو ئامانجێک بە خۆوە بگرێت، چ زۆر چ کەم، لەوانەی سیاسەتی دەوڵەتان دەخەرێکێنن، لزومیش

---

[134]- شیمانە: احتمال.

[135]- تورکیا چاوی لە کۆنە ویلایەتی موصلە و ئێرانیش تەمای بە باشووری عێراقەوە هەیە.

نییە ئامانجە جوداکان بژمێرین با بڵێین سێنە یان هەزارن، حەزی دەکرد چوار جۆر و دوو هەزار جۆر بێت، مەرج ئەوەیە، کەموزۆری خزمەتی ئامانجی «سەلامەتی عێراق» بکات. گەلێ جار دەبیسین و دەخوێنینەوە: هەموو شتێک بۆ خاتری مەعرەکە... سەرکەوتن ژووررووی هەمووانە... بەڵام قسە دەرپەڕاندن و دروشم هەڵکردن خۆی لە خۆیدا کارێکی هیچ لە خۆ نەگرتووە تا دەبێتە کردەوە. گومان لەوەدا نییە، ئەو مەسرەفە و ئەو پارەیەی لە دە هەزار دروشمی موناسەبەیەکدا خەرج دەکرێت بە مەیدان کەم سوودترە لە کڕینی ئەمبولانسێک یان فەراح کردنی ژوورێکی نۆشگەی سەربازان یان بۆ کارخانەیەکی دووچەرخان. ئنجا ئەگەر هەموو ئامانجێک بخرێنە ناو ئەو تاکە ئامانجە گرنگەوە، پێی ناوێ بڵێین مجێز و کەیفە لە نەخشەکێش کردنی پلانی ئابووری و سیاسەت لە هیچ ڕووکارێکدا جێی نییە و نابێتەوە.

ئێمە پێویستمان نییە ببینین وەزیرێک یان پارێزگارێک ئاپۆرەیەک دەوری داوە لە دەمی هەڵبڕینی شریتی گوشاد کردنی پڕۆژەیەک بایی ئەوەی پێویستمان هەیە پڕۆژەکە خۆی خزمەتی ئەرکی جەنگاوەریمان بکات، بە ئیشە نەک بە ڕیش. پڕۆژەمان دەوێن و زەمان لە شەڕگەدا بەردەوام بکات. گەردەنی بەرپرسی زل لە ئەرکی شریت هەڵبڕینەوە ئازاد بێت. مەبەست لەم قسانە بێفەڕ کردنی هاتوباتی عادەتی نییە لە موناسەبەی خۆیدا بەڵکوو مەبەست هێمایە بۆ حەزە پەرەسەندووەکەی جیهانی سێیەمە بۆ ڕواڵەتپەرستی کە بریتییە لە دابڕان لە نەبزی ڕۆژگاری سەردەم و وازهێنانە لە کاری گرینگ بۆ کاری بێفەڕ. لزوم نابینم چی دیکە لەم بارەوە کنە بکەم کە بایی پێویست لە خۆوە ئاشکرایە.

دوای ئەم دوو ڕاستییە کەوا شەڕ بەبەریەوە هەیە درێژخایێن بێت و ناشتوانین بیدۆڕێنین ئەو ڕاستییە دێت کە ئێران سوورە لەسەر دەوامەی شەڕ نەک چی دەیکات چاوەڕاوە.

بەڵێ، مەنتیق ناسەلمێنێ مرۆ خۆی لە شوێنی غەیردا دابنێت و پێشبینی لە کردە و نەکردەی دوارۆژی بکات، بەڵام حەقیەتی لە ڕوودانەوە بۆ ئەو ئامانجە بچێت کە دەشێ مەبەستی ڕووداوەکە بێت، ئنجا ئەگەر لە سەرجەمی ڕەفتاری ئێران پەی بە عەزمی ئێران ببەین لەسەر دەوامەدان بە شەڕ بەڵگەدۆزییەکی دروستمان کردووە

دەشی ببێتە بنەمای کار، بگرە دەشێ لە هێمای کاروباری ناو ئێران لە دوای ڕمانی شا و بەسترانەوەی چارەنووسی ڕژێمی سەرچەرمگ بە بردنەوەی شەڕ و دۆڕاندنییەوە، وێڕای سروشتی ئایدیۆلۆژییەکەی کە لەسەر بنەمای تەنینەوە و بڵاوبوونەوە هەڵنراوە، لە هەموو ئەوانەوە تێبگەین ئەوەی ئێران دەری دەبڕێ بە ڕاوێژی ڕەسمی گردەبڕ لە ڕەفزی ئاشتی، هەڵوەستێکی هەرە دوایین و سەلمێنراوە بە پێی فەرمانی بارودۆخی زەقوزۆپ کە سەرپێچی تێدا ناکرێت.

ئێران سوورە لەسەر بەردەوامبوونی شەڕ و لێی ناوەستێتەوە مەگەر هێزی جووڵەی پێ نەمێنێ چ لەبەر وشکایی هاتنی وزەی بێت و چ بە دەست تێوەردانێکی هێزی لە خۆی گەورەتر بێچارە بوەستێت.

چوارەم ڕاستی ئەوەیە کە خاکی ئێران چوار هێندەی عێراقە و دانیشتوانیشی سێ ئەوەندە [بگرە زیاتریش] بەوەدا قووڵایی ستراتێجی بەشەریی جوگرافی فاکتەرێکی بنەڕەتییە لە پێداگرتنی ئێران لەسەر دەوامە پێدانی شەڕ بە دەم ئومێدێکەوە کە بەندە بە مەنتیقی ژمارە. بێگومان بەکەمزانینی تەفاووتی وەها زل کاری عەقڵ نییە: دەبێ هەمیشە تێی بخوێنینەوە کە دوژمن چوار هێند و سێ هەند خاک بەرینتر و ژمارە فرەترە. بەڵام ئەو هەڵکەوتە دەچێتە بەر فەرمانی ڕاستیی دواوە: ڕاستی پێنجەم دەڵێ، ئێران دەوڵەتی هێرشبەرە. ئەگەر هێرشبەر و خۆپارێز لە چەک و ئیرووی و تەیاری پێکەڵپێک بن ئەرکی سەرشانی هێرشبەر قورستر دەردەچێت تا خۆپارێز.

ئەم ڕاستییەیان یەکێکی دیکە لە خۆیدا هەڵدەهێنێت کە تایبەتە بەم شەڕەوە بریتییە لەوەی ئێران پەکی بە مەرگی سەربازەکانی نەکەوتووە و بێپەروا شەڕ بە گۆشتیان دەکات. لێرەشدا دوو کاریگەر هەن: کاریگەری خەرجیی شەڕ و کاریگەری گیان بەفیڕۆدان کە بە هەردوویان بەشی زۆری کەمی و فرەیی چانسی عێراق و ئێران لە زەوی و مرۆ تێ دەبات. هەر لەم ڕاستییەشەوە ئەم بەدیهییەیە دەفامینەوە کە فاکتەری «مرۆ» لە سپای عێراق هێندەی پارەی نایاب نرخدارە، زەکای کومەندانی عێراقیش لە مەعرەکەدا بەوە تاقی دەکرێتەوە تا چ ڕادەیەک قوربانی دان بە هەند هەڵدەگرێت بۆ وەرگرتنەوەی «راقم»ـێک وەیا داگیرکردنی سوپێرێک و بردنەوەی تێک هەڵقژانێک، ڕەنگە لەوەشدا نیسبەتی «یەک بە سێ»ـی زەرەری گیانی بۆ ئێمە و

ئەوان لای هەرەکەمی لەبار بێ بۆ ئێمە چونکە لووسرۆیی[136] مرۆ وەک لووسرۆیی پارە لە ژمارە سەددا زووتر وشکایی دێت تا ژمارە سێسەد، قسەش لێرەدا لەسەر ڕواڵەتی حاڵوباری بەشەریی هەردوو وڵات و توانای هەڵگرتنی زیانی بەشەرییان هەڵدەستێت کە چۆن عەکس دەبێتەوە سەر هەڵوەستی عەسکەری هەردوو لا. وردە حیسابی دیکە هەن پێوەندییان بە ژمارەوە نییە وەک تەدبیری ژیرانە لە ڕێک خستن و هاوجۆر کردن و خەتی شەڕگە کورت کردنەوە و بژاردەکردنی شوێنان و شتی ئەوتۆیی کە تێکڕایان دەخلیان دەبێت لە نرخی ژمارەی دانیشتووانی وڵات و سەربازەکان.

ڕاستی شەشەم ئەوەیە، فاکتەری کات دژی هێرشبەرە چونکە خۆپارێز تا گیانی لەبەردابێ ناچارە خۆی و ماڵ و منداڵی بپارێزێت کەچی هێرشبەر لە کارێکدایە پێوەندیی بە مانەوە نییە، لە ئەسبابی گوزەرانیش حیساب ناکرێت و پێبەپێش قورساییەکەی زیاد دەکات کە ساڵەوساڵ کاری نەیاری لێ بەدەر دەداتەوە. لە حاڵی ئەوتۆییشدا خوازی بەردەوامبوونی لە دەستدا نابێت وەک کە خۆپارێز ناچارە بەردەوام بێ لە دەستکردنەوەدا ئیتر سەیر نییە ئێران شێوازی خۆکوژی بەکار بهێنێت بۆ ئەوەی لە فاکتەری «کات» ڕزگار بێت وەک کە بێت لە حەفتەیەکدا قوربانی بایی ساڵێک بدات بۆ یەکالاکردنی هەڵوەست، عێراق چونکە نایەوێ بە هێرش[137] شەڕ بباتەوە پێویست دەکات شارەزای شەڕی بیندرێژ بێت ئەویش هونەرێکی فرەلکە وەک کە ساختمانی حکوومەت و خەڵکیش فرەئەژمارن. فاکتەری نەفسی و شعوری گشتی تیرێژەکانی سپا لە پلەی یەکەمدا و هی سەرلەبەری گەل لە پلەی دووهەمدا دەبێ مامەلەی زیرەکانەی لەگەڵدا بکرێت، سەرباز بەردی بناخە و بنگەی بنگان و کەمەر و سینە تا دەگاتە دوو شانی پەیکەری دیفاع کردنە لە وڵات و نامووس، کوشندەترین گیانکوژی هەڵمەتیش ئەو سەربازەیە بە دڵێکی لەرزۆک و دەروونێکی گوماناوی بۆ شەڕی مەرگ و ژین دەچێت کە دڵنیا نەبووبێت لەوەدا ئەو واقیعەی

---

[136]- لووسرۆیی: «سیولة» وەک لووسرۆیی پارە: سیولة النقد.

[137]- ئەم نووسینە لە دەمی شەڕدا بڵاوبۆتەوە، ساڵی 1988، ئەوساش دەمێک بوو عێراق وازی لە هێرش بردن هێنابوو.

تێیدا دەژیت و خۆی دەکاتە قوربانی لە پێناو بەردەوامبوونی بۆ منداڵەکانی و خزمانی و تێکڕای گەل، ئا ئەو واقیعە هێندە بە نرخە خۆی بۆ شەهید بکات. با لەبیر نەکەین، مزەخۆرێکی حکوومەتی کە سەرۆک دایەرەکەی لە تەرفیعی دواخست بۆ یەکێکی بەرەژێرتر، بایی داڕووشانی شعووری لەو غەدرەی لێی کرا خۆ لە سەربازی
دەشارێتەوە، کە لە شەڕیشدا ڕووبەڕووی مەرگ بوو هەست دەکات بایی غەدرێکی لە وەزیفەدا لێی کراوە خوێنی بە فیڕۆ ڕۆیشتووە، ئەگەر گیانی هەڵگەڕانەوە دژی غەدر لە مرۆدا نەبزوێت لە سەرەتاوە نە شۆڕش و نە ڕاپەڕین پەیدا دەبێت. دوای کەمێک دەگەڕێمەوە بۆ ئەم قسەیە.

هەرچی لایەنی حاڵوباری ناو هەردوو وڵات و مەرکەزی ئابووریيان و پێوەندییان بە دەوڵەتانەوە لە گۆشەنیگای تەئسیریان لە ئەرکی حەرب و هەڵوەستی عەسکەرییەوە هەیە، قسەیان لێوە ناکەم لەبەر هۆی جۆراوجۆر یەکیان ئەوەیە باری ئێستاکەی زۆر شتان سەراحەت هەڵناگرێ و بە بەرەوە نیشتنیشیان لە ڕادەبەدەر درێژ خایێنە و گەلێک تێبینی دیکەش هەیە لە ڕۆژناماندا[138] جێی نابێتەوە، لە سەرەتای نووسینیشدا گوتوومە وتووێژی لەنگەر دالەنگاو...

ئەو ڕاستییەی باسکران هێندێکیان بابەتەکی[139] بوون وەک ژمارەی دانیشتوان و پانایی زەوی، هێندێکیشیان پێوەندی بە سەرجەمی حاڵوباری خەڵکەوە هەبوو چ لێرە و چ لەوێ، لەوانەش بوو حاڵوبار جۆرێکی دیکەش بێت لەچاو هی ئێستا، بەڵام حاڵوباری وەها خزم لەگەڵ تێبینی، بەو شێوەیەی خستمە بەر چاو، وەک ڕاستییەکی ئەزموو[140] خۆی دەنوێنێ دەشێ متمانەی پێ بکرێ لە هەڵنانی موعادەلەی سەربە شەڕ و ملانێ و شتی ئەوتۆوە. هەر لەبەر تیشکی گرنگیی ئەو ڕاستییانە و پایەیان لە وزەی خەباتدا بیروڕای خۆم دەڵێم لە جۆری ڕەفتارێکی لایەق بە خێزانی ناو ماڵەوە بێت، خوێنەریش لە قسەکانمدا شتێک ناخوێنێتەوە پەنجە درێژ بکات بۆ ئەو ڕاستییە بنەڕەتییانەی

---

[138]- ئەم نووسینە لەسەر داخوازی ڕۆژنامەی «الثورة» بوو بەڵام عوزری هێنایەوە لە بڵاونەکردنەوەی.

[139]- بابەتەکی: موضوعي.

[140]- ئەزموو: تەجرەبە کراو. لە پەندی کوردی هەیە دەڵێ: ماستی ئەزموو چاکترە لە نەزموو.

عێراقی بەسەرەوە ڕاوەستاوە: چە دەیڵێم مافێکی سەربە هاونیشتمانییەتی و واجبێکی ئەمەکدارییە بۆ نیشتمان خۆی کە لە جغزی ئازادیی تەعبیرەوە دەچێتە پێش لایەنێکی ڕەسمی کە دەزانێ چ جۆرە بابەتێک بڵاو دەکرێتەوە خۆ نەشرەی نهێنی نییە بە دزییەوە دەرچێت. پێی ناوێ بڵێم، بیروڕایەکی دەری دەبڕم لەو بابەتە گرنگەی کە شەڕی عێراقە لەگەڵ ئێران دەبێ پاڵاوتەی پاڵاوتەی بەرهەمی تەجرەبەم بێت لەگەڵ گرفتەکانی سەردەم و کێشەی فیکری و ڕۆشنبیرییەکانی و لەگەڵ ڕووداو و ڕاستییەکانی ژیانی نێو وڵاتی و ڕێڕەوە ڕامیارییەکانی و هێزە کاریگەرەکانی تا ئەگەر هەڵسوکەوتیان بە ناوهێنان نەدرکاندران دەبێ دەورێکیان بووبێ لە پێک هێنانی بیروڕامدا، شتێکیش نییە ژوورووی لایەنی مرۆڤایەتیی هاونیشتمان بێت تا بەر ڕەخنە و نرخاندن نەکەوێت، لە عێراقدا تاکە مرۆیەک لە سەرووی قیادە چەپارە دەدرێت لە ڕەخنە، باقی خەڵق ئادەمین و ئادەمیش خۆڵنژادە و تێکڕاشمان هاوچارەنووسین.
ڕاوێژی قەڵەمیش دوو پاکانەی هەیە یەکەمیان کە من تاکێکم دوور لە دەسەڵاتی ڕەسمی و دوور لە حیزبایەتی و دوو لە هەموو ئیعتیبارێکی تاکی عادەتی جەب دەدات لە گلەمەندی. لەمەو پشت بەستنم بە هێزی ڕاستی ڕوونەوە و لایەنی بەرژەوەندی گەش لە قسەکانمدا تاکە پەنای منن، ئۆباڵی دڵ و دەروونی گومانکاریش با لە ئەستۆی مندا بێ ئەگەر بۆ زێدە متمانە قسەکانمی نایە بەر عەیارەی هەرە گومانخوێنەوە، شتێکی تێدا نادۆزێتەوە بە زەرەری دوژمنی عێراق تەواو نەبێت.

پاکانەی دووهەم ئەوەیە کە من بۆ پاراستنی بەرژەوەندی خۆم قسە بۆ بەرژەوەندی گشتی هەڵنانێم چونکە ئەوەی لە خێراتی وڵات بە من دەگات کەمترە لە موعەددەلی داهاتی تاکێک کە سەرجەمی داهاتی وڵات دابەش بێت بەسەر ئەندامانی خێزانەکەی هەموو عێراقدا، بەوەدا من لە عەیارەی بەرژەوەندا بابایەکی بێمزە و خۆ لەبیرکردوو دەردەچم لە ئەرکی بیروڕای نازگیراو خەریکبوون بە داڕشتنی دروستەوە و چوونە ژێر باری قورس لە ورد دەربڕینی سازشت دان و ڕاست کردنەوەی شتی گرنگدا. لەم ڕوون کردنەوەیەدا، جگە لەچاو کردنەوەیەکی تێیدایە، دەمەوێ وەرامی بەشێک لە ڕەملگرەوەی بەدنیاز بدەمەوە کە پرسەپرسییانە بە دەوری شێوە سەراحەتێکی لە نووسینەکانمدا هەیە، بە لایانەوە بۆ ئەوەی یەکێک بوێرێ سەریح بێت ئەوندە بەس نییە باوەڕی بە خۆی هەبێت و لە بەرپرسان و خەڵقیش ڕاپەڕموێت پەسندبین بن،

نەخێر دەبێ ئەم کاسەیە نیو کاسەیەکی تێدا بێت هەتا یەکێکی وەکوو من بتوانێ لە سەراحەت بێترس بێت. منیش لە لای خۆمەوە باوەڕم هەیە دەبێ مرۆ ڕاستبێژ بێت لەگەڵ خەڵق و لەگەڵ هەرچی پێوەندیی بە بەرژەوەند و کاروباری گشتییەوە هەبێت. هەر ئەمەیش بیروڕام بووە لەوەتەی دەستم داوەتە قەڵەم، لەوەشدا تووشی تەنگەتاو کردن و ڕەنجاندن نەهاتووم،[141] بگرە لە ڕۆژانی ئێستاکەشمدا بە ڕاشکاوی باوەڕی خۆم بڵاو دەکەمەوە و لە هەندێ نووسینمدا پشتیوانی «مەعنەوی» و دنەدانم لە بەرزترین دەسەڵاتی دەوڵەتەوە دیتووە، ئەویش لەبەر سەراحەت و ڕاستیی نووسینم و ڕێک هاتنی لەگەڵ پێداویستی بەرژەوەند [ی گشتی] ئیتر چۆناوچۆنی دەشێ بیروباوەڕ بشارمەوە مادەم دەربڕینی مومکین بێت؟

ئەگەر لە دارایی دنیا شتێکم شک بردبایە و چەکێکم لە دەست دابایە، غەیری قسە دەمکردە بەشداری لە منەوە بۆ بەهێز کردنی سەنگەرەکانمان و پتەو کردنی ڕێزەکانمان بەڵام تەنها یەک دەمانچەی مەیلەو بێفیشەکم هەیە بە دەستییەوە سەغڵەت دەبم تا حەڵاڵزادەیەک ئیجازەیەکم بۆ نوێ دەکاتەوە. وا لە منەوە بۆ گەلی عێراق تا بچووکترین ساواکەی... بۆ خاکەکەی تا نوختەی ناوەندی زەوی... بۆ ئاسمانەکەی تا بورجەکانی و ئەوجی ئەستێرەکانی... بۆ ئاوەکەی تا ئەو ماسییەی ژێر گایە مەوهوومەکەیەوە... بۆ هەمووان گەرمترین ئەڤین و ناسکترین سڵاو ڕاسترین ئاوات و دڵسۆزترین نزا و ئومێد و ڕوونترین باوەڕی گەشە پێشکەشە بە وشەی ئەوتۆوە کە دەبوو بە حەق بگەشێتەوە و بە یەقین بدرەوشێتەوە و ڕووەو پەرستگەی ڕاستی پرشنگ بداتەوە بە ڕووناکی و ورشەی دڵبەستەیی و وەفا «يكاد زيتها يضئ ولو لم تمسسه نار - زەیتەکەی خەریکە بێ ئاگر مەشخەڵ بدات»، ئنجا کە ئیمکان کورتی هێنا و وزە پەکی کەوت و توانا خەفە بوو، با نیازی پاکم بە سەر پردی عەزیمەتەوە زەنە بۆ مەرەکەبم بکات، دڵۆپ دڵۆپ وشەی خاوێن و ڕێزپاریز بتکێنێت، ئەمەیشە دوایینی توانام و ئەوپەڕی هیممەت لە بانگەوازمندا و دەڵێم:

---

[141]- ئەم نووسینە هی سەردەمێکە خەتەری داگیر کردنی عێراق هەڕەشەی دەکرد، قسەش ڕووی لە گەلی عیراقە. چەپییەکان لە 1975 چەکیان بۆ دەوڵەت هەڵگرت زۆریشیان لە ڕەشوڕووتی بێلایەن بە کوشت دا. بە هەموو عومرم لای هیچ حکوومەتێک نەبووم، ئەو ڕۆژە ڕەشانەی تێیدا وەزیر بووم کاری ناچاری بوو: دووهەم فەلاکەتی سیاسییە لە ژیانمدا.

ناشێ نه سستی و نه خاوی و نه وەخران هەبێ لە بەجێ هێنانی فەرمانی هەرە شکۆدار و پیرۆزی خۆ پاراستن لە فۆتان و زێد چەپارەدان لە هەڵوەشان، ڕێگەی ئەو کارەش بە گوڵ و ئاوریشم فەرشپۆش نەکراوە لە ڕووبەڕووبوونی دوژمنێکی دڕی مەرگنەواز و پشوودرێژ لەگەڵ ناڕاحەتی و بردەباری قورسایی تا ئەوەی بەشی زێدە زۆری بە هەوەس مەرگیان لا خۆشترە تا ژیان. هەزاران نموونەیان تێدایە دەروێشەکانی «حسن الصباح»ی قەڵای «الموت» بە بیراندا دەهێننەوە کە بە جووڵەی ئەنگوستێک وەیا بە نیگای گۆشەیەکی چاوی مەعبوودەکەیان هەناوی خۆیانیان بە ئاگر داغ دەکرد و خۆیان لە شاخ هەڵدەداشت.

هەر گوتەیەکی ناجۆریش بێت لەگەڵ ئەم ڕاستییەدا خۆدزینەوەیە لە حەقیقەتێکی تاڵ بۆ وەهمێکی تاڵتر کە دەزانین هەرگیز ئاسن بەوەدا شل نابێتەوە بگوترێ نەرم و تەنکە، ئاکامی خۆ تەفرەدانیش بە کەم کردنەوەی سەرزارەکی لە هێز و پێزی دوژمن هەر دەکێشێتەوە بۆ خاوبوونەوەی هەڵمەت و خوو گرتن بە بێباکی چونکە خەڵک ناچێتە ڕاوە ڕێوی بە ئەبزاری ڕاوەگورگەوە، ئنجا کە زانرا نێچیر گورگە نەک ڕێوی و کەروێشک، دڵشکستەیی و بە دوا ئەویشدا «بەرتەکی نەیار»[142] سەر هەڵدەدات.

ئاخنینی مێشکان بە ئومێدی قەناعەت هێنان بە بێهێزی و بێورەیی دوژمن لە حاڵێکدا سوودی دەبێ کە ئەو ڕووداوانەی لەگەڵ بێهێزییەکە ناگونجێن سەرپۆش بکرێن، ئەمەش لە ئیمکاندا نییە. عێراق ئەو ترسەنۆکە نییە لە تەنگانەدا بشێوی ئەوەندەش ئازایە بەرگەی زەبر بگرێ، ئەو توانەش هی عێراقی بێت یا هی خەڵقی دیکە دادەلەنگێت بایی ئەوەی لە مامەڵەت کردندا پشتی پێ نەبەسترێت. بەڵام سەراحەتی بێ سنوور لە تێکڕای ئەو کارانەی خۆشیبەخش نین شتێکە سیاسەتی گەلان پێی هەڵناگیرێت: لە گۆڤارێکی ئەمریکایی گوتارێکم خوێندەوە بە سەرناوی Right not to know – «مافی نەزانین» لە لایەن «معلق سياسي»ی «والتەرلیپمان»ـەوە لە بارەی حاڵەتی ئەوتۆوە کە دەبێ هەندێ ڕاستی و ڕووداو لە میللەت بشاردرێتەوە کە زانینی زەرەربەخشە. ئەم تەرزە بابەتانە بە هەردوولادا، درکاندن و شاردنەوە، دەدرێتەوە بە دروستبینی و وردقرساندن، چی گرنگیشە لەوەدا ئەوەیە کە میللەت بە جۆرێک

---

[142] – بەرتەکی نەیار: رد فعل سلبي.

بئاخێوریّ باوەڕی پێ بهێنێت و هەست و هۆشی، لە نەزەر خۆیدا ڕێزلێگیراو بووە. حاڵ لە چەقی شەڕگەدا هەرچۆنێک بێت سەرباز بە چاوی خۆی دەیبینێت و ئازایی و ترسەنۆکی دوژمنەکەی لێ ڕوونە ئیتر چ سوود هەیە لە بەرەواژ کردنی حاڵوبار بۆ بەرچاوی بەقاڵ و مەلای بانگدەر و ئاسنگەری شار.

شاردنەوەی هەڵکەوت یەکجار بە سوود دەبێت ئەگەر فێڵی پێ لە دوژمن بکرێت، لەوەشدا نموونەیەکم دێتەوە بیر لە ڕووداوەکانی پاش کەوتنی فەرانسە لە شەڕی دووهەمدا کە بریتانیا جاسووسێکی ئەڵمانیای میوانداری کرد کە ڕاینواندبوو بازرگانێکی ئیسپانیایی یان پۆرتۆگالییە، بەریتانیاش لەوپەڕی بێهێزیدا بوو. وزەی شەڕی کەم بووبوو، ئیتر گەشتێکی بۆ میوانەکەی ڕێکخست کە دیدەنییەک بە فڕۆکە لە سکۆتلەندە بکات، چەند پۆلێکیشی[143] لە فڕۆکی شەڕکەر تێگەیاند لە هاتوچۆ دابن. بە نزیک فڕۆکەی میوانەکەوە هەتا وابزانێ فڕۆکەمان لە ژمار نایەن بەوەشدا ئەڵمانیا دەستخەڵەت بدرێت بەو ڕاپۆرتەی کە بێگومان کابرای جاسووس بۆ ئاڵمانەکانی دەنێرێت کە بارەی زۆری فڕۆکەی شەڕکەری هەرەباشی ئینگلیز بەڵکوو عەزمی ئەڵمانیا دەشکێ لە داگیر کردنی بریتانیا.

چیرۆکێکی دیکەش هەیە لە چیرۆکەکانی سەربە هێزی پارێزگاری ئاسمانیی بریتانیاوە لەوەی پێی دەگوترێ مەعرەکەی بریتانیا ئەویش وێنەکێشی «درۆی سوودبەخش» دەکات بۆ ناوەوەی وڵات کە ڕۆژێکیان وەها دەنگ بڵاوبۆوە هێزی فڕۆکەی ئینگلیز «وێڕای هێزی تۆپی دژە تەییارە» 186 فڕۆکەی ئەڵمانیای خستووە بەوەشدا شەپۆلێک لە تەووژمی گیانی نیشتمانی و باوەڕ بە سەرکەوتن لە شەڕ هەموو بریتانیای گرتەوە و زەنەشی کرد بۆ دەوڵەتەکانی «کۆمۆنوێڵث» و ئیدارەتی بریتانیا لە پشت بەحرانەوە. مستەر چێرچیل [دواتر سێر چێرچیل] لە یاداشتی خۆی بەرانبەر ئەو ڕۆژەوە دەڵێ: پاشدان دەرکەوت بە پشکنین و تۆژینەوە ژمارەی تەیارەی خستراو 36 بوو بەڵام ژمارە 186 کاری خۆی کردبوو کە قمێکی وزەبەخشی زلی نۆشاند بەو نەفسە سووتاوانەی تینوو بوون بۆ سەرکەوتنێک بەسەر دوژمندا پاش ئەو هەموو تێشکانانەی تاڵ و قورس کە نایەنە گوتن.

---

[143]– پۆل: سرب – Squadron.

ڕەفتاری سەراحەتئامێز و پەردەپۆش لەگەڵ خەڵکدا کارێکی هەستیارە، قاڵبوونەوە و شارەزایی گەرەکە هەتا ئاکامی پەسندی هەبێت، بەڵام ئەوەی جێی متمانەیە لەم کارەدا بێفەڕیی پۆشینی حەقیقەتە مادەم خەڵک زانیبێتی چونکە ڕەفتاری وەها عەزمشکێن و باوەڕکوژە لە تەنگوچەڵەمەدا. بەڵام گرنگیی ئەوەی گوترا لە تەک شێوازی مامەڵەکردن لەگەڵ سەربازدا کەم دەبێتەوە چونکە هەرچی چارەیەکی سەر ئەرز و پەندی ناو مێشکی فەیلەسووفان و چەندێک مەعلانی لە فەندی ڕاگەیاندن[144] هەیە بێکەڵک دەبێت ئەگەر دەروونی سەرباز نەحەسابێتەوە بەوەدا کە قەناعەتی هەبێ جانفیداییەکی دەیکات باشترین شتێکە دەیکات، گیانێکی کە هیچ هاونرخی نییە لە ماڵ و کوتاڵ و ناز و فیز و پەیکەرێکی دوای مەرگی لە زێڕ بۆی دابڕژێت. گیان ببڕای ببڕای هاونرخی نییە مەگەر تاکە شتێکی ئیعتیباری کە بریتییە لە باوەڕهێنان و قەناعەت کردن بەوەی کە ئامانجی ڕۆح فیداکردنەکە زلتر و نرخدار و عەزیزترە لە ڕۆحەکە، ئنجا ئامانجەکە چی دەبێت بابێت، وەک ئەبووجەهلێک خۆی بە قوربانی شکۆی «لات» بکات وەیا تەماعکارێک کوڕی خۆی بکوژێت لە پێناو پارە یان شەیدایەک خۆی بهاوێژێتە مەترسییەوە بۆ گەیشتن بە یارەکەی.

بەڵام سەربازەکان، هەموویان، لە تاکە فەرمانێکدا دەگەنەوە یەکتر ئەویش پاراستنی مەفتەنە لە دەستدرێژیی دوژمن. ئنجا ئەگەر فەرمانەکە نەگەییشتبێتە ڕادەی باوەڕێکی بنەڕەتی لە ناخدا، سەرباز لە خۆوە بەرەو پیری خەتەرەوە ناچێت و مەرگ پەسند ناکات مەگەر هیچ چارەی نەمێنێ، چ دەردیشمان تیمار نابێ و کەلێنی شکستی نەفسی پڕ ناکەینەوە بەوەدا پێی بڵێین خائین و ترسنۆک ئەوەندە نەبێ کە ئەو تەرزە ناتۆرەیە لە خەسارەی مەرگەکەی زیاد دەکات. باشترین موژدەیەکی بە بووکی ببەین بۆ ناحەز لیستەی دوور و درێژە بە ناوی سەربازە ڕماوەکانمان. دەبێ بزانین، بەڵکوو بە تەواوی دەزانین کە «الجود بالنفس أقصى غاية الجود - بەخشینی گیان هەرە ئەوپەڕی بەخشینە» چونکە هیچ شتێک لە سێبەری مەرگدا بایەخی نامێنێت. کاتێک یەکێکمان دەردی لێ تیر بوو یان تەنەتاوی بێورەی کرد هەست دەکات نرخی شتان دەپوێتەوە و نوقمی هیچایەتی دەبێت ئنجا چۆن نرخ بە شتێکەوە دەمێنێت کە

---

[144]- ڕاگەیاندن: اعلام.

لێی بێئومێد بوو، چ ئومێدکوژێکیش نییە وەک مەرگ. بەر پتر لە هەزار ساڵ شاعیرێکی عەرەب لە غەیری مەیدانی شەڕ و خۆ قوربانی کردن بێژەیەکی نموونەیی گوتووە لە بارەی بێئومێدبوون لە شیرنترین ئاواتی دڵی شەیدا:

أتت وحياض الموت بيني وبينها
وجادت بوصلٍ حين لا ينفع الوصل

کە هاتە لام هەرێمی مەرگ لە نێواندا بوو
وەسڵی پێ بەخشیم کە کەڵکی پێوە نەمابوو

سەربازێکی لێشی چاوەڕوان دەکرێت بەرەو مەرگەوە بڕوات دەبێ گوماندار و دڵکرمێ نەبێ لەوەی کە خەریکە خۆی بە قوربان بکات، ئامانجیش هەرگیز جودا نابێتەوە لەو حاڵوبارەی تێهەڵکێش بووە لەگەڵیدا، بەڵێ مەفتەنویستی دوو عاقڵ تێیدا دژ ناوەستن بەڵام واتای نیشتمان هەر خاک و ئاو و هەوا و گیا و کارمامزی لەوەڕگان نییە، بەڵکوو ئەمانە و چی پێوەندیی بەوانیشەوە هەیە لە کەلەپووری سەربە ڕابوردوو و بەندیدارییەکی خۆڕسکی نێوان خەڵق و ئارامییەکی ئۆقرەی پێوە دەگیرێت و کەرامەتێکی بەندە بە گوزەرانەوە وێڕای حاڵوبارە بێئەژمارەکانی کۆمەڵایەتیی ڕەسمی و ئەهلی، هەمووی هەر نیشتمانە و چ کەمایەتییەکی پەیدا بێ لە پشکی سەرباز لەو لایەنە ئیجابییانەدا بەدیار دەکەوێتەوە لە ڕژدبوونی بۆ جانفیدایی. ئنجا ئەگەر «کەمایەتی» بوو بە داشکاندن پتر خاو دەبێتەوە تا ئەگەر داشکاندن بوو بە سووکایەتی ئەوسا سەرباز بەسەر خەتی نێوان خیانەت و ئەمەکدارییەوە دەوەستێ و هەر ترسی سەرکەوتنی دوژمن دەمێنێتەوە چەپارەی بدا لە خیانەت.

مامەلە لەگەڵ سەرباز لە چوارچێوەی بەرفرەوانی هاونیشتمانییەوە و لە سەرەتای منداڵی قوتابخانە و گەڕەک تێهەڵدەکشێت بە پێپلکەی تەمەندا بەرەو مەیدانانەی پتر بەرپرسییەتیان پێوەیە بەتایبەتی دایرەکانی حکوومەت کە یەکێکیان قوتابخانەیە و تەنها خۆشخولقی کاربەدەست تێیاندا کەرامەتی تاک دەپارێزێت. بەڵێ ڕاستە بڵێین

خەڵکیش وەکوو سەرباز بەرانبەر شکۆی دایرەی ڕسمی بێدەسەڵاتن، بەڵام ئێمە قسەمان، لە پلەی یەکەمدا، ڕووی لە سەرباز و شەڕ و پێوەندیی هەردوویان بە حاڵوباری مەیدانی مەدەنییەوە و لە ئەسەری ئەو حاڵوبارەی لە سەرباز بە دەر دەداتەوە هەرچەند دەزانین عەیارەی پەسندی ژیاری[145] - کە ڕەفتاری پێ دەنرخێنیت - لەو ئاووهەوایەی نامزەدی سەربازەتی تێدا دەژیت چاکە بە هەموو کۆمەڵ دەگەیەنێت - نەک هەر سەرباز - بەڵام قسەی تێدا درێژ ناکەینەوە.

نامزەدی سەربازەتی شیرمژی ئەو کۆمەڵگایەیە کە تێیدا دەڕەسێت و بەرهەمی پەروەردەبوونی لە گەڵیدا فراژی دەبێت. لەم ڕۆژەشدا هەزاران هەزار سەرباز هەن کە لە سەرەتای شەڕدا مێردمنداڵە بوون، ئەو سەربازانە بە ناچاری ڕژاونەتەوە قالبێکەوە کە هەڵکەوت بۆی دارِشتوون. گریمان لەوانەبێ مرۆ سەرلەنوێ لە قاڵەب بدرێتەوە. خۆ ئەو سەربازانە لەبەر تەوژمی شەڕ دەرفەتیان نەبووە لە نوێوە دابڕژێنەوە یان ڕێنموونییەکی خەستوخۆڵیان لەگەڵدا بکرێت، دیارە خوویان بەو جۆرە ژیانەوە گرتووە کە لە چەندین ساڵی شەڕدا[146] بەسەریان بردووە... زۆر بە سەیری تێکەڵبوونی مرۆ لەگەڵ دەوروبەرەکەی وەها ڕەوا دەبینێت کاریگەریی نایەتی[147] ئاوڕوگەی قووڵتر لە نەفسیدا هەڵبکەنێ تا کاریگەریی ئایەتی،[148] قسەش لەوەدا درێژە، هەر ئەوەندەی تێدا دەڵێم کە لەوانەیە تاکە ڕووداوێک هێندە ئاکامی نایەتی پێوە بێت بکشێتەوە بۆ شێوان یان کەسایەتی لەرزۆک یان گوماناویبوون یان یەک لە نەخۆشییەکانی فۆبیا.

چەندێکیش کۆمەڵایەتیمان ژیوەر بێت ئەو نەخۆشییە نەفسی و ئاکارەکی[149] کە بە شێوەیەکی گشتی ئەسەری لە دارِشتنی کەسایەتی سەرباز و خەڵکی دەردەکەوێت، ئاسانتر دەسڕێتەوە هەرچەند دەزانین بەرپرسایەتی ژیاری ئەمانەتێکە بە ئەستۆی

---

[145]- ژیاری: حضاري.

[146]- ئەو چەندین ساڵە لە گوتارەکەدا بە هەشتا مانگ قرسێندراوە.

[147]- نایەتی: سلبي، نەرێتی.

[148]- ئایەتی: ایجابی، ئەرێتی.

[149]- ئاکارەکی: اخلاقي.

هەموو کەسێکەوەیە کە لە سێبەری ئاڵایەکی بە هەوا شەکایەوەدا دەژیت بەڵام بەرپرسایەتی لەم و لەودا خوارووژوور دەکات بە پێی توانای هەر کەسە لە ڕاست کردنەوەی چەوتی و لەبارکردنەوەی نالەباری.

بێگومان بەرپرسایەتیی مامۆستایەکی زانکۆ زلترە لە هی چاودێرێکی دارستان و لێرەوار، هەروەهاش لە پارێزگارێکەوە بۆ کاتبێکی دایەرەی نفووس. لەو ناوەشدا خەتێکی زێدە بەرچاو هەیە لە نێوان جۆرەکانی بەرپرسایەتی، ئەویش خەتی سنووری نێوان حکوومەت و گەلە. لێرەشدا سەرگوزەشتێکی بە سفتوسۆ هەیە لێ لادانی مومکین نییە: لە کۆنی کۆنەوە گەلان، بە تێکڕایی و هی جیهانی سێیەم بەتایبەتی، هەتا ئەم سەردەمەش ترسیان لە حکوومەت هەبووە و هەیە، بەردەوام دیوارێکی زلی زراوڕژاوی هاونیشتمانی عادەتی دادەبڕێت لە تێکڕای مووەزەفان و خاوەن دەسەڵاتەکانیان بەتایبەتی. سوڵتەی حکوومەتی تەنها لە حاڵەتی مەنعی دز و ستەمکار نەبێ، هەمیشە هۆی ترس و بێئۆقرەیی خەڵق بوو، تەنها چارەیەکیش لەوەدا هەبووبێ مجێزی فەرمانڕەوا بووە و بەس، هەر قسەیەکی پێچەوانەش بکرێت بە هەزار وێنەی تەجرەبەی ڕۆژانە بە درۆ دەخرێتەوە. خەڵکوخوا، بە عادەت، لە ناچارییەوە نەبێ سەربە دایەرەی حکوومەتدا ناگرن مەگەر کەسانێکی تەمای قازانجی نارەوایان هەبێت یان یەکێکی دۆستایەتی و خزمایەتیی بە مووەزەفێکەوە هەبێت بە سەردان یا لە موراجەعەدا بچێتە لای... لەو وڵاتانەی شۆڕشیان تێدا بقەومێت سەبەب بە قودسییەتێکی وەپاڵ حکوومەتی شۆڕش دەدرێت ترسی بەردەوامی حکوومەت لە دڵاندا زیاد دەکات. تا ئەگەر بەرهەڵستی کردن لە حکوومەتی پێش تەمووز [ی 1958] بە وەتەننەوازی لە قەڵەم درابێت هەموو موخالەفەیەک لە 14/7/1958 ڕا بە خیانەت یاخود بە تاوان ژمێردراوە.

ئەمەش ڕاستییەکە -عەرەب گوتەنی- دوو بەرانی لەسەر نایەنە شەڕەقۆچ. ئێمە لە هەڵوەستێکدا نین حاڵوباری وڵاتی شۆڕشاوی هەڵسەنگێنین و چارەی ئەو گرفتانەی بدۆزینەوە کە زادەی شۆڕشن چونکە ئەو باسە بە بەر خەریکبوونی ئێرەمان ناکەویت، بە دمەوە نیشتنیشی دەمانگێڕێتەوە بۆ شۆڕشی فەرەنسە و سەرلەنوێوە بەو شۆڕشە زلە و چووکانەدا بێینەوە تا ڕۆژانی سەردەم و ئەو نەتیجەیەی لێ بەجێ گەیاندنیان و نەبوونی لایەنێکی سێیەم هانای ببرێتە بەر.

ئێمە قسەمان لە دیواری ترسی نێوان فەرمانڕەوا و ئاپۆرەی خەڵک ناچارمان ناکات بچینە ناو شیتەڵ کردنی بابەتی شۆڕشانەوە و ئەوەندەمان بەسە لە حاڵوباری عالەمی سێیەمەوە کە سوور بین لەسەر پێداویستیی ئاووهەوایەکی مرۆی عادەتی بتوانێ تێدا ژیان و هاونیشتمانیەتی خۆی، بێ دەمارکشتی و قوتاغبوون، بەسەر ببات بەڵکوو بشێ وەچەی ئێستا و دوارۆژ پەروەردەیەک بکرێت کە ئاکاری زێدپەرستی و هەستی بەرپرسایەتیی تێدا پسۆک نەبێ لەبەر زێدە تەقیە و ترسی لێ پرسینەوەی کردەوەکانی. ماڵم هەقە ئافراندنی کۆمەڵگای ئەوتۆیی لە زەمانێکی چاو تێی بڕکات مومکین نییە بەڵام وازیش ناهێنرێ لە سەرلەبەری شتێک کە هەمووی نایەتە دەستەوە «ما لايدرك كله لايترك كله» هەمیشەش ئەفراندنی سەربازێکی گیان پتەو بە کەم کردنەوەی هۆی چپاندنی شەخسییەت بە پێویستێکی زەرووری دەمێنێتەوە. شەڕ و پێداویستییەکانیش لە بەیندا نەبن ئازاد کردنی وەچەی ناوباو و فەراقە لە گرێی وشتبوون بە مل کەسانێکەوەیە کە سیاسەتی گشتی هەڵدەسووڕێنن.

چارەی یەکسەری ئەم نەخۆشییەش لە دەست مەئمووران بە تێکڕایی و دەسەڵاتدارەکانیان بەتایبەتی دایە. گەییشتنیش بە حاڵەتێکی کە هاونیشتمانی لە دیتنی پۆلیس و کەسانێکی جلکی دەسەڵاتدارییان لەبەرە. نەتۆقین کارێک نییە بەند بێ بە نامونکینەوە، بگرە دەبێ هاونیشتمان لە هیچ شتێک ترسی نەبێت مادەم تاوانێکی نەکردبێ. لە وڵاتی پێشکەوتووی وەکوو سویسرە و سوید پۆلیس بە خۆیدا دێتەوە ئایا هەڵەی کردووە یان نا، هاونیشتمانیش بە خۆی و مافە قانوونییەکانی تەواویەوە چاودێرە بەسەر بەرپرسی گشتییەوە.

لە سەردەمی ملووکییەت گوتەیەکی بەربڵاوم هەڵدەگێڕایەوە و دەمگوت «پارلەمان بەرپرسە لە لایەن حکوومەتەوە» چونکە زۆرینەی ئەندامەکانی لە ئەندامەتییان قەرزداری حکوومەت بوون.

بەسەر ڕاگەییشتنی ئەو بژێودەرە مەعنەوییانەی ئەسبابی کرانەوە و وێک هاتنەوە دەڕژێننە ناو دەروونی مرۆ، کارێکە بەولای ئیمکانەوە. بەڵام ئەگەر پەی بردن بە جۆرەها چارەی ئیجابی تا وەک قومە دەرمانی زەقوزۆپی لێ بێت زۆر زەحمەتیش بێ، خۆ تەیاربوون دژی سەلبییەت کە شتێکە لە بابەتی خۆپارێزی بەولای ئیمکانەوە نییە،

هەر نەبێ سەبەب بە ئەوەی کە لە شکەفت و حەشارگەی زات و هۆشی وندا[150] چورتمەکانی دیواری ترس ئاشکراترین و خەتەرترین هۆی وێک هاتنەوە و چوونە قەپێلکن ئیتر دەشێ هۆی ترس بنەبڕ بکرێت یان لە ئەسەری کەم بکرێتەوە مادەم سەرچاوەی ناسرا. لە نموونەدا دەڵێم ڕەنگە بزانین یان نەزانین فڵانە کەس بۆچی لە تاریکی دەترسێت بەڵام دەزانین بۆچی لە پارێزگار[151] تۆقیوە، بەو پێیە چارەی ترسی تاریکی بێدەرمان دەبێ هەتا پزیشکێکی نەفس هۆیەکەی دەدۆزێتەوە، ترسی پارێزگاریشی دەشکێت لە دیتی دەرگەی ژوورەکەی کراوەتەوە و پۆلیسی بە سەرەوە نییە و بزەیەکی بێفێڵیش بە دەوری سمێڵەکانیدا دەشەنێتەوە. ڕەنگە مجێزی خوێنەر لە گوتارەکەم خۆش بکەم بەوەدا نوکتەیەکی زراوڕژاوی ترسی سوڵتان لە دڵاندا بۆ ئێرە ڕاگوێزم:

ڕۆژگارێک تورک فەرمانڕەوا بوون لە میسر کە یەکەم جار پیاوێکی میسری بوو بە «متصرف» لە ئەسکەندەرییەوە ئاپۆرەی خەڵقی شار، ڕۆژ لە دوا ڕۆژ، سەریان لێ دەدا و بە دەوریەوە دەمانەوە هەتا لێیان وەتەنگ دەهات، پیاوێکی تورکی سمێڵ بابڕی زراوتۆقێنی هەبوو ڕاوێژی پێ دەکرد و لە گەڵیدا بڕیاری دا کە سبەینێ دیوانەکەی پڕ بوو لە هەواڵپرسان لێیان بە ژوور کەوێت دەریان کات و بەوەدا لێیان ئاسوودە بێت. سبەینێ لە دەمی وەعدەدا یاوەر بە خۆی و قەمچی زلی و چاوی دەرپۆقیوی و چیهرەی گرژییەوە لێیان چووە ژوورەوە و نەعرەتێکی لێدا دەرچنە دەرەوە... موتەسەڕڕیف بەر لە هەمووان بۆی دەرچوو و هەڵات.

قسە لەبارەی هەڵگرتنی دیواری ترسەوە لە پۆرگی ئەم گوتارەدا جێی نابێتەوە. دایەرەی ڕەسمی سەرەتای هەیە و کۆتایی نا، پلەی بیرۆکراسیش لەمیان بۆ ئەویان خواروژوور و لێکتر جودان بە پێی پێداویستی خۆ پاراستن لە کاری سەربە «تەخریب»، جیهازی واشیان تێدایە تا بڵێی فرەهێزە لە تۆڵەستاندنەوە و خۆیشی دەورەکێش دەکات بە شوورەی بێ تیک لە ئەسبابی خۆپارێزی.

---

[150] – هۆشی ون: عقل باطن.

[151] – پارێزگار: محافظ.

لەوانەیە مامەڵەیەکی ڕەسمی لە دایەرەیەکی حکوومەت بە ڕیسێکی گرێیاویدا تێپەڕێت لە جۆرەها «صلاحیة» و لیژنە و ڕاویژکاران خاوەن بەرژەوەند تێیدا گوم دەبێ، ڕەنگە تەڵەبخوازێک ڕووبەڕووی گوتە نەمرەکەی «دوای حەفتەیەک سەر بدەرەوە» لە چەندین ژووری تاکە یەک دیوان ببیستێت، بارەها وابووە تەڵەبخواز لە «استعلامات» تێپەڕی نەکردووە بۆ هیچ یەکێک لە بنگە سەلاحییەتدارەکان.

لەوانە هەموویدا هاونیشتمانی عادەتی بارقورس دەبێ بە هەستێکی وەڕسکەر لە چاوەڕوان کردنی حاڵەتی ناڕەحەت کە غەیری لێ وسکتبوون و کشانەوە چارێکی تێدا نابینێت. ئنجا کە من دەرفەتم نەبێ بۆ بەیانی چارەی «ئاسان کردنی زەحمەت» و ئەو واجیبەش با ناچاری بکەوێتە زیممەتی بەرپرسە هەرە گەورەی پیاوە ڕەسمییەکان بە ویژدانێکی ئارامەوە دەڵێم واجیبی دایەرە ڕەسمییەکان بریتییە: لە سنووری ڕژدی[152] دەرنەچن بەرەو تۆقاندن و ترساندن. دەبێ کە هاونیشتمانی دەخرێتە دایەرەیەکی حکوومەت هەست بکات دەچێتە شوێنێکی ئەمین نەک شکەفتێکی چیا کە مۆڵگەی غافڵگیرییە.

بێگومان لێرەدا دەتوانین پێ داگرین لەسەر هێندێ کە ئازادیی دادگە و بوونی بە ساختمانێکی پەنادەر، کە ژووری هەموو تێوەڕامانێک بێت، گەورەترین بارمتەی ڕێزڕاگرتنی ماف و هەست و کەسایەتیی هاونیشتمانە دژی دەستدرێژی لە هەر لایەنێکەوە بێت. سەربەخۆیی دادگە خۆی لە خۆیدا دروستترین عەیارەیە بۆ پێوانەکردنی مەودای ژیاریی هەرچی وڵاتێک بێت.

مەسەلەیەک سەر بەو شتانەی گوتران لەلایەن سەلامەتیی جەبهەوە لە ڕواڵەتدا پێوەندیی بە شەڕەوە نییە، مەبەستیشم زەویداریی فەلاحە بەتایبەتی لە شریتی سەر سنوور و لەهەر کوێیەک ئیحتیمالی تێک هەڵقژان لەگەڵ دوژمن بە بیردا بێت چونکە مرۆ باشتر و بەهێزتر و ڕژدتر دیفاع لە شتێک دەکات یەکسەر و بێتەئویل بە هی خۆی بزانێت نەک پشکێکی لە ملکی عموومی خەڵک هەبێت. گەلێ جار لەو بابەتەوە دەمەتەقەم بووە لە دەمی باسی ئەو حاڵەتانەی فەلاحی وڵاتی ئیشتیراکی ڕموودەی داسەپاندنی «تعاونیات» نەبووە، گوتوومە و دەیڵێمەوە ئەگەر شۆڕش لەو وڵاتانەدا

---

[152]- ڕژدی: حزم.

دامێنێت لەوەدا کە بەرژەوەند لە تەبایی ناخۆیی بێ خیلاف و یەکتر کوشتن بدۆزێتەوە دەسا ئەو دامانە هەرچی داوایەکی شۆڕش کردوویەتی لە تێگەیشتنی مێژوو و کۆمەڵایەتی و ئابووری و بەرژەوەندی پرۆلیتاریا هەمووی بە درۆ دەخریتەوە ئیتر چۆن تەکلیف لەبەر وەرزێری نەخوێندوو دەنێ کە حیکمەتی زێدە پەسندایەتیی ملکایەتی تێکڕایی لە ملکایەتی سەربەخۆی لە زەوی و زار بسەلمێنێت. خۆ ئەوپەڕی ملکایەتی تێکڕایی لە باشترین ئیحتیمالدا هەر ئەوەیە پشکی وەرزێر لە تێکڕایی پێکەڵپێک بێت لەگەڵ پشکی لە هی تایبەت بە خۆی کە دەزانین هاتنە دی ئەم ئیحتیماله هۆش و بەدیهە و تاقی کردنەوە بە درۆی دەخاتەوە کەسیش لزوومی پێی نییە و زەرروورەت دەخوازیی ناکات چونکە ملکداریی وەرزێر شتێک نییە عەقڵ نەیسەلمێنێ و ناشێ کێڵگە لە فەلاح عەزیزتر بێ.

سکرتێری حیزبی دەسەڵاتدار لەو وڵاتانە ڕازی نابێ دەسەڵاتەکەی تێکڕایی بێت لە نێوان خۆی و هەڤاڵەکانی ئەندامی لێژنەی ناوەندی کەچی خۆیشی لە بەکارهێنانی ئەو دەسەڵاتە دەیەکی دەیەکی ماندووبوونی فەلاح بە زەوییەوە ماندوو نابێ ئیتر بۆ دەبێ فەلاح بە کەمزانیی خۆیەوە مەعلان بێ لە تێگەیشتنی ئەو فەلسەفانە و بیردۆزییانە و بێنەوبەرانە کۆمەڵایەتییانەی خاوەنایەتیی دەوڵەت لە پارچە ئەرزەکەی فەلاح ڕادەشکێنن بەسەر خاوەنبوونی خۆی لەو ئەرزەدا. مەسەلەکەش هێند ئاشکرایە نەبێتەوە... سەلامەتیی جەبهەی شەڕیش لە هێرشی بێگانە وا داوا دەکات ئەو ئەرزەی دراوسێی سنووری دوو دەوڵەتە ملکی فەلاح بێت هەرچەندە بەوەشدا جووتەوەری[153] لە یاسادا پەیدا ببێت، خۆ جووتەوەریی زۆر و زەوەندمان هەیە لە شێوەی دیکەدا کە لزوممان پێی نییە و لێرەشدا جێی بەبەرەوەنیشتنی نییە.

قسە لەم بوارەوە درێژە، وازی لێ دەهێنم بۆ دەربڕینی بیروڕام لە بارەی چۆنیەتیی مامەلە کردن لەگەڵ سەربازی ژێر سیلاح. هەرچەند بایی پێویست ئاگادار نیم سەرباز چۆن پەروەردە دەکرێت دیسانەوە ڕەنگە تێبینییەکانم سوودیان پێوە بێت «وذکر ان نفعت الذکری».

---

[153] – جووتەوەری: ازدواجية Dualism.

دیاره ئەگەر خەریکبوونمان بە لەبار کردنی حاڵوباری ژیاری و ئاوهەوایەکی نامزەدی سەربازی تێدا دەڕەسێت بە نیازی ئەفراندنی سەربازێک بێت لە وشتی و گرێوگاڵ ڕزگار بووبێت و دوودڵی نەکات لە جانبازی خۆ حاڵوباری دەمی خزمەتی فیعلی و مەیدانەکانی هەنگامە بەولا تەریقەوە دەبێ تەیارتر بن بە ئەسبابی لە خۆ ڕادیتن و قوربانی دان. بۆ نزیک خستنەوەی مەبەست دەڵێم ئەگەر بابایەک هەزار دیناری [ساڵی 1987] خەرج کرد لە داوەتێکی شاهانە و بە میوانانی گوت: فەرموون ئەی گێلەپیاوەکان بخۆن لەو نیعمەتەی لێتان زیادە، داوەتەکەی، بەو قسە لەوجەڕە، سەرلەبەری ئیفلاس دەکات.

کەم شارەزاییم ڕێم نادات بە دوای تەفسیلات بکەوم، بە کورتی دەڵێم: لە پێویست پێویستترە کەرامەتی سەرباز بپارێزرێت و هەرگیز ناشێ زەپتوڕەپتی عەسکەری بکێشێتەوە بۆ تەنگەتاو کردن و چ سوودێکیش لەوەدا نییە ڕاهێنان و خوو پێگرتن و خستنە ئەمروگوێی سەرباز، بیکات بەو ئالەتەی بە پێی بادانی سویچ بڕەقسێت، خۆ جەبهە پڕە لە جۆرەها ئالەتی بێ هەست و هۆش دەیەوێ کارگێڕێکی خاوەن ئیرادەی ڕوونبین بە چاکی لە کاریان بهێنێت.

تەجرەبەیەکی زیندووم هەیە لە پێکەوە ژیان لەگەڵ سەرباز و پلەکانی لەشکر و زاپتەکانی، ئەویش لە ڕۆژانی نێوان 6/6/1963 تا 21/6/1963 کە لەگەڵ سێ هەڤاڵی دیکە مێوانی لیوا بیست بووین لە ڕانیە بە پێی داخوازی حاڵ.

بە چاوی خۆم دیتم چۆن مامەڵەت کردنی سەرۆک لەگەڵ بەردەستەکەی لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی دیکە جودا دەبێت و لێک دەترازێن تا ڕادەی دژوەستان. لە ڕەفتار و ئاکاری زەعیم ڕوکن - ی ئەو ڕۆژە - «سعيد القطان» و لە ڕژدی و خۆ لەبیر کردنی مودیر ئەمنی کەرکووک - ی ئەو ڕۆژە - «نوري الخياط» نموونەی وەهام دیت هەرگیز لە بیری ناکەم و هەمیشە وەک ڕووپەڕێکی گەش جلوە دەبەستێ و وەک سەرمەشقێک دێتە بەر چاو کە چۆنیەتی ڕەفتاری بەرپرسی گەورە کە هێوێنی ئینسانییەت بە لای خەڵکەوەی خۆشەویست دەکات و دەیانهێنێتە ڕیزی هەوڵ دان بۆ سەرخستنی تەقەللای. لەبیرمە کە بڕیار درا من و مەرحووم کاکەحەمەی خانەقا و مەرحووم مودیر ئەمن بچین بۆ کۆبوونەوە لەگەڵ ئەو چەکهەڵگرتووانەی عەشایەری کورد کە لە سەردەمی عەبدولکەریم قاسمەوە دژ بە حکوومەت هەڵستابوون، دەشبوو

کۆبوونەوەکە بە شەو لە جێگەیەکی ناو شاخی سەخت بکرێ کە بەشێکی ڕێگەی بە وڵاغ و بەشێکی بە پێیان دەبڕا، لە بەرپرسی عەسکەریی لیوای بیستەوە دەنگدانێک هات بۆ مودیری ئەمن کە متمانە نەکات و بەرەو مەجهوول نەچێت کە خۆی بەرپرسێکی زلە. وەرامی دایەوە کە خۆی بەرپرسایەتیی خۆی ڕەچاو دەکات، متمانەی بەو دوو هاوڕێیە (کاکە حەمە و منی مەبەست بوو) هەیە و تا بنی دنیا لەگەڵیاندا دەڕوات. سەد ڕەحمەتی لێ بێت.

زۆرن ئەو فاکتەرانەی پەسند و بەد کە بەشدار دەبن لە دارشتنی سەرباز. یەک لە ڕووەکانی تەفاوتی ئەرکی ئایەتی و نایەتی ئەوەیە، کاری سەلبی چی تێناچێت نە لە ماڵ نە کردەوە، ئەو هەوایەی کە مرۆ لە هەناسەدا دەیهێنێت و دەیبات دەشێ ببێتە وشەی لەوجەڕ و هەڕەشەی عەزمپسێن و ڕێزشکێن:

جراحات السنان لها إلتئام
ولا يلتام ما جرح اللسان

برینی تیغ سارێژ دەبێت
برینی زمان سارێژ نابێت

کەچی ڕەفتاری ئایەتی بە زۆری هەرە زۆری ئەرکدارە هەرچەند وشەی ئابڕووداریش بێئەرک حەسانەوە دەبەخشێت. بۆ ئەوەی هۆڵێ خواردەمەنی پاک بێت ماڵین و سڕینەوە و قاپوقاچاخ شووشتن و ڕێک خستنی مێزی گەرەکە وێڕای کڕینی کەلوپەلی زۆر کە هەمووی نرخدار و شکستخۆرن کەچی پیسبوون هەر ڕێک نەخستن و پاک نەکردنەوەی دەوێت. ئەمە دەڵێم بۆ ڕوون کردنەوەی زەرەری بێڕەزای مایەکی[154] و گیانەکییە[155] کە وشەیەکی نالەبار و ڕەفتارێکی بیجێ دەیبەخشێت. دەوڵەت بە لای قازانجدا دەچێتەوە ئەگەر لە بری وشەیەکی برندە سێ کورسیی لێ بشکێت چونکە

[154]- مایەکی: مادي.

[155]- گیانەکی: روحي.

ئەو وشەیە هەرچی سوودی تێکڕای کەلوپەل هەیە دەکوژێت نەختێکیش بەخۆنازینی لەگەڵدا بێت. لێرەدا بێسوود نابینم قسەیەکی مارشال ڕۆمێل ڕاگوێزم، پێوەندیی بە پتەو کردنی کەسایەتیی سەربازەوە هەیە، لەگەڵ بابەتی وتوویژیشمدا دەگونجێت.

لە کتێبی Rommel Papers کە خێزانەکەی دوای شەڕ بڵاوی کردەوە، بە پێشەکییەکی تێر و تەسەلی پسپۆڕی عەسکەری ئینگلیز، لیدل هارتەوە، ڕۆمێل لە بارەی سەربازی ئینگلیزەوە دەدوێت کە سەربازێکی نموونەییە لە ڕاپەڕاندنی فەرمان و گەییشتن بە ئامانجێکی پێی سپێررابێت بەڵام سەرپەرشتەکانی ڕایناهێنن و هانی نادەن بۆ دەردەست کردنی زێدە سوود لەو کارەی جێبەجێی کردووە. لە بارەی سەربازی ئەڵمانەوە دەڵێ لە لایەنی زێدە سوودەوە لە سەربازی ئینگلیز چاکترە بەڵام ناگاتە پلەی پێویست بۆ سەربازی نموونەیی لەوەشدا وێنەیەک لە وێنەکانی هەنگامەی «سۆم» ی دەمی کەوتنی فرەنسە لە 1940 دەگێڕێتەوە کە چۆن ئامانجی بۆ سەربازەکان نەخشەکێش کردووە لە داگیر کردنی فڵانە پرد بەسەر فڵانە ڕووبارەوە لە تاریکی شەودا و کە بەیانی سەری لێدان دیتی پردیان بە ساغی گرتووە و لێی وەستاونەوە بێ ئەوەی ئەوەی ساغڵەمی پردەکە بەکار بهێنن بۆ پەڕینەوەی زریێلییەکانیان و داگیر کردنی شوێنی ئەولاترەوە.

گوتەی مارشال ڕۆمێل لە ناوتوێژی مەعنادا ئەوە دەبخشێت کە سەرباز بۆی هەیە سەرکەوتنی خۆی بەکار بهێنێت تا ئەگەر شکستی لەو هەوڵەدا هاتەپێش گلەیی نەیەتەوە سەر. ئەگەر ئەمەی لە مەبەستدا نەبێ قسە کردن لە زێدە سوودی سەرکەوتن مەعنای پێوە نامێنێت، دەبێ بە یەک نیگا سەیری هجومی بنەڕەتی و هی سوود وەرگرتن لە سەرکەوتنی دواتردا بکرێت چونکە شکست لە حیسابدایە بۆ هەردوو حاڵەتەکە و ناشێ سزا لە حاڵەتی دووەمدا قورستر بکرێت دەنا قسە کردن لەو بەکارهێنانەی سەرکەوتن دەپووچێتەوە.

ڕێم نییە بدوێم لە جۆری تەدریب و بژاردە کردنی چەک و خۆراک و پۆشاک و ئەوەی دەلوێت و نالوێت لە خافڵان و پشووی حەسانەوە و ئیجازە... کە ئەمانە شتی ڕۆتینین لەوانەن بە عموومی یەکچوون بن یان نەبن دەخلێکم بەسەریانەوە نییە، نە لە کەم و نە لە زۆری، هەموویشی بەرپرسی خۆی و ئەرکهەڵگری هەیە. دەزانین چەکی عیراق فرە و چاکیشە، لە زۆر سەرچاوەی لێکتر جوداشەوە قسە دەبیەین لەلایەن

جۆری بەکارهێنانییەوە یەکدی ناگرنەوە، کە من کارم پێیەوە نییە مەگەر بایی ئەوەی پێوەندیی بە لایەنی نەفسی و ورەی خەباتی سەربازەکانمانەوە بێ. سەربازێکی گیانی لەرزۆک نەکرابێت هێندە لە خەم جۆری خۆراکی هەنگامەدا نابێ کە پێشتر دڵنیا بووە ئەو خۆراکەی پێی دەدرێت باشترین جۆرە لە ئیمکاندا بێت یاخود پشووی ئیجازەی کە لێ مەنع کرا دەزانێ کە لە ناچارییەوە بووە. فڵانە سەرباز مامەڵەی تایبەتی لەگەڵدا کرا، خاترانە نەبووە و هەڵکەوتێکی دەگمەن داوای کردووە. ئیتر لەم بابەتە... بەڵام لە حاڵەتی لەرزۆکبوونی گیانی کارەکە بەرەواژ دەبێ، چاکە لە مجێزیدا دەبێتە خراپە. ڕاستییەکەی، هەر جۆرە لەنگەربەزینێک هەبێت لە ڕەفتار و لە کردار گورج دەنگ و سەداکەی دەگاتە ئەوپەڕی هەرە دوور چونکە سەرباز پێوەندییان پێکەوە هەیە، خزمیان هەیە و خزمیشیان دۆستیان هەیە، کۆمەڵگە بە تێکڕایی وەک ئێستگەیەکی زلی بڵاوکردنەوەیە هێندێکی هێندێکی تەیار دەکات بە دەنگوباس.

لێرەدا پێویستە هێما بۆ ڕاستییەکی گرنگ بکەین، لە شەڕ و ئاشتیدا بە ڕاست دەگەڕێ و کە مەرجەکانی پێک هاتن هەموو حاڵەتان دەگرێتەوە و لە ڕێی لێکدانەوەش پاڵاوتە دەکرێت، زۆر وا دەبێ هەوڵێکی پڕ لە هەڵە سەردەکەوێت و وەها دێتە بیرانەوە سەرکەوتنەکە قەرزداری ئەو شێوازەیە لە هەوڵەکەدا پێڕەوی لێ کراوە کەچی سەرکەوتنەکە دژ بوو لەگەڵ شێوازەکە نەک قەرزداری بوو وەک کە یەکێکی زەهر بخواتەوە و پێی نەمرێ ژیانەکەی لە چاکەی زەهرەکەوە نییە، یان یەکێک خۆی لە بانێکەوە هەڵداشت و ملی نەشکا سەلامەتیی ملەکەی لە هونەری خۆهەڵداشتنەکەوە نەبوو. چینیش کە دوای شۆڕشی سەقافی مایەوە بە دەوڵەتێکی زل هەر ئەوە دەبەخشێت کە هێزی وێرانکەری شۆڕشە سەقافییەکە مرێنەر نەبوو، نەک چین ژیانەکەی قەرزداری ئەوە.

ئاکامی ڕەفتاری دروست و هی سەکەت تا بڵێی لێکتر دوورن تا ئەگەر بشێ خەیاڵ لە مرۆڤایەتییەک بکەینەوە کە مێژووی خاڵی بێ لە کارەسات و شەڕ و دەرد و قاتوقڕی و بوومەلەرزە و لێشاوەکە و جودایی بیروباوەڕ و شتی ئەوتۆیی لەوانە بووین واقیعێک بە خەیاڵدا تێپەڕێنین وێنە بەهەشتێک بێت لەچاو واقیعێکی بەدوا ئەو فەلاکەتانەدا کە مێژوومانیان هاڕیوە و هەر دەشیانهاڕن.

چەند سەیرە ئەم حەقیقەتە زلە پەنهان بێ لە بینینی زۆرینەی خاوەن فەلسەفە و فێرگەی فکری بەپێی ئەو موژدە خۆشکەڵانە پێمانی ڕادەگەیەنن تا ئەوەی دێن پێشکەوتنی مرۆ دەبەنەوە بۆ بنەمای «تناقض - هەڵوەشێنە» کەچی ڕوواڵەتی زەرووریبوونی هەندێ لەو «تناقض»انە وەک زەرووریبوونی ڕێخۆڵەکوێرەیە بە لەشی بنیادەمەوە خۆ ئەگەر منداڵ، بێ ئەو ڕێخۆڵەیە، زابایە[156] بۆی باشتر بوو. گەلێ جار فەیلسووفەکان دەرکەوتنی «تناقض» لە هەڵوەستدا دەدەنەوە بە فەرمانی سروشت و داخوازی شتان کە پێچەوانەکەی ڕاستە بەوەدا کە گەلێ چەشنی «تناقض» و ناڕێکی و ملانێ دژی سروشتی شتان سەر هەڵدەدا وەک داخوازیی بەرژەوەندی فەلەستین لە نەبوونی دڕدۆنگی نێوان سەرۆکەکانیاندایە نەک لە پێویستبوونی هەر هەتا براکوژیی دوای دڕدۆنگییەکە ببێتە کاری سەلمێنە[157] لە بابەتی ئەو جۆرە نوقسانی و هەڵەیەی بێلزوم ئەوەیە کە دڕی و تیژی لە ئارداوێژ و هەڵوەستی بەرپرسی عەسکەریدا هەبێ کە پێوەندیی بە تیرێژەکانی سپاوە دەکەن.

پەندێکی درەخشانی قورئان لەم ئایەتە پیرۆزەی «ادفع بالتي هي أحسن فإذا الذي بينك وبينه عداوة كأنه ولي حميم» دا هەیە بۆ نەرمونیانی لە پێکەوە هەڵکردن و چیاندنی پرووشکی بەردەستێی وشەی دڕ کە هەناوی گوێگرەکانی دەئایسێنێ. سەرباز وەک قوتابیی سەرەتایی شەیدای ئەفسەرێک دەبێت کە لە پێوەندیی پێیەوە دڵڕاگر بێ، قوتابیش وەهایە لەگەڵ مامۆستایەکی نەرم تەبیاتی ڕێزی خۆی و خەڵکیش ڕابگرێت. مرۆ لە دێرین زەمانەوە شەیدایە لە شکۆی پێشەوایدا بتوێتەوە، هی وەهاشیان تێدایە هەند گێل دەبن تا ئەوەی خۆ دەکوژن ئەگەر پێشەوا ئازارێکی گەییشتێ. ئەمەش ڕاستییەکە هەموومان دەیزانین، لە بەرەی شەڕیشدا ڕاستتر خۆ دەنوێنێت کە کار لە نێوان مردن و ژیندا جۆلانەیەتی و لە تەکیدا پێوانەی هەرزەکارانی شەیدای ئەلڤیس پریسلی و عەبدولحەلیم حافز نابوود دەبێ. ئەو زاپتە مرۆیەی هاوهەستی سەرباز و

---

[156]- وشەی «زا» بۆ دایک و مەلۆتکەکەشی دروستە چ لە فارسی و چ لە کوردی. حاجی قادر دەڵێ: «هەر کەسێ زا بە ناعیلاجی مرد». فارس گوتوەتی: «تو گوئی که اصلا ز مادر نەزاد».

[157]- سەلمێنە: بدیهی، مفروغ منه.

هەڵگری ئەرک و هەڕەشەی شەڕ بێ لەبەر چاوی سەربازدا دەگاتە پایەی قارەمانەتی موقەددەس، ئەفسانەیی، خەڵقەندەیەکی ژوورووی ڕەخنە.

لە وەزعی ئێستاکەماندا ڕووبەڕووی دوژمنێکی دڕ، پێویستمان بەو جۆرە زاپتە هەیە و ئەوانیش پێویستیان بە جۆری ئەوتۆیی لە زاپتە زلەکان هەیە. دڵنیام لەوەدا ئەگەر حاڵوبار لە مەیدانی کۆمەڵگەی خەڵک دروست بێت، پاش هەڵگیرانی دیواری ترس، و سەربازی بێ گرێوگاڵ بۆ جەبهە چووبێ و بەزەیی دوولایی لە نێوان قیادە و تیرێژەکانی سپادا بەردەوام بێ، حیسابی خەرمان گەلێک لە موژدەی پەرێز تێپەڕ دەکات «جاء حساب البيدر فوق مايبشر به حساب الحقل» ئەمەیش حەقیقەتێکە زاڵە بەسەر ئێمە و هەموو جیهاندا.

لایەنێکی دیکەی دەخلی هەبێ بەسەر نەبوونی گرێوگاڵ لە نەفسی سەربازدا ئەوەیە کە دەبێ جۆرێ لەنگەربەستن هەبێ لە نێوان حاڵەتی جەبهەی پڕ لە ئەرک و خەتەر و فیداکارییەکی بەدەم شەڕەوە هەیە لەگەڵ وێنەی حاڵوباری ناوەوە لە ڕووی چاودێری کردنی هەستی شەڕکەران بە پارێزی کردن لە دەربڕینی بێباکانەی شادی و کەیف.

بێگومان خەڵکوخوا لە ڕووی ڕووەت و دارایی و دەسەڵات و شکۆوە خواروژوورن، ئەو تاقمە خواپێداوانەش لە هەموو وڵاتێکدا لەسەریانە بەپێی شوکرانی نیعمەت ئەدەب و شایستەیی و داخوازیی حاڵ بپارێزن بە شێوەی لەزەت بردنیان لەو نیعمەتەی گەل و وڵاتیان بۆی ڕەخساندوون یان لە خەوەکوتکەی ڕۆژگاردا بۆیان کۆبۆتەوە. ئێمە لێیان داوا ناکەین واز لە کەیف بهێنن یان بچن بۆ هەنگامە و گیان فیدا بکەن، پێداویست ئەوەیە خۆگیری بکەن لە داڕووشاندنی شعووری خەڵک بە هەڵکردنی ئاڵای بینبڕکێ لە کردنەوەی بوتڵی ویسکی و توندڕاگوشینی کەمەر و لەشولار و مشتنی لێوان چونکە دەنگوباسیان بەربڵاوە، بەدەم گوتنەوەشدا لێی زیاد دەکرێ، ئەو هێندەی لەوەدا ڕاست و بێگومانە زۆر لە لزوم زیادە کە عەقڵمەندان گوناحباری دەکەن تازیەدارانی ناوەوە و نامزەدانی مەرگ لە جەبهە، فێی قێز بوونەوە بیانگرێت... ئەو دەمەی لەشکری مسڵمانان لە شەڕی «ئوحود» گەڕانەوە دەنگی شێوەنی تازیەداران و ڕۆڵە کوژراوان بەرز بۆوە، چاوەکانی پێغەمبەر تەڕ بوون ئەو قسە هەست بزوێنەی کرد کە گوتی: «ولكنّ حَمزَةَ لا بواكى له - حەمزە کەسی نییە بۆی بگریەت».

ئەمرۆکەش لەوانەی پێیان دەڵێن «الأکرمین» هەزاران قوربانیمان هەیە لە تەمەنی گوڵدا کوژراون کە ژێر پێی هەر یەک لەوان بەشەرەفترە لە تۆقەڵەی سەری هەرچی بێپەردەی دنیا و قیامەت هەیە. ئەگەر نیشتمان لە ناز و فەخرێکی بیکات قەرزداری قوربانی دانی ئەو «اکرم»ـانەیە خۆ خاوەن شکۆ و دارایی پشکی هەرە گەورەیان لە بەرهەمی جانفیدایی ئەو قوربانییەی وانەوە هاتووە، چ دەبێ ئەگەر لە ڕووی ڕەحم بە خۆ کردنەوەی شعووری خەڵک دژ بە خۆیان نەبزوێنن، خۆ لە کەیفیان کەم نابێتەوە ئەگەر پەردەی پەنجەرەی ژوورە ڕووناکەکانیان دابدەنەوە!

لەوەی دەیڵێم مەبەستم نییە ئاپۆرەی خەڵک لە ڕووتینی ژیانی عادەتییان بابدەنەوە، نە عەقڵ و نە ئینساف دەسەلمێنێ ساڵ لە دوا ساڵ لغاو بخرێتە دەمی مەیلی ئاسایی و نەفسیش لە حەز و ئارەزووی مەنع بکرێت کە دەزانین لە تەنگەتاویدا، کە درێژەی کێشایەوە، خەڵک پتر حۆجەی هەناسەی ڕەها دەبێت. چ لزومێکمان نەبوو بەوەی چەندێکی دوژمن ڕەوی هێنا بەرنامەی TV و ڕادیۆ بگۆڕین. فایدەی چی بێ «العلم للجمیع» بقەتێ و جێگەکەی بە دووبارە کردنەوەی فیلمێکی یەک لە مەعرەکەکان پڕ بکرێتەوە، حیکمەتێکیش نییە لە ڕاگرتنی ئەو «مسلسل»ـانەی خەڵک لە چاوەچاویاندایە هەتا موسەلسەلی «البیت الصغیر» یان فیلمێکی کاوبۆی یان شڕە فیلمێکی حەربی ڕووسی و ئەمریکایی شوێنیان بگرنەوە. «روحوا القلوب ساعة بعد ساعة فان القلوب اذا کلت عمیت – دەمنادەم دڵان بحەسێننەوە، دڵ کە کول بوو کوێر دەبێت» [حەدیسی پێغەمبەرە].

زۆرینەی خەڵک ناتوانێ بۆ دیتنی فیلمی سینەما لە ماڵەوە دەرچێت، ئەوپەڕی تواناشی لە دوو جاری مانگانە تێپەڕ ناکات، هەر دەمێنێتەوە لە ڕۆژەکانی دیکەی مانگدا دڵدەرەوەی بێت. خەڵک لە شار و دەشت خەریکی شەڕە تۆپ نین هەتا موسەلسەلی میسری عەزمیان بشکێنێت و فیلمی کاوبۆیش ئازاتریان ناکات. لەمەش بترازێین، زێدە پاڵەپەستۆ بەسەر هەستەدەماراندا بۆ تاقی کردنەوەی ورە بە نیشان دانی ڕۆژ لە دوا ڕۆژی یەک بابەت کارێکە عەکسی ئەو مەبەستەیە کە ڕەچاو کراوە چونکە بەرتەکی[158] عادەتی لەو حاڵەتەدا هەر ئەوەیە TV دابخرێت لەبەر وەڕسی.

---

[158]– بەرتەک: رد فعل.

چ خەتەرێک و زەرەرێک و سەخڵەتییەک لەوەدا نییە حاڵوباری ئیعلام، چ دیتراو و چ بیستراوی بەردەوام بێت بە تێبینی لایەنی حاڵی کردنی بینەران و بیسەران لە گۆڕانی وەزعی جەبهە، هەروەها زەرەریش لەوەدا نییە بە پێی حاڵ کەمتاکورتێک زیاد و کەمیی لە بەرنامەی ئیعلامدا بکرێت بە مەرجی خەفە نەکردنی. زەرەر لەوەوە دێت کە هەندێک، بەڵکوو زۆر، لایەنی ئابووریمان بێ بەرنامەیە بە گوێرەی داخوازیی حاڵی شەڕ. با واز لەو شتە بهێنین کە هەر ئابوورییە و ڕەنگە هەموو دەوڵەتێک تێیدا بە سەهوو بچێت، با دەستگیر بکەین لەو حاڵەتانەی کە مجێز و ئاسوودەیی و ژیانی ئاوڕیشمین زاڵە بە سەر بەرژەوەندی گشتی و ئابووریشدا، دەبینین یەک خەرمان هەڵدراوەتەوە لە دەسکە بەهانە و هۆی فشەڵۆک کە سڕینەوەیان زەرەر بە کەس ناگەیەنێ مەگەر سوودمەندی لاخۆر.

کارێکی لە مجێز بوو کە ڕێ درا بە خەڵک بۆ حیسابی خۆیان شتومەک لە دەرەوە داخوونی وڵات بکەن بەڵام چ تامی پێوە نییە داخوونکەر شتومەک بە ئارەزۆی خۆی بفرۆشێت تا ئەوەی، بەپێی بیستنم، قازانجی چەند هەندەی سەرمایە بێت، عەقڵ قبووڵی ناکاتماڵێکی داخوونکراو حکوومەت بە دە دیناری بفرۆشێت داخوونکەرێکیش بە سەد دینار، لە حاڵێکدا جەبهە ئاگرە و هەشتا مانگە جگەرگۆشەکانمان لە بڵێسەیدا هەڵدەپڕووکێن، لەوانەیشە هەشتاکە درێژ بێتەوە بۆ دووسەد. ئەرێ کەی ویژدان چاوێک هەڵدەگلۆفێت؟ یان لە لێرەوارێکدا دەژین هەندێک گیاندارەکانی «يأكل لحم اخيه ميتا - گۆشتی برای مردووی خۆی دەخوات»! بە هەرچی ئازیزی سەرخاک و موقەددەسی ئاسمان هەیە سوێند دەخۆم، بابایەکی ویژدان بێگەنیو کە للف لە سوودی حەرام دەدات، بێ تێربوون و بێ کۆتایی، ئەوەندەم ناتۆقێنێ و قێزم هەڵناستێت بایی هەزار یەکی خەفەتم بێت لەو بێئینسافی و بێ هیچ مەعنایەکی مرۆڤایەتی و ڕەحم و شەرەف و کەرامەت لەو بارە سەرەوبنەی کە گەنج گیانی تێدا دەدۆڕێنێت و تەماعکاری حەرام و بێناموسی، بە نازەوە، تێدا مەست دەبێت. ئەو خنکاوانەی گومڕایی و کەسانی چوون ئەوانیش کە وەک زێلوو لە هەموو مەیدان و کێڵگەیەک و بە هەموو وێنە و وەسیلەیەک کە بە وەهمی مرۆی سافیلکەدا نایەت، خوێنی شەهیدان دەمژن، با ئەم ئامۆژگارییەم لێ ببیەن بۆ

دوارۆژیان:[159] کە شەڕ دەست لە گوناحەکانی دەکێشێتەوە، سپای عیراق بە سەرکردایەتییەوە کە بێگومان ئاگاداری هەموو شتێکە دەست دەداتە «الجهاد الاکبر» و یەخەی هەموو دزێک دەگرێت و لێی دەپرسێت: ئەمەت لەکوێ بوو؟ بۆی دەخوێنێتەوە: «کتابا کان منشورا»...[160] کتێبەکە شایەدیان لێ دەدات، بەر لە چەند ساڵێک چەندیان هەبوو؟ لە چەند ساڵێکدا چۆن هەزاران هەزار جار کەڵەکەی کرد؟ ئەوسا زیادیەکەیان لێ دەردەهێنێتەوە... لەبری خوێنی قوربانییەکان و وێرانیی ئاوەدانییەکان و فۆتانی بەرهەمەکان و شەرەفی نیشتمان و کەرامەتی ئینسانەکانی زمانیان لە پشتی سەریانەوە دەردەکێشێت.

وادەزانن لە هیچە ڕەها بکرێن؟ با ڕەحمێک بکەن بە خۆیان و وەچە و خزمانیان کە شریکی حەرامەکانیانن... با سەروەتیان دەربهێنن بە دزییەوە لە ترسی ئابڕووچوون و بیدەنەوە بە خەزینەی دەوڵەت... کەسێکی سەد ملیۆن یان پەنجا ملیۆن یان دە ملیۆنی داکردبێت تاکە ملیۆنێکی گل بداتەوە، بەشی خۆی و حەرامخۆرەکانی پاش خۆی دەکات تا ڕۆژگار دەفتەریان ڕەش دەکاتەوە... ملیۆنێک بە قازانجی قانوونی لە بانک حەفتا هەزار[161] دیناری ساڵانە دەداتێ، بێترس و ماندووبوون، گریمان پاش زەریبەی داهات چل هەزاری بۆ مایەوە، ئەرێ بەس نییە؟ هەر دینارە لەو چل هەزارە بەسەد ڕۆحی وەک ڕۆحی چڵێسی جەمباراشی ئەو هەیە کە لە خوێنی شەهیدانی پاڵاوتە کردووە، بە زێڕ و زیو، بۆ ناو قاسە گومانزڕاندووەکەیەوە.

شوبهە نییە، چی بەرهەم دێت لەم کردەوەیە کە لە مەعنادا دەبێتە پاکانەی گوناحان، بایی خەرجیی ساڵێکی شەڕ دەکات و جەبهە ڕادەگرێت بە چەک و جبەخانە بێ ئەوەی حکوومەت فلسێکی لە نەوت و مەوت دەست کەوتبێت، با ئەم چاکەیەش

---

[159]- ئەم ئامۆژگارییە قالبێکی شایەدی بوو لەسەر ڕووداوەکانی دەمی شەڕ. خوێنمژ و حەرامخۆرەکان هێندەی کە خوێنی شەهید بە فیڕۆ دەچوو ئەوان لووتبەرز و نازۆبوون.

[160]- بەشێکە لە ئایەتی قورئان کە دەڵێ «سنخرج لهم یوم القیامة کتابا کان منشورا» مەبەستیشی لێی ئەو کردەوەیەی مرۆیە کە فریشتەی سەر شانی چەپ و ڕاست تۆماری دەکەن بۆ ڕۆژی ڕەستاخیز.

[161]- حەفتاهەزار دیناری ئەو دەمە بەلای کەمەوە سەد هێندەی ئەمڕۆکەی دەکرد.

ببێتەوە کەفارەتیان لە گوناحی وەها زل کە بەخشینی بۆ نییە مەگەر لە تەرازووی ئەو دادکارەی کە هەموو شتێکی گرتۆتە بەر ڕەحمەت. هۆی ئەو چاوپۆشییەش کە لە قبوڵی کەفارەتیان دەکرێت لەوەدایە کە نییەت پاکییان بە ئاشکرا کردنی سەروەتیان و ڕاگوێستنی لە ساردوەکانییەوە بۆ خەزینەی حکوومەت حەرامەکە دەکاتە حەڵاڵ وێڕای سەلامەتی گیانی گەنجەکانمان و بەهێز کردنی جەبهەکەمان تێکڕای دەبێتە چاکە لە نوختەی ناوچەقی بەدایەتییەکەیان کە وا بە شکست هەڵبەستنەوە و لەحیمی قەڵشین و چارەی چڕژان و گرتنی کەلێن لە قەڵەم دەدرێت نەک وەکوو تۆڵە بژاردنێکی عادەتی کە فەرامۆشیی ئازاری لێ چاوەڕوان دەکرێت.

ئەگەر خۆیان گنخاند بۆ دوای شەڕ هۆی لێ بووردنیان پێوە نامێنێت و وەک بەسەر گرتنەوەی ماڵی دزیاری لێ دێت.

لەم شوێنەدا ڕێبەدێیی لە پەندێکی کۆن وەردەگیرێ کە دەڵێ: خوا مۆڵەت دەدات و خەمسارد نابێت «ان الله يمهل ولايهمل» بەلامەوە ئەمە تاکە ڕێبازێکی تیژڕا ڕۆیشتنە، ئەگەر کەس توانی یەکێکی دیکە بدۆزێتەوە من نایدۆزمەوە.

ڕەنگە نەشێ بێدەنگ بین لەوەدا کە شەڕەکەمان بە قادسیەی دووەمی ناو دەبەن دەرگا دەکاتەوە بۆ پرسین لە کەسانێکی وا لە سێبەری ئەمان و ئارامی و ئاسوودەیی و دوور لە خەتەری شەڕ بەسەر دەبەن لە کوێوە وەک ئەسحابەکانی مەدینە دەشوبهێن بە دەوری ئیمامی عومەرەوە، شەووڕۆژ چاوەچاوی حاڵوباری هەرا و خەریکی عیبادەتی تێکەڵ بە ڕوحپاکی و زمانخاوێنی و پاکدامەنی بوون. دەستەو دوعا لە خوای بەرزی توانا دەپاڕانەوە ئیمادارانی زاڵ بکات بە سەر بێ ئیمانانداا ڕەنگە نیوەڕۆژەی هەر یەکێکیان کەرتە نانێک شامیشیان کەرتەکەی دیکە بووبێت و بە ئاو نەرمیان دەکردوە تا لە ئەوکیان نەمێنێ. ئێمە وامان لێ هاتووە کارێکی مزەی لێ وەردەگرین لە شانمان خۆش نەیەت، ئەگەر گەڕۆکە شەنگەکەی حکوومەتی هەڵماندەگرێت سەکەتیەکی لە کۆندیشنەکەیدا هەبێت، ئیتر کوا لێک چوون لە نێوان ئەمە و تەقەڵای قادسیە بە سەر پێیانەوە لە گەرمەی نیوەڕۆژی هاویندا و کوشتنی فیل بە ڕمب و کوتەک؟ سپامان تا ئەم ڕۆژە بەرانبەر هەر ڕۆژێکی قادسیە [ی یەکەم] ساڵێکی سەرلەبەری بە جانفیدایی بردە سەر تاکوو کەڵەکە کردنی خۆ بەخت کردن

لە جەبھە و سنووربەزاندنی شادی و کەیف لە سێبەری تەلاردا نیسبەتی دوو دەستەی تەرازووی یەکجارەکی شێواند.

هیچ کەس شتێک شک نابات لە بری شەھیدبوون بیکاتە دیاری بۆ شەھید مەگەر بە ڕەفتاری مەردانە حورمەتی یادی بگرێت نەک بە قسەیەکی بەزم و پڵاولۆغانی بە دوادا بێت. ئەم قسەیە لە پلەی یەکەم تا پلەی پێنجەم و دواتریش خواپێداوە زلەکانی خاوەن داھاتی زل و پۆز دەگرێتەوە کە لە دەستیان دێت خواردەمەنی و نۆشەمەنی لە بنی دنیاوە جەلب بکەن و ھەتا ڕادەی ھەنگڕان سڵسڵە و پڵپڵە لە خۆ ببەستن. چ گلەیی ناچێتەوە سەر بابایەک داھاتی ئارەقەی نێوان چاوانی لە دڵخوازی خۆی خەرج بکات، چ زەرەرێکیش لەوەدا نییە چاو بپۆشین لە شاعیرێک و ھونەرکارێک و ڕەوانبێژێک و خاوەن بەھرەی ئەوتۆیی مزەی مەدحی قادسیە وەربگرێت و بەوەدا کەمێک لە شۆرەتی زیاد بێت و بڕوا بۆ شوێنێکی بە دڵی بێت و مجێزی پێ بکرێتەوە.

چی بە مەبەستی دەگرم ئەوەیە بە سووکی سەیری ھەستی دڵ بریندار نەکرێ، برین لە خۆی بێ یان لە خۆشەویستەکانی بێ، ئەوەی نازکردووی گوناحانیشە بسەنگرێتەوە لە داسەپاندنی ھەوەسی خۆی بەسەر ئامۆژناکیی تازیەدار و ھەتیم و ڕۆڵەکوژراواندا، کە من دێم قادسیەی یەکەم بە بیراندا دەھێنمەوە لەوەوەیە کە ئەوانەی دەتوانن بە ڕۆچوون لە لەزەتی دڵپەسند قادسیەی یەکەم لە بیر بکەن دێن قادسیەی دووەم سەردەبڕن بە سووربوون لەسەر گوێ نەدان بە ھەست و ھۆشی تێکڕا و تاکی خەڵک دەنا لە دەمی بێ پەردەییياندا لەبەر چاوان ون دەبوو یاخود دەچوونە ھەندەران بە دڵی خۆیان کەیفی تێدا بکەن یان ھەر شتێکی تر بێت عەورەتیان بپۆشێت.

بەڕاستی کارێکی سەفیھانەی شەرمھێن و ھیچوپووچانەی قێزھەڵستێنە مرۆیەکی لە ئادەمزادان خۆنموونی بکات بەسەر ھاوڕەگەزەکانیدا و بە زەلیلگیری کەرامەتی کەسێک بشکێنێ و ھەستی داڕووشێنێ ھەر چونکە لە دەستی دێت: «انك لن تخرق الارض ولن تبلغ الجبال طولا- ئادەمی! نەدەتوانیت زەوی دوو بەدەر بکەیت و نە ھێندەی شاخانیش بەرز دەبیت (یان درێژ دەبیتەوە). ئەوان کەسانە نە ئاکاریان ھەیە نە بە ئادەمیش لە قەڵەم دەدرێن مەگەر لە لایەن لەشەوە ئادەمی بن، تێکڕاشیان لە جۆری ئەو ساوایەن کە ڕێنموونکارەکەی مووسا پێغەمبەر، بە پێی ڕیوایەتی قورئانی پیرۆز،

کوشتنی نەکا بە کفر و لەخۆدەرچوون باوک و دایکی کەنەفت بکات. کەسانێکی لە دەمی ئاگر تێبەربوونی سنوور و بە دەم داکردنی سەروەتی حەرامەوە و بە دیار هەزاران خانەوادەی جەرگ سووتاوی شەهیدەکانیان ڕۆ دەچن لە بێشەرەفی هەقیان بوو مردەزاد بن یان دایکیان پێیانەوە ئاووس نەبوونایە چونکە بە کفر و پێ لێ هەڵبڕین میللەتی خۆیانیان شەکەت کردووە، «لا حول ولا قوة الا بالله». ئەی خوای ئادەمزاد و وڵات: «لێت داوا ناکەین قەزا و قەدەرت بگێڕیتەوە»[162] کە بە دەرچوونی ئەوانە لە نرخی ئینسانییەت تیری قەزاکەت لە کەوانە دەرچووە، «ئەوەندە داوا دەکەین لوتفێکی لەگەڵدا بێت» بەوەدا «کە ئەوان تاربووانە گاڵتە بە شعووری خەڵک نەکەن. تۆ لە دەستدایە ڕێنموونییان بکەیت، چاکەی تۆپەرستانیش»[163] لەوەدایە نەختێک زەرەریان بۆ تێبێتەوە ئەگەر ویژدانی ئەو گومڕایانە بەخەبەر بێت و بابدەنەوە بۆ مرۆڤایەتی بەڵکوو دڵیان نەرم دەبێت وەک ئەو بەردەی لە کتێبی خۆتدا باس کراوە کە دەقەڵشێت و ئاوی لێ هەڵدەڕژێت.

بەس نەبێ بۆ وڵاتمان کە هەندێ دەوڵەتی عەرەب خۆی دایە پاڵ دوژمنەکەی بە یارمەتی تێر و تەسەل ئنجا ڕۆڵە تاربووەکانی خۆیشی بە ڕووشانی شعوور و کەلێن خستنە هیممەت یارمەتیدەری بن بەو شێوەیەی ڕەجاڵی ڕیزپەڕی و بێپەردەیی و بێباکی کە هێمای بۆ کرا! چاوەچاوی هیممەت بووین لەو دەوڵەتانەی عەرەبەوە کە بەرژەوەندیان لە سەلامەتی و سەرکەوتنی عێراقدا بوو، قسەش لەوەدا درێژ ناکەمەوە چونکە بە تەما نین وشەیەکی ڕێڕەو لە گوتارێکی ڕێڕەودا یەکێکی داوەستاو ببزێوێت کە بەرژەوەندی خۆی نەیبزاوتبێ لەو ماوە درێژەی هەشتا مانگیدا، خۆ جیهانیش بە ڕواڵەتیدا دیارە بریتییە لە حیساباتی ڕامیاری و ئابوورییەکی خاوەنەکەی بنەمایان بۆ ڕەچاو دەکات، زۆر جارانیش تێیدا بە سەهوو دەچێت تا ئەوەی کەلێنەکەی بۆ پڕ نابێتەوە. شاعیری میسری لە بارەی میسرەوە گوتی:

انا ان قدر الاله مماتی
لاتری الشرق یرفع الراس بعدي

---

[162] – چی لە نێوان جووتکەوانەدان تەرجەمەی حەدیسی پێغەمبەرە.

[163] – چی لە نێوان جووتکەوانەدان تەرجەمەی حەدیسی پێغەمبەرە.

ئەگەر لە تەقدیری خودادا بوو من بمرم
شەرقێک دوای من نابینیت سەر بەرزکاتەوە

ئاخۆ «عروبة» بێ عێراق چ دەکات چەند هەوڵی عەرەب و خوێنی عەرەب بە یارمەتی عێراق دراوە هێندەی ئەو خوێنە نییە کە کوردی عێراق داویەتی چ ماڵیشی نییە پێشکەشی بکات خوێنیشی بە سەر شاخ و دەشتدا چۆڕایەوە بێ جودایی کردن لە نێوان خاکێک و خاکێک، من لەوەدا نامەوێ هونەرێکی کورد بچەسپێنم بە بەخشین بژمێردرێت چونکە بەرگری لە خانەکەی خۆی دەکات، بەڵام سەیروسەمەرە لە دروشمی «من المحيط الى الخليج» و چارەنووسی سەرلەبەری عەرەبەوە هەڵدەستێت، ئاخۆ ئەم دروشمە کەنگین تەرجەمەی کردەوە دەکرێت، ئێوە ناڵێن هەمووی یەک خاکە و جودایی لە نێوان خۆڵی ئەم و ئەودا نییە؟ کە سەردانی عێراق دەکەن ئەدی ناڵێن واین لە ماڵی خۆمان و نێوان کەس و عەشیرەتمان؟ وا وڵات و عەشیرەت و خزم سنوورێکی هەیە گڕی تێبەربووە، بۆچی بەشداری ناکەن لە کوژاندنەوەی؟ خاوەن ئینسافەکان! ئاگری وڵاتتان بکوژێنەوە وەک کە کورد دەیکوژێنێتەوە.

هەموو حەربێکتان بە خۆشی! دەک لەعنەتی خوا و لەعنەتی هەموو نەفرینکارانیشی لێ بێ تا ڕۆژی قیامەت.

هەزار هەزار فرمێسک و حەسرەت و بێئۆقرەیی بۆ هەر دڵۆپی پاکی شۆڕشگێڕی هەوڵدەر لەو خوێنەی دەستی سەفیهی و نەزانی و غەرڕایی بێنرخی دەکات کە هیچی دیکەمان نییە لەو شەرافەتمەندر و عەزیزتر و کەرامەتدارتر بێت. سڵاوت لێ بێ ئەی شەهیدی لە خوێنی خۆتدا مەلە کردوو، خوێنیشت بڵێسەیە لە ناخی تەحەممولمدا...

لقد نفض الليل منك اليدين
وادرك فيك النهار الوطر

شەو دەستی لێت شوشت
ڕۆژ لێت بە ئاوات گەییشت

خافڵ بە سوود و سەفاهەتییەوە لێت خافڵا، بێنیازیش لێت داوی فەرامۆشیی بە دەوری ناو و وێنەتدا تەنی، جۆرەها و بۆرەها لە تەپوتۆزی شەهیدی و ئازاییتدا بە دەم بەیتی شایەران و دەجەلی شەعبەدەبازان و پەیکەری پەیکەرتراشانەوە بە هەڕەمەیی لەوپەڕی پاکییە تا ئەوپەڕی مەڕایی هەڵپەڕکێیان کرد. زەمانەش وێنە و یادی تارماییت بەسەر سیایی و سپیایی دووڕووی شەو و ڕۆژاندا دەبات بۆ ئەو شوێنەی وەها دوور کە هەموو شتێک تێیدا دەبێتە تەنکە سەرپۆشێکی تەمی چاوتێبڕ نەکردوو. ئنجا کە قرچۆکی دڵان و دەروونانی گرتەوە تا یار خۆی نەناس کرد لە یار، بێئەمەکی وەها تیر بوو محاڵبوونی فەرامۆشیی دایک و باوکتی گێڕا بە مومکین، دوو ئاشناکەت کە دەزگیران و دۆستت بن بە سووکی لە گەرمایی ویژدانت تاربوون... تۆ ئەی شەهید لە فڕگەی خوێنمدا دەجمیت... دەڕژێیتە ناو دڵم... شۆڕش لە هۆشمدا دەکەیت ئیتر وەک بورکان دەتەقیتەوە و وەک فرتەنە هەڵدەڕژێیت... پێتەوە دەلاڵێمەوە و ئاگرم بۆت گەش دەبێتەوە و فوو لە پۆلووی خەفەتم دەکرێ بۆت، لە هەناومدا دایسێیت... نە سەبر و نە قەرار... کە تۆیت یەکەم پەرۆشم و داماویی وڕکردووم و برینی هەرە خوێناویم لە هەرچی خەسارەتێکی کەوتبێت و پیرۆزەیەکی چرووک دەرچووبێت، هەموو نشیوێک هەورازێکی هەیە و هەموو ساتمەیەک هەڵستانەوەی بە دواوەیە تەنها تۆ نەبیت. چ شەهید چ ئەسیر، جێگر نییە شوێنت پڕ بکاتەوە، چ هاوتایەکیش لە تۆمان نادزێتەوە.

وەها شیرن و نرخدار و بەرز بوویت تا لە «سدرة المنتهی» بە باوەشی فیداکاریتەوە بە مردوویی عەزیزتر بوویت تا زیندووییت... پەژارەیی مەزاق بە هۆشم دەکات و لە خۆتم خۆشتر ویستیت... بەلامەوە لە خۆت خۆشەویستتر بوویت کە هەر خۆشەویستیشی... گیانم بە شوێنتەوەیە لەو هەوارانەی بەرز و دووری خۆشەویستیدا تا گیانت بەبەر دێتەوە بە ئازادی دەگەڕێیتەوە و لە تەرازووی فاممدا دەبیتەوە ئینسانێکی دروست وەک هەموو ئینسانان.

چ بڵێم و چ سوود هەیە لە گوتن: وا ئایەتی مەرگ ئایەتی ژینتی کووژاندەوە، چراکەشت دوایین تروسکەی خۆی تفاندەوە و دوو پێڵووی بەسەر بیناییتدا هێنایەوە و بیبیلەی چاوتی تیرە کرد کە پڕاوپڕ بوو لە جوانیی خاک و زیبایی ئاسمان، وا لەبەر گوێشت نرکەی نەمان دێت کە ئیرادەی مان تێی ئاڵاوە لەسەر سینەی نیشتمانت. چ بەیان کەم لەو هۆشبەدەرەی بە دڵتدا هات کە فامی خاوەنەکەی لێی حاڵی نییە و ماڵاوایی پێ لە دنیا دەکات و ئومێدێکی پێ دەسپێرێ بازووی بڕاوت بە خۆیەوە ناگرێت و قاچی هارڕدراوت ناتگەیەنێتێ... چ ڕێی بەیان شک نابەم مەگەر ورتەی دڵی بە تۆوە کۆست کەوتووم لە گیانی بەبەر من گەڕاوت بچرپێنی و نزام بۆت بەرز بکاتەوە، بایی قوڵایی و بەرینایی شکۆی دەمی مەرگت... بە پێوانەی بێڕەزایی شەرەفی شەهادەتت تۆ گەورەیت و گەورەیت لە هۆشمدا، ڕۆچوویت و ڕۆچوویت لە هەستمدا، متورفەیت و موترفەیت لە باوەشی ڕوحمدا ئەی پاکترین «نطفة»یەکی یزدان لە خۆیدا گرتبێت، وەی هەناردەی زەمین بۆ ئاسمان، ئەی شەهید!!

بەغدا 20/2/1995